


238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەرەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسوودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆرایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVslbo_



Ktebi_PDF



**پێشکەشە :-**

بە"سادە"کەی خۆم، کەبۆ ساتێکیش خەمەکانی جێ نەهێشتم و بەمیهرەبانییەوە تاڵی و سوێرییەکانی ژیانمی بۆ دڵە فراوانەکەی خۆی بانگهێشت دەکردوو پۆشاکی خەندەو پێکەنینی لەبەر دەکردن و پاشان دەیکردنە خوانێکی هاوبەش.

**وەرگێڕ**

**سێ** ساڵ لەمەو بەر لەکتێبخانەی گشتی کەرەج لەگەڵ مامۆستا میهرزاد نوسەر و نیگارکێشی بەناو بانگ ئاشنابووم، ئەو پیاوێکی کامڵ و لاواز بوو، موی پڕ و ماش و برنجی بوو. بەڕێوەبەری کتێبخانە بەڕێز دکتۆر ئیقباڵ هۆکارێك بوو بۆ ڕێکخستنی ئەو یەکتر ناسینەمان، چونکە ئەو پێشتر نوسراوەکانمی خوێندبووەوە و داوای لە مامۆستاش کردبوو ئەویش بیانخوێنێتەوە. مامۆستاش بە خۆشحاڵییەوە ڕەزامەندی خۆی نیشاندا، من یەکێك لە ڕۆمانەکانم پێدا کە لە بارەی عەشق و ناکامییەوە بوو. مامۆستا لەتاران دەژیا، بەڵام هەفتەی جارێك سەردانی کەرەجی دەکرد تاکو لە دەستەی ئەدەبیاتی کتێبخانەدا هاوبەشی بکات و بڕیار لەسەر کاری پێشکەوتووی نیگار کێشە لاوەکان بدات، لەو نێوانەدا دیدارەکانی ئێمە بەردەوام بوو، من بە هاندان و پێشنیارەکانی ئەوان لای خۆمەوە بڕیارم دا کە نوسراوەکانم بەچاپ بگەیەنم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لەو بڕوایەدا نەبووم کەشایستەی بڵاوکردنەوەبن. تاکو ڕۆژێك مامۆستا پێشنیاری کرد کە داستانی ژیانی خۆی و هاوسەرەکەی بنوسم و ڕێکی بخەم. لەبارەی ئەو متمانەی کە مامۆستا پێمی هەبوو گەلێك دڵخۆش بووم، بەڵام ترسم لەزەمەن هەبوو کەنەتوانم بەڵێنەکەم ببەمەسەر. دوواجار ئامادەبووم بەهەموو توانای خۆمەوە بۆ بەدەستهێنانی سەرەنجامی ئەو داوایەی کە لێمی کردبوو ڕەزایەتی ئەو بەدەستبهێنم و هەر واش بوو. چونکە کاتێك مامۆستا دەستنوسەکەمی خوێندەوە زۆری لێ ڕازی بوو، کاتێك ئامادەم کرد بۆچاپ خۆشحاڵی بە ڕوخساریەوە دەبینرا، دەبێت ئەوەش بڵێم ئەم داستانە زۆرتر ڕاڤەی ژیانی هاوسەری مامۆستایە نەك خۆی. هەرچی لەم ڕۆمانەدا دەخوێنیتەوە زیاتر

دەستنێوەردان گواستومەتەوە. تەنها لە لەبارەی هاوسەری مامۆستاوە دەدوێ. من بەبێ هەندێك شوێندا نەبێت كە كەسایەتی و جێگاكانم گۆڕیون.

فەهیمە رەحیمی

"١"

سەرەنجام ڕۆژی دیاری کراو هاتە پێشەوە و بۆ میوانی لەکەرەجەوە بەرەو تاران بۆماڵی مامۆستامیهرزاد بەڕێکەوتم، تاکو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئاشنابم و گوێ بۆ داستانی ژیانی ڕادێرم. ماڵی مامۆستا لە یەکێك لە گەڕەکەکانی "شەمێران"دا بوو، من زۆر زوو ئەو ماڵەم لە نێوان ئەو هەموو ماڵە مۆدێرن و دەوڵەمەندانەدا دۆزییەوە، چونکە مامۆستا گوتبوی کە ماڵەکەی لە نێوان ماڵە جوان و ڕازاوەکاندا گەلێك ناجۆرە. بەڵام بەبۆچونی من، تەنها ماڵێك بوو کە گیانی خۆشەویستی و میهرەبانی تێدابوو. لەکاتی گەشتنمدا هاوسەرەکەی مامۆستا هێندە بەگەرمی و ڕوو خۆشییەوە میوانداری لێ کردم کە زۆر زوو هۆگری بووم و هەستم کرد دۆستێکی دێرینم لەپاش چەندین ساڵ بینیوەتەوە، کاتێك پیاڵە چایەکی لەپێش دانام و ڕووبەڕووم دانیشت، لەوێدا توانیم بەباشی بیبینم، ڕوخساری گەنم ڕەنگ بوو، چاوانێکی گەورەو ڕەش کە سەرنجی هەموو کەسێکی بۆلای خۆی ڕادەکێشا، پرچێکی درێژ و ڕەشی بریکەداری هەبوو لەگەڵ گەردنێکی بەرزوو دەم و لوتێکی بچکۆلانەو پێ کەوتوو.

نەمزانی چۆن بوو وام هەستکرد ڕوخساریم لا نامۆ نییە، لەوکاتەدا فشارم بۆ مێشکم هێنا تابیهێنمەوە یادم لە چ شوێنێکدا بینیومە. ئایا نمونەی نیگارەکانی مامۆستا نەبوو؟ بەبیستنی "چا"کەتان سارد نەبێتەوە لەو بیرکردنەوەیە پچرام. "سادە" زەردەخەنەیەکی کردوو گوتی:

مامۆستا پێشتر لەبارەی ئێوەوە قسەی بۆ کردووم و گوتی کە بەڕێزت نوسەرێت و بەنبازیت هۆکاری ناسینی من و ئەو و ژیانی هاوسەریمان لە کتێبە تازەکەتدا بنوسیت. گوتم:

ئەوە مایەی شانازییە بۆ من، هەرچەند لەکاری نوسەریدا بەتەواویش شارەزانیم، بەلام هەموو توانای خۆم دەخەمەکار تاکو بتوانم مافی خۆی پێ بدەم. مامۆستا گوتی: من کتێبەکانی تۆم خوێندۆتەوە و بڕوام وایە لەم کارەشدا سەرکەوتوو دەبیت.

بەهەرحاڵ تاکو زۆر نەنوسیت ناتوانیت نوسەرێکی سەرکەوتووبیت، من لای خۆمەوە لەکەم و کوڕی نوسینەکانت دەبورم و هیوادارم "سادە"ش هەمان هەڵوێستی منی هەبێت، "سادە" بە لەقاندنی سەری جەختی لەسەر قسەکەی مامۆستاکردەوە. مامۆستا لە جێگاکەی هەستاو گوتی:

بەیارمەتیتان، من دەڕۆم تاکو بەکارەکانم ڕابگەم، پاش ڕۆشتنی ئەو، سادە بە ئارامییەکەوە دەستی بەقسان کردوو گوتی:

بۆ دەسپێکی داستانەکە واباشترە سەرەتا لە سەردەمی منداڵی خۆمەوە بدوێم. ناوی سەردەمی کچێنیم "کاترینا گریگۆریان"ە ، باوکم ئێرانی و دایکیشم مەکسیکی بوو، باوکم پسپۆڕی بیری نەوت بوو بۆ کۆمپانیایەکی بیانی کاری دەکرد. دایکم ژنێکی جوان و دلگیربوو. ئەوان بەخۆشەویستی زەماوەندیان کردبوو. من تەنها بەری ئەو خۆشەویستیەی ئەوانم. تاحەوت ساڵی ژیانێکی خۆش وئارامم هەبوو، بەلام قەدەر نەیهێشت ئەو کامەرانیەم تاسەربێ. بۆسەردانی یەکێک لە ئاشنایانی باوکم ڕۆشتین کەماڵیان لەشیراز بوو، چەند ڕۆژێك پاش ئەوەی کە گەشتینە ئەوێ کارەساتێك ڕویدا، ئەویش ئەوەبوو لەناکاو زەمین لەرزەیەکی بەهێز دنیای لەرزاند، کاتی زەمین لەرزەکە من لەحەوشەکەدابووم. دایك و باوکم لەژورەوە پشوویان دەدا، بەلام پێش ئەوەی کە بتوانن بێنەدەرەوە سەقفەکە ڕوخا بەسەریانداو لەژێریا هاواریان دەکرد. هاوەڵەکەی باوکم و هاوسەرەکەی لەدەرەوەبوون وگیانیان پارێزرا. هێشتا یەك خولەك بەسەر ئەم زەمین لەرزەیەدا تێنەپەڕی بوو کە بێینەوە سەرخۆمان. جارێکی تر زەوی جولایەوەو ئەوان

کەبەزیندویی مابونەوە بەتەواوی لەناو چوون، من تێکچووبووم و پڕبەگەروم هاوارم دەکرد. کاتێك هاوەڵەکەی باوکم لەباوەشی گرتم. بەچنگ بەربوومە ڕوخساری و خۆم لە باوەشیدا ڕاپسکان و چووم بۆلای ژورە وێران بووەکەو بەچنگ دەستم کرد بەهەڵکەندنی. دەمویست دایکم وباوکم ڕزگاربکەم. کاتێك کۆمەڵێك هاتن بۆ یارمەتیمان ئیتر شەو بوو هیچیان پێ نەکرا. دەمەو بەیانی لاشەی دایك وباوکمیان لە ژێر داروو پەردووەکەدا دەرهێنا کە لەباوەشی یەکتریدا گیانیان بەخشی بوو. قژە درێژەکەی دایکم لەگەڵ خوێن و خاکدا تێکەڵاو بوو. ڕوخساری باوکم نەدەناسرایەوە. بەڵایەکی گەورە بەسەر خەڵکیدا هات ولەوکاتەدا هەرکەسەو بەدوای ونبووی خۆیدا وێڵ بوو. من تاکو ئەوکاتە زەمین لەرزەم نەبینی بوو، زەوی شەقی بردبوو، خانووەکان جگە لەداروو پەردوو هیچی تری نەمابوو. لەوکاتەدا لەخۆم ولەڕەگەزی خۆم بێزاربووم، چونکە وام بیردەکردەوە ئەگەر کوڕ بومایە دەمتوانی بەزۆری بازوو باوك ودایکم لەژێر ئەوماڵە ڕوخاوەدا دەربهێنم‌و ڕزگاریان بکەم. ئەوبیرکردنەوەیە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لای من بەهێزدەبوو، دەبوە هۆی ئەوەی تەرێز لەکچان بکەم وخۆم بەکوڕ بزانم.

هاوەڵەکەی باوکم تەرمەکانی گواستەوە بۆتاران ولەگۆڕستانی "ئارامنە"دا بەخاکی سپاردن و بەخێوکردنی منیشی گرتە ئەستۆ. ئەو تاکو ماوەیەکی زۆر خۆی بەتاوانبار دەزانی و وای بیردەکردەوە ئەگەر باوك ودایکمی بانگهێشت نەکردایە ئێمە لە شیراز دەرنەدەچوین وئەوان لە ناو نەدەچون وسەرەنجام منیش هەتیو نەدەکەوتم. بەڵام ئێستا دان بەوڕاستیەدا دەنێم کە لەگەڵ ویستی خودادا هیچ ناکرێت. لەپاش ئەوکارەساتە، ئیتر من "کاترینا"کەی پێشونەبووم، کچێك بووم دڵ گوشراوو بێزار، کەهیچ کەسێك نەی دەتوانی کامەرانیم بۆ بگێڕێتەوە. چەند ناوێکی کوڕانەم بۆخۆم هەڵبژاردبوو، داوام لەدایك و باوکە تازەکەم دەکرد کە بەوناوانەوە بانگم بکەن وئەوانیش بۆخۆشحاڵی من وایان دەکرد. تاکو ڕۆژێك ناوی "سادە"م هەڵبژاردو ئەوناوەم لەخۆم نا، تاکو ئەمڕۆش هەموو کەسێك بە"سادە"بانگم دەکەن. هەرچەند لەپاش زەماوەندکردنم لەگەڵ مامۆستادا ناوم لەناسنامەدا لەکاتریناوە گۆڕا بە"مریەم" بەڵام مامۆستا هەربە سادە بانگم لێ دەکات.

من لەوبارەیەوە خۆشحاڵم، چونکە ناوی "سادە"ئارامی بەدڵم دەبەخشێت، واهەست دەکەم لەوڕۆژگارەدا کە لەنێوان کوڕوکچاندا بووم "سادە"بووم، کاتێک دەمویست کوڕبم "سادە"بووم، کاتێک سروشت جەختی دەکردەوە کەکچم. بەهەرحاڵ سادە بووم وئێستاش هەرسادەم. لەکاتێکدا تێپەڕ بوونی ڕۆژگار لەلاشەمدا گۆڕانکاری پێکدەهێنا. بەڵام لەهەست وخەیاڵمدا گۆڕانکاری ڕوینەدابوو، سەردەمی منداڵی جیهانێکە! شەوان کاتێک دەچوومە سەر جێگەی خەوەکەم دۆعام دەکردو لەخودا دەپاڕامەوە بەیانی کاتێک لەخەو هەڵدەستم ببێتم بەکوڕ! چ ئارەزوویەکی شێتانەبوو! من ڕەگەزی مێم بەلاوازو داماو دەزانی کە تەنها شایانی بەزەین وبەس. وام بیردەکردەوە کەکچان ناسکن و هەموو چرکەیەک ئامادەی شکانن. هەستم دەکرد وەک مێرو وان وبەئاسانی دەبن بەژێر پێوەو بەهیچ شێوەیەک توانای بەرگری کردنیان نییە. من بزێوی و ئازایەتی کوڕانم ستایش دەکردو دەمویست وەکو ئەوان بم، قارەمانە شکست نەخواردووەکەی سەردەمی منداڵی من (سوپرمان)بوو، کاتێک ئەوم لەتەلەفزیۆندا دەبینی. بەشێوەیەک کاریگەری لام جێدەهێشت کەپاش تەواو بونی فلیمەکە. عەباکەی دایکم دەخستە سەرشانم ودەمویست وەک (سوپرمان) باڵ بگرم. مێزو کورسیەکانم بەسەر یەکدا دەخست وفەرشەکەم لول دەکرد. وەهام پیشاندەدا کەسەرقاڵی ڕزگارکردنی دایک وباوکمم. بەئەنقەست وێنەی دایک وباوکم دەخستە ژێر فەرشەکەوەو پاشان دەبوو ئەوان بەشەڕو کوشتارێکی خوێناوی ڕزگاربکەم ودەریان بهێنم. ئەگەر لەو ڕۆژەدا کەسێک ئاگای لەکردارو هەڵس وکەوتم بوایە. وەهای دەزانی شێتم. بەڵام دایک وباوکم منیان زۆر خۆش دەویست وئەم کارەیان بە هەند وەرنەدەگرت، چونکە ئەوان وەجاخ کوێر بوون. هەموو کردارەکانی منیان پێ خۆش بوو بەئاساییان دەزانی. خۆشەویستی لەڕادەبەدەری ئەوان هۆکاربوو کەتاکو پانزەساڵی وەک کوڕان پەروەردە بم. ئەوان هیچ کاتێک جلی کچانەیان بۆ نەدەکڕیم و هەموو شتی یاریەکانم کوڕانە بوون. ئەو ڕەفیقانەی هەم بوون هەموو ئەو کوڕانەبوون کەلە منداڵییەوە لەگەڵیاندا گەورەبوبووم. وەکو کوڕان تۆپێنم دەکرد. لەگەڵ زۆرانبازی و شەڕە بۆکسدا پەیوەندیم هەبوو. واهەست دەکەم پانزە ساڵەیی کاتی عادەی ئافرەتانە. زوو عاشق

دەبن. زوو بەژیان ئاشنا دەبن و زوش خەمەکانیان بەدەستی فەرامۆشی دەسپێرن. بەلام من وەها نەبووم. بە پلەیەك گەیشتبووم کەئیتر یاری منداڵانە ڕازی نەدەکردم. حەزم دەکرد ببمە فڕۆکەوان. دەمویست بفڕم ولەوانەیە ڕۆحی سەرکەش ویاخی من لەئاسماندا بحەوێتەوە. ئەوخەیالانە ببوو بەخولیام و شەوان بە بیری هەڵفرینەوە دەنوستم.

لەکۆتایدا بۆ بە واقعکردنی ئەو خەونەم چومە تاران، بۆگەیشتن بەو ئارەزووەم بەردەوام بووم. کاتێك ناوی خۆم تۆمارکرد بۆفێربوونی فڕۆکەوانی جگەلەمن چوار ئافرەتی تر وەك من ناوی خۆیان تۆمار دەکرد. سێ ساڵ ماوەی هەبوو تاکو سەرکەوتو بووم ویەکەمین تاقیکردنەوەی فرینم بەسەرکەوتوویی ئەنجامدا.کاتێك فڕۆکەی تاقیکردنەوەکەم بەڕێکوپێکی هێنایەوە فرگەکە، لە کاتی دابەزینم لەفڕۆکەکەدا هاوەڵەکانم بەسەتڵ ئاویان بەڕومدا پرژاندو پێشوازیان لێ کردم.

ئەوە نەریتێکی کۆنی فڕۆکەوانیە، ناتوانم دەری ببرم چەندەکەیف خۆش بووم وهەستم بەکامەرانی دەکرد. لەژیانمدا ئەو ڕۆژەم لەبیرناچێت چونکە لەڕۆژنامەکانی ئەو دەمەدا لەگەڵ وێنەو ڕاڤەیەکی تەواودا ئەو هەواڵەیان چاپ کردبوو. بەلام واهەست دەکەیت بەوە کۆتایی هات؟ نەخێر! لەگەڵ ئەوەدا ئارەزوویەك کەبۆئافرەتانی کۆمەڵگای ئێمە مەحاڵە.جلی فڕۆکەوانیم لەبەرکردبوو، بەلام دەمبینی کەلێنێك لەبوونمدایەو نەمدەزانی بەچی پڕی بکەمەوە. هێشتا کاری فرینم بەڕەسمی دەست پێ نەکردبوو کەیەکەم ڕوداوی خۆشەویستی لەژیانمدا ڕویدا "سامونێل"کوڕی یەکێك لەهاوەڵانی باوکم کەلە"ئەوروپا" دەژیا هات بۆئێران. کاتێك ئەوم بۆیەکەمینجار بینی. لەچاو باشخاڵیی ئەو خۆشم نەدەهات ،کاتێك باوەشی پێداکردم بەجۆرێك گوشیمی کەبێزاربووم ورقم لێی هەستا. سامونێل بۆدواین سەردان گەڕابوەوە ئێران. بەلام بونی من هۆکارێك بوو کەلامان بمێنێتەوە. ئەو سەروەت وسامانێکی بێ شوماری هەبوو چونکە باوکی یەکێك بوو لەو سەرمایەدارە گەورانەی کەلەئیسرائیلدا دەژیاولەڕێگەی سیاسەتەوە سامانێکی گەورەی کۆکردبوەوە. دایك وباوکم لەخۆشیاندا خەریك بوون لەپێستی خۆیان دەردەچوون. بۆئەوان سامونێل شانازیەکی گەورە بوو کەلەماڵی ئەواندا مابووەوە. دەستبلاوی لەڕادە

بەدەری ساموئیل ئەوانی زیاتر شەرمەزاردەکردو هۆکاری کامەرانیان چنگ کەوتووە.
ساموئیل بۆرازیکردنی دڵی من هەموو کارێکی دەکرد، لەوانەیە باوەڕنەکەی ئەگەربڵێم دەیویست فرۆکەم بۆبکڕێ. بەڵام کاتێك لەبەرامبەر ئەوکردارانەی ئەودا ساردووسڕی منی دەدی. بێ پەردە بەباوکمی گوت:

سادە کچێکی نەخۆشەو وای بەباش دەزانم هەرچی زوترە چارەسەربکرێت. ئەوگوتەیەی هەرچەند بەگاڵتەوە دەوت. بەڵام زەنگی خەتەرناکی لەگیانی مندا لێیداو بووە هۆی ئەوەی بکەومە بیرکردنەوە، چەندجارێك لەخۆم پرسی چ شتێك لەدنیادا ڕازیم دەکات؟ ئایا ئەم هەموو سەروەتەی ساموئیل بۆخۆشی و کامەرانی بەس نی یە؟ ئەو دەیەوێت فرۆکەت بۆبکڕێت و تۆش دەتوانیت بۆ هەرکارێك ئارەزوو بکەیت لەپشتی سوکانەکەیەوە دانیشی و بفڕی. بڕۆی بەدوای سەرکەوتنندا. کلیلی خۆشبەختی تۆ لای ساموئیلە، بەڵام ئەوبیرکردنەوەیە ئەنجامەکەی بەدڵتەنگی کۆتایی هات. دادەنیشتم ودەگریام ودەمگوت! نەخێر... من هیچ شتێکم ناوێت. نەساموئیل ونەفرۆکەکەی. فرۆکەی خۆم پێ باشترە.

تەمەنم بیست ویەك ساڵ بوو. بەڵام فرۆکە منداڵانەکەی خۆم کە بەکۆنترۆڵ ڕێنمونی دەکرا زۆرلە فرۆکە ڕاستیەکەی ساموئیلم خۆشتر دەویست کەبەڵێنی دابوو بۆم بکڕێ. سێ مانگ بەسەرمانەوەی ئەودا تێپەڕی ومن لەوماوەیەدا کەمترین خۆشەویستیم بۆی نەبوو. ڕۆژێك وەك نەریتی باو، چوو ئۆتۆمبێلێکی بۆکڕیم ،ساڵێك پاش ئەوە لەگەڵ کچی یەکێك لە سیاسەتمەدارانی ئیسرائیلدا زەماوەندی کرد. ئەوزەماوەندەی وەك گورزێکی قورس تەواوی خەونەکانی دایك وباوکمی تێکشکاند. ئەوان وایان بیردەکردەوە کە ساموئیل دەگەڕێتەوەو من وەك هاوسەرێك هەڵدەبژێرێت، بەڵام هیواکانیان وەك نەخشی سەرئاوی لێهات. چەند مانگێك پاش ئەوە باوکم نامەیەکی لە ساموئیلەوە بەدەست گەیشت کەئەو جارێکی تر وەهای نیشاندابوو کە سادە کچێکی نەخۆشەو دەبێت چارەسەربکرێت. ئەو نامەیە ئەگەرچی بووە هۆی تووڕەیی من ودایك وباوکم. بەڵام ئەوانی خستە گومانەوە نەك بەڕاستی نەخۆش بم. سەیرکردنە گوماناویەکانی ئەوان و ورتە ورت

کردنیان ئازاریان دەدام.بە جۆرێك کەلە ژیان بێزار بووم. زۆرتر لەجاران ڕوخام. بۆ هاودەمی تەنهایم پەنام بۆ کتێب برد. ئارەزوی خوێندنەوەم بەتەواوی پەیدا کرد. بە شێوەیەك کە شەوو ڕۆژ کتێبم لەدەست نەدەبڕا. تاکو ئەوکاتەی کەکتێبێکم دەستکەوت ئەو کتێبە بەتەواوی ژیان وبیرو پاشەڕۆژمی خستە ژێرکاریگەری خۆیەوە یان باشتر بڵێم سەرو بنی کرد. بەڵێ بەو شێوەیەی کەلەوانەیە گوێبیستی بوبێت. ئەوکتێبە ناوی مامۆستا میهرزادی لەسەر بوو. یەکەمجارکە خوێندمەوە زۆر سەرنجی ڕانەکێشام، بەڵام کە بۆ جاری دوەم خوێندمەوە. هەستم کرد کەوتومەتە ژێر کاریگەری ئەوەوە. گۆڕان و ئاوەژوبونێك کە پێشتر ئاماژەم پێدا. پاش خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە مامۆستا هاتە بوونی منەوە من عاشقی بووم و کتێبەکەی ئەو هۆکارێك بوو بۆئەوەی خۆم بناسم وتێبگەم. بە بیستنی ناوی مامۆستا دڵم گەرم دەبوو هەر ڕۆژێك لە خزمەت نوسینەکانیدا بومایە نیشانەیەکی نوێم تێدا دەبینیەوە. هەر ڕۆمانێکیم چەندین جاردەخوێندەوە. تەنها ئارەزووم ئەوە بوو کە مامۆستا لە نزیکەوە ببینم و پێی بڵێم کە چەندم خۆش دەوێ و لەدنیادا تەنها دڵم بەوداوە. ئەوە ڕاستیەکی گەورەی ژیانم بوو. هیچ کاتێك نەمدەزانی عاشق دەبم. من عەشق وپەیوەندی سامونیلم ڕەتکردەوەو بەنیگای بێزاریەوە لەوم دەڕوانی. بەڵام .. عەشق، بێ ئاگا بەدوامدا هات وعاشقی کەسێك بووم کەهیچ کاتێك نەمدیبوو ونەمدەزانی چ جۆرە مرۆڤێکە. ئەوم بەدڵخواز لەهزرمدا وێنا کردبوو. تاوێك باڵا بەرزو لاواز جارێك قەڵەوو کورتە باڵا، جارێك بیرم دەکردەوە ئەگەر هەژارو کەم دەرامەت بێت هەرخۆشم دەوێ؟ کاتێك ئەو پرسیارەم لەدڵم دەکرد دەمبینی وەڵامی هەرئەوەبوو خۆشم دەوێ!! من خۆشم دەویست ودەمپەرست بەلامەوە گرنگ نەبوو فەقیرە یان دەوڵەمەند. گرنگ نەبوو جوانە یان ناشرین. من عاشقی فیکرو ئەندێشەی بووم وهەستم دەکرد تەنها ئەودەتوانێت هەستم پێ بکات وهەرئەندێشەکانی ئەوە وەڵامی نیازەکانی مێشکی من دەداتەوە... سادە لەم کاتەدا بێدەنگ بوو بەگوڵی قالیەکەوە خۆی خەریك کرد بوو. پاش چەند چرکەیەك سەری بەرز کردەوەو یەکسەرە سەیری ڕوخساری منی کردوگوتی: پێ لەسەر هەوادانان و خۆهەڵواسین بەژیاندا گەلێك سەختە. لەمەبەستم تێ

دەکەیت؟ دەمەوێت بڵێم پێش ئەوەی ئاشنای کتێبەکانی ئەو بم کوڕنەبووم، بەڵام ئارەزووی کوڕانەم هەبوو، کچ بووم، بەڵام هەستی کچانەم نەبوو، لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ هاوەڵەکانمدا دۆشدادەمام و نەمدەزانی چیم. لە گاڵتەو گەپی پیاوانەی ئەوان بێزار بووم واەناو کچەکانیشدا بیرو خەیاڵاتی ئەوانم وەك هی منداڵ دەبینی. کەسێك بووم لەناو کوڕاندا دەمویست هەستی کچبوونم ڕابگرن وله گاڵتەی پیاوانە دەست هەڵگرن. لەناوکچەکاندا ئارەزووم دەکردکە زیاتر لەمن ئاگاداربن. من دەمویست لە قاڵب بیانهێنمە دەرەوەو وایان تێبگەیەنم کە هیچ شتێکیان لە پیاوان کەمترنیەو ئەوانیش دەتوانن کردەوەی پیاوانە ئەنجام بدەن. بەڵام کاتێك عەشق بەدوامدا دەگەڕاو عاشق بووم و پەیم بەو ڕاستیە برد کەتەنها ژنێکم و هەستێکی ژنانەم هەیە. ئیتر ئارەزووم نەدەکرد لەبوونی خۆم هەڵبێم، بەڵکو دەمویست لەگەڵ کەسێکدا کە خۆشم دەوێت ژیان ببەمە سەرو هەموو ساتەکانی خۆم بۆخۆشبەختی ئەو تەرخان بکەم و کورەی بەختەوەری بۆ نێڵ بدەم.

ئارەزووم دەکرد هەمان عەشق و پەیوەندی کە لەنێوان دایك و باوکی ڕاستەقینەمدا بینی بووم لەماڵەکەی خۆیشمدا پەرەی پێ بدەم. نازانم دەتوانم لەمەبەستم حاڵیت بکەم یان نە؟ من ئیتر ئەو سادەیە نەبووم، یان ڕونتر بڵێم ئەوبیرە تەسکەی جارانم نەمابوو. جلی پیاوانەم فرێداو جلی ژنانەم پۆشی. چاك لەیادمە پێڵاوێکی پاژنە بەرزو سپیی پشت کراوە و کراسێکی یەخەکراوەم لەبەر کرد کە دامێنەکەی چنرابوو. کاتێك خۆم لە ئاوێنەکەدا دەبینی پێکەنینم دەهات. باوەڕم نەدەکرد ئەوە وێنەی خۆم بێت، هەر بەو جۆرەی کە خۆیشم گومانم هەبوو دایکم خۆی کرد بەژووردا و بە بینینی من لە خۆشیدا پڕبەدەم هاواری کردو گوتی:

وای... خوایەگیان چەندە جوان بوویت، بەم هەموو جوانییەوە بەتەواوی هاو شێوەی دایکی خۆتی، بۆ ئەوەی زیاتر خۆشحاڵی بکەم هەردوولای کراسەکەم گرت و لەکاتێکدا گۆرانییەکی ئیسپانیم دەوت دەستم بە سەما کرد.

فرمێسك لە چاوەکانی بەر بوونەوەو گوتی:

ئای...سادە گیان کچی خۆم ، بریا دایکت زیندوو بوایەو تۆی بەم جلانەوە دەبینی، باوەڕم وایە کە ڕۆحی لە ئاسمانەکاندا چاودێری تۆ دەکات و لێت دەڕوانێت.

بەیاد خستنەوەی دایکم گیانم کەوتە لەرزە و دەنگی هاواری نێو ماڵە ڕوخاوەکە کەوتەوە یادم و لە شەرمەزاریدا بە خێرایی جلەکانم گۆڕی. دایکم بەسەر سوڕمانەوە پرسی: بۆچی جلەکانت داکەند، منیش ڕاستییەکەم پێنەگوت، گوتم:

نامەوێت.... ئەم جلانەم ناوێت، من نامەوێت ژن بم!! تێگەشتی دایکە گیان؟ پڕ بەدڵ نەفرەت لەئافرەت بوونم دەکەم. لەبەر ئەوەی کە لاواز و بێتوانام بێزارم ، دایکی بێچارە سەری داخست و گوتی:

وامدەزانی بیرت چۆتەوە. چەند ساڵێك بەسەر مەرگی ئەواندا تێپەڕیووە و بەڵام تۆ تاکو ئێستاش لەخۆت نەبوراویت. ئەم پەژارانەی تۆ بونەتە هۆی ئەوەی من و باوکت خەمبار بین و خۆمان بە بەرپرسیاری مەرگی ئەودوانە بزانین. تۆ وادەزانیت ئێمە بەختیارین؟ نەخێر..! هەرگیز، کاتێك سەیری تۆ دەکەین، کاتێك دەتبینین کە بەم شێوەیە ئازاری خۆت دەدەیت، حەز دەکەین ئێمەش لەو ڕوداوەدا بمردینایە. تکەی فرمێسك بەسەر گۆنایدا بەر بوونەوە و ئازاری دڵی دام، پاشان لە ئامێزم گرت و گوتم:

تاوانی تۆو باوکم نییە، زەمین لەرزە ئەوانی لێ سەندم، ئەگەر ئێوەش لەناو بچونایە ئاشکرایە کە ڕۆژی من بەچ ڕۆژێك دەگەیشت، ڕاستە خوداوەند ئەوانی لێ سەندمەوە، بەڵام ئێوە جێگای ئەوانتان بۆ پڕ کردومەتەوە. داوات لێ دەکەم نەگریت، من لە خۆم نابوورم لەبەر ئەوەی کە نەمتوانی بۆ ڕزگاری ئەوان کارێك بکەم، بەڵام ئەگەر کوڕ بومایەو توانای پیاوانم دەبوو، لەوکاتەدا کە زەمین لەرزەکە ڕویدا دەمتوانی هاوکارییان بکەم و ئەوان تاکو بەیانی لە ژێر داروو پەردوودا نەدەمانەوە. دایکم فرمێسکەکانی سڕی و گوتی:

ئەگەر تۆ کوڕیش بویتایە هیچ کارێکت لەدەست نەدەهات. لە بیرت نەچێت کە تۆ لەو کاتەدا حەوت ساڵان بویت، کوڕێکی حەوت ساڵەش نەیدەتوانی ئەوە ئەنجام بدات کە تۆدەتەوێت، تۆ نابێت سەرزەنشتی خۆت بکەیت و دەبێت ڕازی بیت بەکاری خودا و باش

بزانیت کە ژیان و مردنی مرۆڤەکان تەنها لەدەستی ئەودایە. ویستی خودا چۆنە نابێت ئێمە پێی نارازی بین. سادە...کچی خۆم: مەرگ کۆتایی ژیان نییە، ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کەژیانی بێ برانەوە لەو دونیایە، پاشان بیر لەوە بکەرەوە کە باوک و دایکت لەو دونیا لە تەنیشت یەکتریدا ژیان بەسەر دەبەن و ئارام و بەختیارن، رازی مەبە ئەو بەختەوەرییەیان بشێوێنیت، ئەوان کرداروو هەڵس و کەوتی تۆ دەبینن، کارێك مەکە ڕۆحیان نائارام بێت، ڕێزی ژیانت بگرەو بۆ ئارامی ڕۆحی ئەوان بپارێزەوە. رقێك کە چەندین ساڵ بوو لەدڵمدابوو ڕەویەوە و بە دەنگی بەرز دەستم کرد بەگریان. هەموو خەم و ئازارەکانم بە باداو ڕێگەم دان تاکودڵسۆزبن بۆم، ئەمەندە گریام تاکو ئیتر فرمێسکەکانم وشك بوونو لەسەر چاوەوە وشکابیان هات. لەگەڵ ڕەوینەوەی خەم و ئازارەکانمدا هەستمکرد بارێکی گرانم لەسەر شان لاچووە.کاتێك بەڕابووردوی خۆمدا چومەوە هەستم کرد کە هەمیشە لەحاڵەتی ڕاکردندابووم، ڕاکردن لەڕاستی بوون، ڕاکردن لە ڕاستی ژیان. لەپێشمدا جیهانێکم دەبینی گەورەوو بەرین لەگەڵ نهێنی نەزانراوو نادیار. ئێستا کەخۆم لەدەست وەهم قوتارکردووە.دەبوو چی بکەم وچ ڕێگایەك بگرمەبەر؟ دایکم هاوکاری کردم کە جلەکانم دووبارە لەبەربکەمەوەو گوتی:

حەزدەکەم ڕێگەم بدەیت تاکو چارۆکەکەی دایکت بۆ بهێنم وبیخەمە سەرشانت. چەندین ساڵە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە دەکەم! ئەو ڕۆشت و پاش چەند خولەکێك گەڕایەوەو چارۆکە تەنکە جوانەکەی هێناو خستیە سەر شانەکانم وبەردەوام بوو:

ئائێستا تۆو دایکت وەك یەکن. ئەو چارۆکە بۆنی ئەوی لێدێ. کاتێك بۆنی دەکەیت واهەست دەکەیت ئەو لەگەڵ تۆدایەولێت جیانیە. چارۆکەکەم بەخۆمەوە چەسپاندو تێربۆنم کرد. لەوکاتەبەدواوەکچێتی بەلامەوە شەرمەزاری نەبوو هەڵنەدەهاتم. ماڵئاوایم لەکوڕێتیم کرد. عەشقی مامۆستا زیاتر پاڵی پێوەدەنام تاکو لەسروشتی ڕاستەقینەی خۆم نزیك ببمەوە. بەڵام دەبێت دان بەوەشدابنێم کە ئەوڕەفتارانەی کەبیست و یەك ساڵ بووخووم پێوە گرتبوون لەماوەیەکی کەمدا نەمدەتوانی دەستبەرداریان ببم. ڕوخسارم

جوان وفریودەربوو، بەلاّم ئارایشتی ژنانەم نەدەکردو شێوازی دڵداریم نەدەزانی. عەشق بە جۆرێك ڕیشەی داکوتابوو کە کردبومیە کچێکی دڵناسكوبیانووگر. ڕۆژێك دایکم گوتی:

سادە بۆ وەهات بەسەر هاتووە؟ بۆچی گۆشەگیرو بێدەنگی؟ سەیرێکم کرد. ویستم لەو ڕوانینەمدا تێبگات کە عاشق بووم، بەلاّم چونکە تێنەگەیشت خۆم هاتمە قسەو گوتم:

عاشق بووم! بەوساناییە کە بۆتۆی باس دەکەم! وەکو کچان شارەزایم نەبوو، کەبەنهێنی و شەرمەوە وردورد ڕازی عەشقم بدرکێنم. دایکم بە بیستنی ئەودانپیانانەم سەرسام بوو، وەك ئەوەی باوەڕم پێ نەکات سەیرێکی کردم و گوتی:

عاشق بووی؟ مەبەستت چی یە؟ گوتم:

منیش وەکو هەموو کچێك عاشق بووم وتەواو! ئایا سەرسوڕمانی دەوێ؟ دایکم تفی ناودەمی قوتدایەوە و پرسی:

باشە. عاشقی کێ بوویت؟ ئایا ئێمە دەیناسین؟ پێکەنینم پڕاو بە دەنگی بەرز لەقاقامدا، دایکم بەشەرمەوە گوتی:

شتێکم گوت شایانی پێکەنین بێت؟ دەستیم گرت وگوتم:

نەخێر، دایکەگیان قسەکەی تۆشایانی پێکەنین نەبوو. بەوە پێدەکەنم کەنەك بەتەنها ئێوە نایناسن، بەڵکو خۆیشم تائێستا نەمبینیوە. دایکی بێچارە نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

یــا...... موقــەدەس یارمــەتیم بــدە! کچــەکەم شــێت بــووە. وەلاّمــم نەدایــەوە. هەستامەوەو ڕۆمانێکی مامۆستام لە بەردەم داناو گوتم:

من عاشقی نوسەری ئەم کتێبەم! هەناسەیەکی ئارامی هەڵکێشاو گوتی:

ئا...ە! ئێستا زانیم. تۆ عاشقی کتێب بوویت! گوتم:

نەخێر دایکە، عاشقی نوسەرەکەی. پرسی:

تۆ کە ئەوت نەبینیوە چۆن توانیت عاشقی بیت؟ کتێبەکەم بە سینگمەوە گوشی وگوتم:

من ئەو لە هەموو دێڕی کتێبەکەیدا دەبینم! پرسی:

باشە دەتوانیت پێم بڵێیت شێوەی چۆنە؟ گوتم:

تاوێك باڵای بەرزوو لاوازەو کاتێکیش کورت و قەڵەو. هەستایە سەرپێ و بەتوڕەییەوە گوتی:

من لە قسەکانی تۆ سەردەرناکەم. گوتم:

تۆڕەمەبە. من ئەو لە چوارچێوەی ئەو پاڵەوانانەدا دەبینم کە دروستیان دەکات. سەردەمێك سایەقی لۆرییەو کاتێکیش پزیشك و برینپێچ. واهەست دەکەم ئەودەیەوێت کەسایەتی خۆی لە ڕوخساری پاڵەوانەکانیدا بشارێتەوە. چ ئەنگیەکی تێدایە کە عاشقی سایەق لۆرییەك بم کەورگێکی قەڵەووسمێڵێکی فشی هەبێت؟ یان عاشقی برینپێچێك بم کە ڕوی بە ڕوپۆشێکی شین داپۆشرابێ‌و ماسکێك بە دەمیەوە بێت. دایکە پێمبڵێ چ شتێکی تێدایە؟ چونکە بەتەواوی دەزانم کە دروستکەری هەموونەمانە تەنها یەککەسەو منیش لە ڕاستیدا بەتەنها عاشقی ئەوکەسەم. پرسی:

ئەگەر دڵدارەکەت ژن ومنداڵی هەبوو چی دەڵێی؟ ئایا هێشتا هەرخۆشت دەوێت؟ ئەو قسەیەی ڕایچڵەکاندم، چونکە تائەوکاتە بیرم لەوحاڵتە نەکردبوەوە. گوتم:

نەخێر، ئەو بێگومان ژن ومنداڵی نیە. گوتی:

لە کوێ دەزانی؟ لە کاتێکدا تۆ ئەوناناسیت؟ گوتم:

تاکو ئێستا شتێکی لەوجۆرەی لەکتێبەکانیداباس نەکردووە. بە پێکەنینێکەوە گوتی:

تۆ واهەست دەکەیت نوسەرەکان لە سەرەتای کتێبەکانیاندا دەنوسن خوێنەرانی خۆشەویست من نوسەرێکم بێ ژن یان ژندار؟ نەخێر کچی خۆم دروستکردنی پاڵەوان و پاڵەوانێتی تایبەتمەندی کتێبە. نوسەر ژیانی تایبەتی خۆی لە کتێبەکەیدا بە جیاواز دەپارێزێت. گوتم:

بەهەرحاڵ ئەگەر ڕۆژێك بینیمو بۆم دەرکەوت کە ژنی هەیە لەوێدا دەوەستم و دەست لە ژیانیان وەرنادەم.

– باشە پاشان چی دەکەیت؟ ئایا دەتەوێت تا کۆتایی تەمەنت لەپێناوی عەشقی بێ سەمەردا بسوتێیت؟ گوتم:

نازانم. لەوانەیە لەو ڕۆژەدا بیرو باوەڕم بگۆڕێ و عەشقی مامۆستام لەبیر بچێتەوە. بە گاڵتە پێکردنەوە زەردەخەنەیەکی کردوو بەردەوام بوو: بەو شێوەیە تۆ لە عەشقدا زۆر قوڵ دەبیتەوە، بێگومانم کە ناتوانی بەو سادەییە لە بیری بکەیت. وەرە لام دانیشەو خەریکی فرۆکەوانیەکەت بەو دەست لەو مامۆستا نەناسراوە هەڵگرە. گوتم:

ئەگەر لە کارەکەم بەردەوامبم. هەرئەو سادەیە دەبم کە بووم. ئایا تۆ ئەوەت دەوێ؟ دۆشداماو گوتی:

تۆ منت سەرسام دەکەیت. فرۆکەوانی چ پەیوەندیەکی بەکوڕ بونتەوە هەیە. گوتم:

لەبەر ئەوەی ئەو ئارەزوە هینی سەردەمانێك بوو کە دەمویست کوڕبم. بەڵام ئێستا پڕ بە دڵ حەزدەکەم وەکو کەیبانوویەك لە ماڵەوە دانیشم وچاوەڕوانی گەڕانەوەی هاوسەرەکەم بکەم. حەزدەکەم وەك تۆو دایکم، مەکۆیەکی گەرم بۆ هاوسەرەکەم دروست بکەم. ئایا ئەم بیرکردنەوەیەم هەڵەیە؟ بە زەردەخەنەیەکی گاڵتە ئامێزەوە گوتی:

نەخێر، زۆر زۆرباشە بە مەرجێك لەسەرەتادا هاوسەرەکەت پەیدابکەیت وپاشان ماڵەکەت گەرم بکەیت. ماوەیەك تێپەڕی وباوکم بەدواداچونی کردوو زانیاری تەواوی لەسەر مامۆستا کۆکردەوە. ئەو پیاوێکی کراوەبوو خەڵکانێکی زۆری دەناسی. شەوێك لەگەڵ کوڕێکی لاودا هاتەوە بۆ ماڵەوەو گوتی ئەوە کوڕی یەکێك لە هاوەڵە موسوڵمانەکانمەو ناوی عەتا..یە پاشان بەفێڵبازییەوە سەیرێکی کردمو گوتی:

گوێت لەوقسەیە بووە کە دەڵێن: ئاو لەگۆزەدایەو ئێمەش لە تینواندا لێومان دەگێڕین. یار لەماڵەوەیەو ئێمەدەرەوەی بۆ دەگەڕێین. گوتم:

بەڵێ بیستومە. گوتی:

مامۆستا مهرزادەکەی تۆ یەکێکە لە ئاشنا هەرەنزیکەکانی کاك عەتا. لە بیستنی ئەم قسەیە بە شێوەیەك ڕاپەڕیم کە بێئاگا لە زەوی بەرزبومەوە! بە جۆرێك ئەو کوڕە بێچارەیە پەشۆکاو بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکردم. لەم کردارەی خۆم شەرمەزاربووم وداوای لێبوردنم کرد. باوکم ناچاربوو بۆ ئەوەی "ئاغای مەلەکی" بە شێتم

تێنەگات، ڕاستی مەسەلەکەی بە تەواوی بۆ گێڕایەوە. عەتا لە بیستنی ئەم ڕوداوە هیچ سەرسام نەبوو لە کۆتایدا بە وتنی ئەم قسەیە"ئا...وا" بێ دەنگ بوو. پاش ماوەیەك بێدەنگی، مەلەکی ڕوی کردە من وگوتی:

لەوانەیە بتوانم هاوکاریتان بکەم. مامۆستا مهرزادی هونەرمەند. شایستەی ئەوەیە کە تەنها بە هونەرەکەی عاشقی ببیت. ئەو نوسەرەو نەقاشیش هونەری دووهەمینی، هەربۆیە حەزدەکات کتێبەکانی وێنەداربن. بەم شێوەیە مامۆستا لە نوسەرەکانی ترجیا دەکرێتەوە. ئەو پیاوێکی بەرێزەو...لەنێوان قسەکانیدا پرسیم:

ئایا ژنی هەیە؟ بزەیەکی کردو گوتی:

نەخێر. سەیرێکی دایکم کرد. بەمانای ئەوەی زانیت من بە هەڵەدا نەچوبووم؟ بەلام مەلەکی هێنامیەوە سەرخۆو گوتی:

ئەو ژنی نییە، چونکە نەیتوانیوە هاوسەر هەڵبژێرێت. دایکم پرسی:

بۆچی چ کەم وکورتیەکی هەیە؟ مەلەکی بۆ جاری دووەم بزەیەکی کردو گوتی:

لەڕوکەشدا هیچ. ئەو پیاوێکی گۆشەگیرو شەرمنەو لەناو کۆمەڵ و ئاهەنگەکاندا زۆر بەکەمی دەبینرێت. مامۆستا زەماوەند ناکات، چونکە زۆرچاك دەزانێت کە هیچ کچێك ناتوانێت لەگەڵ ئەو ڕەوشتە توندەی ئەودا هەڵبکات. ئەو زۆر زور توڕە دەبێت و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە. ئەمەم بۆیە گوت تاکو بزانن خۆشەویستەکەتان پیاوێکی ڕووخۆش و میهرەبان نییە. مامۆستا بە تەنها دەژی. لەپاش مردنی دایك وباوکی هیچ کارەکەرێك نەیتوانیوە تاسەر توڕەییەکەی ئەو تەحەمول بکات. مامۆستا ئەمەندە کارەکەری گۆڕیوە، ناوەکانیانم لێ تێك دەچێ! ئێستاش بەبێ کارەکەر دەژی. بۆ ئەوەی پەی بە ڕاستی قسەکانم ببەیت ولە نزیکەوە ببینیت و بزانیت دڵت بە چ کەسێك داوە، دەتوانم تۆ بەناوی کارەکەرەوە بەوبناسێنم. هەم زیارەتە و هەم توجارەت! بەلام لە ئێستاوە پێت دەڵێم کە ناتوانیت شوێنێك لە دڵی مامۆستادا پەیدا بکەیت! پاشان ڕوی کردە باوکم. ئەگەرچی دەزانم ئێوە بەم کارە ڕازی نین، بەلام داوادەکەم ڕازیبن تاکو کچەکەتان لە نزیکەوە لەگەڵ ئەو پیاوەدا ئاشنا بێت وخۆی پەی بەو ڕاستیە ببات کە مامۆستا پیاوێك

نیە بتوانێت هاوسەرەکەی خۆش بەخت بکات. من بەڵێنی ئەوەتان پێ دەدەم کە کچەکەتان لەماوەیەکی کەمدا دەست لەو عیشقە خەیاڵی ومنداڵانەیە هەڵدەگرێو داهاتویەکی روناك بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. دایکم بە ڕقێکی ئاشکراوە گوتی:

ئاغای مەلەکی ئەمە چ پێشنیارێکە دەیکەیت؟ ئێمە زیندوین وکچەکەمان کارەکەری خەڵك بێت؟ هەرگیزاو هەرگیز بەم کارە ڕازی نابم. سادە داواکارێکی هەبوو هەتابڕیاری دابوو فرۆکەی بۆ بکڕێت، ئەو ڕەتی کردەوەو ئامادە نەبوو مێردی پێ بکات، ئێستا تائەو ڕادەیە بێچارە بووە کە لەبەر عەشقەکەی لە خاکی زەلیلیدا دابنیشێت؟ لە پشتەوە چەند سەرە سیخورمەیەکم تێکوتا بۆ ئەوەی نەکو باوکم پێشنیارەکەی مەلەکی ڕەت بکاتەوە. دایکیشم لە پاشان بۆ نیشاندانی نارەزایی لەو ژورە چووە دەرەوەو منیش لەگەڵیدا چوم ولە ژورەکەی تر ڕوبەڕوی دانیشتم وگوتم:

دایکە دەزانم بۆ ئێوە قابیلی قبوڵ نییە کە من کارەکەری بۆهیچ کەسێك بکەم. ئێوە منتان بە ناز پەروەردە کردوەو منیش ئەو ئارەزووە دەکەم کە هەموو کچێکی تردەیکات. هەر شتێکم داوا کردبێت بۆتان فەراهەم کردوم ، بەڵام دایکە گیان من دەمەوێت ئەم کارە ئەنجام بدەم، گەرچی کارێکی بێ نرخەو هۆکاری بێزاری ئێوەیشە، بەڵام دەمەوێت داوای لێ بوردنتان لێ بکەم کە لەو کارەم دەست وەرنەدەن، چونکە دەمەوێت مامۆستا تاقی بکەمەوە. من عاشقی مامۆستام وکارکردن بۆ ئەو کۆتا ئارەزوی منە ئاغای مەلەکی بڕوای وایە کە من ناتوانم خۆم ڕابگر بم و بە شکست خواردویی دەگەڕێمەوە. ئەوە بۆچونی ئەوە، لەوانەیە ڕاست بکات و بە هەڵەدا نەچوبێت، بەڵام تاکو تاقی نەکەمەوە دڵنیانابم، من بەهەموو خواستەکانم گەیشتووم، لێ نەگەڕێت واهەست بکەم لەم بارەیەوە شکستم خواردووە. ئێوە هەمیشە هاوکاری منتان کردووە ئەمجارەشیان دریغی مەکەن! سوپاستان دەکەم! لەبەرامبەریدا بە چۆکدا هاتم. دایکم دەستی بەسەروو قژمدا هێناو گوتی:

بەڵام دەترسم بۆتۆ ئەستەم بێتو لەئەنجامدا نائومێد ببیت. گوتم:

گرنگ نییە، ئەگەر شکست بخۆم دەزانم کە جەنگم کردووە، بەڵام ئەگەر بەبێ جەنگ شکست بەخۆم بدەم هەرگیز لە خۆم نابوورم. دایکم بۆماوەیەك چووەخەیاڵەوە و پاشان گوتی:

نامەوێت بۆچونی سەردەمی منداڵی جارێکی تر لەتۆدا زیندوو ببێتەوە. برۆ خەریك بە، بەڵام پەیمانم پێ بدە ئەگەرماندوو بویت زوو بگەڕێیتەوە. ڕوخساریم ماچ کردوو گوتم:

بەڵێن دەدەم. کاتێك چومە دەرەوە مەلەکی لەحاڵی ماڵئاواییدابوو، پێم گوت دایکم ڕازی بووە. ئێستا من بەتەواوی ئامادەم. زەردەخەنەیەکی کردوو گوتی:

دەبوو بمزانیبا کە هیچ شتێك نیە بتوانێت لەو بڕیارە پاشگەزت بکاتەوە. کارتێکی دەرهێناو دایە دەستم وگوتی: ئەمە ناونیشانی کۆمپانیاکەی منە. بەیانی زوو بێرە ئەوێ تاکو شێوەی پەیوەندی کردنتان لەگەڵ مامۆستادا بۆ روون بکەمەوە. لە بارێکدا کە گاڵتەی بە من دەهات و زەردەخەنەی دەکرد. گوایەلە شکستی من دڵنیابوو. پاشان ماڵئاوایی کرد. منیش وەڵامی زەردەخەنە گاڵتە ئامێزەکەی ئەوم بە پێکەنینێك دایەوە کە نیشانەی بڕوا بەخۆبوون بوو پێکەنینەکەم دەیگوت: ئایندە دەیسەلمێنێت.

بەیانی چومە شوێنی کارەکەی. لە بینینم خۆشحاڵ بوو دەستوریدا قاوەمان بۆ بهێن. لەکاتی شیرین کردنی قاوەکەیدا گوتی:

ناترسیت لەوەی کەلەگەڵ پیاوێکی تەنهادا بژیت ؟ فنجانە قاوەکەم لەسەر مێزەکە داناو گوتم:

من لە هیچ پیاوێك ناترسم، چونکە خۆم لەوان بە کەمتر نازانم! بەردەوام بووم: ئەگەر ڕۆژێك پیاوێك بیەوێت بێزارم بکات بە یەك مشت تەختی زەوی دەکەم. لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

باوەڕ بە قسەکانتان دەکەم. تکایە مشتت بکەرەوە. تازە لەوە ئاگادار بووم کە لە حاڵەتی هێرش بردندا بووم. پێکەنیم و داوای لێبوردنم لێ کرد. ئەو لە کاتێکدا لەسەر کاغەزێك شتی دەنوسی. گوتی:

Scanned with CamScanner

بە هەرحاڵ ئاگاتان لە خۆتان بێت. تۆ کچێکی جوانی و جوانیش هەمیشە کارەساتی بە دواوەیە. بەڵێن بدەیت ئەگەر... قسەکەیم پێ بڕی و گوتم:

دەزانم دەتەوێ چی بڵێی. بە دڵنیاییەوە بەڵێن دەدەم و سوپاسی ئەرکی بەڕێزیشت دەکەم. نامەکەی نایەناوزەرفێکو دایە دەستم وگوتی:

بەیانی زوو برۆ. دەزانم کە مامۆستا ئێستا لەماڵ نیە. بەیانی زوو پێش ئەوەی لەماڵ بچێتە دەرەوە بگەرە ئەوێ. هەستام هاتمە دەرەوەو ئەویش بۆ خواحافیزیم لەگەڵم هات و بە گوتنی سەرکەوتوبیت ماڵئاوایی لێکردم. بە خێرایی خۆم گەیاندە ماڵەوەو خەریکی کۆکردنەوەی کەل و پەلەکانم بووم، دایکم بە وردی سەرنجی دەدام و بە نیگاکانیا ئەوەم دەخوێندەوە کە بەتەواوی بڕوای وابوو بەزویی دەگەڕێمەوەو لەوێ هەڵناکەم. بە زەحمەت دەتوانم ڕونی بکەمەوە ئەو شەوەم چۆن بەسەربرد. لە خۆشیاندا خەو لە چاوەکانم تۆرابوون. ئەندێشەو خەیاڵاتی جوان جوان بە مێشکمدا دەهاتن‌ودەچوون. نەخشەم دادەڕێژا کە لە یەکەم چاوپێکەوتنندا چۆن چۆنی خۆم بنوێنم تاکو جێگەیەك لە دڵیدابۆخۆم بگرم. هەر لەو شەوەدا بووکە ئاهی ئەوەم هەڵدەکێشا چۆن منیش وەك هاوڕەگەزەکانم شێوازی ڕوبەڕووبونەوە لەگەڵ پیاواندا فێرنەبووم! شەو بە نیوە گەشتبوو، بەڵام من هێشتا لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا نەجولا بووم. خۆم ئارایشت دەکردو پرچم بە شێوازی جیاجیا دادەهێنا، بەڵام هیچ جۆرێکیانم بەلاوە جوان نەبوو. لە ڕاستیدا نەمدەزانی چ جۆرێکیان مۆدێلی سەردەمە، چونکە هیچ کاتێك بیرم لەو شتانە نەکردبوەوە. کاتێك خۆمم ناسی. قژم هێندە کورت بوو بە ئەستەم دەگەشتە سەرشانم. یان لە پشتی سەرمەوە کۆم دەکردەوەو تەوقەیەکم لێدەدا. دواجار کە هیچ مۆدێلێکم بەلاوە پەسەند نەبوو. قژم هۆنیەوەو لەگەڵ گوتنی هەرچی دەبێت بابێت، چومە سەرجێگەکەم.

بەیانی زوو زوو بە دەنگی دایکم کە دەیگوت، وا باشترە خۆت ئامادەبکەی بۆڕۆشتن. لە خەو بێدار بووم. لە ڕەنگ و ڕوی شێواوو چاوە سوربووەکانی تێکەیشتم کە دوێنێ

شەو لە مەراقدا خەوی لێ نەکەوتوەو هەوڵ دەدات بەسەر خۆی نەهێنێ. ڕوخساریم ماچ کردو گوتم:

خەیاڵ نەکەیت ئەگەر دایکی ڕاستەقینەی خۆم زیندوو بوایە لە تۆم خۆشتر دەویست.

بە بیستنی ئەم قسەیە فرمێسک لە چاوەکانیەوە داباریین و لە باوەشی گرتم و گوتی:

تۆ خۆشەویستی منی، هیچ کاتێك وەهام بیر نەکردۆتەوە کە تۆ کچی ڕاستەقینەی ئێمە نیت. ئومێدەوارم لەو ڕێگایەی گرتوتە سەرکەوتوو بیت. حەز دەکەم لە هەموو کارەکانتدا خودای گەورەت بە باشی لە یادبێت، پاشان دڵۆپە فرمێسکەکانی لەسەر ڕوخساری سڕی و لەکاتێکدا کە هەوڵی دەدا پێبکەنێت و خەمەکانی بشارێتەوەو گوتی:

من بوخچەی جلەکانتم ئامادە کردوە. دەستی بە گاڵتەو گەپکرد:

خێراکە زووبە! نانی بەیانیت بخۆو بەڕێکەوە لەوانەیە مامۆستا لە ماڵ دەرچێ. هیچ خاوەن ماڵێك کارەکەری تەمەڵی ناوێت! بەقسەمکرد، جلی سادەیم لەبەر کردوو قژم بەسەر هەردو شانمدا بەردایەوە. لەگەڵ دۆعای خێری باوك و دایکمدا لە ماڵ چومە دەرەوە. تەکسیەکم گرت و بەو ناو نیشانەی کە مەلەکی پێی دابووم کەوتمە ڕێ.

"٢"

لەیەکەم شەقامدا لەتەکسییەکە دابەزیم. هێشتا کاتژمێر حەوت نەبوو بوو. بیرم کردەوە ئێستا زۆر زووە دەرگای پێبگرم. هێواش هێواش هەنگاوم هەڵێناو بیرم لەسەرەنجامی ڕوداوەکە دەکردەوە ڕاستی و ناڕاستیەکەیم لەتەرازووی مێشکی خۆمدا هەڵدەسەنگاند.بە پێیان کەوتمە ڕێ، لە سەرکەوتنم دڵنیا نەبووم. بەو تایبەتمەندیانەی کە ئاغای مەلەکی لە بارەی مامۆستاوە گوتبووی سەرکەوتنی خۆم لە نزیکی سفرەوە دەبینی، بەڵام بەوحاڵەشەوە هێشتا ئومێدم هەبوو بەوەی کە تاقی کردنەوەکەی مامۆستا زیانێکی نیە. بای ساردی پایز ڕوخسارمی دەگەزی. لەسەر کۆڵانەکەدا کەمێک وەستام. هیچ یەکێك لە خانوەکانی ئەو کۆڵانە لەشێوەی یەکتر نەبوون. بەتامەزرۆییەوە چاوم لەکۆڵانە چەوڕێژەکەو تەنیا درەختێکی بەرامبەر ماڵەکەبڕی. بەرامبەر ماڵێك وەستابووم کە نەمدەزانی قەدەرمە تەواوی تەمەنم لەوێدا بەسەر ببەم و بۆ گەشتن بەو ڕۆژە دەبوو چ ناڕەحەتیەك تەحەمول بکەم! بۆ لێدانی زەنگی دەرگاکە بەرەو پێشەوە چووم، لەخۆمەوە بەرەو دوا گەڕامەوە. چاوەکانم بە یەکداناو هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا، هێزم دایە بەرخۆم. ئافرەتێکی زەمیلە بەدەست لە تەنیشتمەوە تێ پەڕی. چونکە چوون و گەڕانەوەکەمی بینی بوو هەستی بە دوودڵیەکەم کردو گەڕایەوە بۆ لامو گوتی:

دەتوانم یارمەتیتان بدەم؟ نە ناسراو دێیتە بەرچاو. ڕێبواریت؟ تفی ناو دەمم قوت داو گوتم:

بە شوێن ماڵی مامۆستا مهرزاددا دەگەڕێم. نازانم دروست هاتووم یان نە...؟ ئافرەتەکە زەمبیلەکەی دابەدەستەکەی تریبیەوەو لە کاتێکتدا زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوەکانی گوتی:

بەڵێ دروست هاتویت. ئێستا بە تەواوی ڕوبەڕوی ماڵی مامۆستا وەستاویت. لەپاش سوپاسکردنی ئافرەتەکە چارم نەبوو زەنگم لێ دا. چەند دەقیقەیەك چاوەڕوانم کرد تاکو دەرگاکە کرایەوەو پیاوێك کە وادیار بوو تازە لە خەو بە ئاگا هاتووە لە بەر دەرگاکەدا ڕووبەڕوم بویەوە. بە بینینی ئاگام لە خۆم نەمابوو. زمانم لە ناو دەممدا نەدەگەڕا. بەسەر سەلامم لێ کرد. ئەو کە ئاگاداری بێ توانایی من بوو گوتی:

بفەرموو خانم فەرمانێکتان هەبوو؟ بە پێچەوانەی ئەوەوە کە پێش بینیم کردبوو. دەنگی پڕ سۆزو میهرەبان بوو. چونکە بەو تایبەتمەندیانەی کە"عەتا"باسی کردبوو. وام بە خەیاڵدا دەهات پیاوێکی نا حەزو ڕوو گرژ ببینم. پاشان بە بیستنی دەنگە لەسەر خۆو میهرەبانەکەی کەمێك هاتمەوە سەرخۆو بەسەر خۆمدا زاڵ بووم و گوتم:

بەیانیت باش، داوای لێبوردن دەکەم لەوەی کە لە خەو بە ئاگام هێنان. بەخێرایی نامەکەم دایە دەستی. سەرەتا سەیرێکی منی کردوو پاشان سەیرێکی نامەکەی کردو بە هێواشی نامەکەی کردەوەو پاش خوێندنەوەی گوتی:

فەرموو! لەو کاتەدا دەرگاکەی بە تەواوی کردەوەوتوانیم بچمە نێوماڵەکەوە. لەو ساڵۆنە خڕو گەورەیەدا شتێکی وەهای تێدا نەبوو کە سەرنجم ڕابکێشێت. هەر زۆر سادەو ساکار بوو. بۆنی تەڕی و وشکی، لە دەرگاو دیوارەکانیدا ئەوەی ڕوون دەکردەوە کە چەند مانگێکە ڕەنگ و ڕوی پاك و خاوێنی بە خۆوە نەبینیوە. تەواو بەو شێوەیەی کە مەلەکی گوتبووی. باوەڕم نەدەکرد ئەمە ماڵی هونەرمەندێك بێت. دەتگوت ئەو ماڵە ژیانی تێدا نییە.

چەند قەنەفەیەکی سورمەیی، ڕەنگیان سپی هەڵگەڕابوو پارچە قوماشێك بەسەر مێزەکەوە بوو کە مرۆڤ لەدەست لێدانی دەترسا نەکو بەدەستییەوە ڕێزە ڕێزە ببێت.! لەو کاتەدا نەمتوانی شتێکی تر ببینم. ئەو فەرمووی دانیشتنی لێ کردم و یامەتی خواست

کە بۆ گۆڕینی جلەکانی بڕواتە قاتی سەرەوە. لەو کاتەدا فرسەتم دەستکەوت کە وردتر بە دەوری خۆمدا بڕوانم. ڕووکەشی دەرەوەی ماڵەکە زۆر لە ناوەوە باشتر بوو. دوو تابلۆ کە لەوانەبوو دەستکردی مامۆستا خۆی بێت. بە دیواری ساڵۆنەکەوەخۆی دەنواند. بێگومان تابلۆکان پەیوەندی بە سەدەی ڕابردووەوە هەبوو. چونکە چوار چێوەکانیان لە پێش خۆیاندا دروست کرابوون. لەلای ڕاستمەوە ژوورێك بوو بەرامبەریشم ژورێکی تر. بەڵام مامۆستا نەچوە هیچ ژورێك لەمانە، بەڵکو لە قادرمەی ساڵۆنەکەوە چووە قاتی سەرەوە. کاتێك هاتە خوارەوە پێکەنینم دەهات. چونکە لەگەڵ پێشان جیاوازیەکی وای نەکردبوو! وەکو پێشو موە ڕەشەکانی شێواوو ئاڵۆزاو بوون. بەڵام لەو کاتەدا هیچ نیشانەیەکی لە میهرەبانی و دۆستی پێوە نەدەبینرا. بەیەکجاری گۆڕاو ئەو پیاوە میهرەبانەی چەند دەقیقەیەك پێش ئێستا گۆڕا بەپیاوێکی وشك و ناحەز. بەرامبەرم دانیشت و پاش کەمێك ئاخ هەڵکێشان گوتی:

سەرم سوڕ دەمێنێ مەلەکی چۆن چۆنی ئێوەی بۆ کارێکی وا دەست نیشان کردوە.

ئایا لە بارەی هەڵسوکەوتی تایبەتی منەوە شتێکی پێ گوتوون؟. بە خێرایی گوتم:

بەڵێ، بە تەواوی ئەو هەموو شتێکی لە بارەی ئێوەوە بە من گوتوەو من ... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

تۆ بەو زانیاریانەشتەوە دەتەوێت لێرەدا کاربکەیت؟!

ـ بەڵێ چونکە پێویستم بەم کارە هەیە. سەیرێکی سەرتاپامی کرد کە هەموو گیانم کەوتە لەرزین. ئەو جارێکی تر ناوچەوانی گرژ کردوو گوتی:

بەهەرحاڵ بەلای منەوە جیاوازی نیە. چ تۆ بیت و چ کەسانی تر! بەڵام دەبێت بە ئێوە بڵێم کە من لەم ماڵەدا بە تەنهام. ئەمە بەلای تۆوە کێشە دروست ناکات؟ بە هەمان بێ تواناییەوە گوتم:

نەخێر. هەرگیز! من وا هەستدەکەم بەبێ ئەوەی گرفتێك بۆ بەڕێزتان دروست بکەم لێرەدا بە ڕێکوپێکی کاربکەم. بە ناباوەڕی سەری لەقاندوو گوتی:

ئارام و لەسەرخۆ با بزانین. زۆرباشە ئێستا وەرە لەگەڵم تاکوماڵەکەتان نیشان بدەم. هەنگاوی دەنا هەروەك ئەوەی فەرشێکی لەپەڕەی گوڵ چنراوی لەژێر قاچدا بێت و بترسێت لەژێر قاچەکانیدا بپروچقێت. دەرگای زۆری لای ڕاستی کردەوەو گوتی:

نێرە زۆری میوانداریبە. هەستم بەوە کرد کە لە شێوەو قەنەفەکاندا لە هۆڵەکی باشترە. لە زۆری لای چەپەوە بە شێوەیەك کەل و پەلی ناو ماڵی زیادەی تێدا بوو مرۆ کاتێك ئەوەی دەبینی وای هەست دەکرد چووەتە مەزاتخانەوە! بەگاڵتەوە گوتی:

بەرهەمی تەمەنێکی ژیانە! نیگەران نەبیت! کارێکی وامان بەم زۆرە نیە! دەرگای لە دوای منەوە پێوەداو بە قادرمەکاندا پێکەوە چوینە سەرەوە. لە ڕاڕەوە بچوکەکەی قاتی سەرەوەدا دووژور بەرەو ڕومان بوون. یەکێك لەوژوورانە نوسینگەی کارەکەی بوو. ئەوی دیکەیان زۆری نوستن بوو! دەستی نایە سەر دەسکی دەرگاکەو چاوەڕوانی من بوو وەك ئەوەی ئارەزوو بکات چەند زوترە ئەویَ جێبهێڵت. کاتێك لە قادرمەکان هاتینەخوارەوە پرسیم:

چێشتخانە لەکوێدایە؟ گوتی:

هەر ئێستا نیشانتان دەدەم. دواجار لە هۆڵەکە تێپەڕین و چوینە حەوشەیەکی گەورەوە کە حەوزێکی شێوە کۆن لە ناوەندی حەوشەکەدا خۆی قیت کردبوەوەو بە چوار دەوریشدا گوڵدانەکانی ڕیزکردبوو.

لە کۆتایی حەوشەکەدا چێشتخانەیەك و لە تەنیشتیەوە حەمامێك دروست کرابوو. چومە چێشتخانەکەوە، بەڵام لەبەر بۆنی ناخۆش نەمتوانی بە جوانی لێی ورد ببمەوە. پاشماوەی خۆراك. قاپە پیسەکان لەسەر یەك کەڵەکە ببو بوون. بۆنی نەوت. پیازی گەنیوو... لە کاتێکدا کە لوتم گرتبوو گوتم:

ئێرە کاری زۆری دەویَ! بە سەری قسەکەمی پەسەند کردوو پێکەوە بەرەو هۆڵەکە گەڕاینەوە. ئەو دانیشت و جگەرەیەکی لە گیرفانی کراسەکەیدا دەرهێناو بە شقارتەیەك دایگرساند. لەو کاتەدا چاوی بە خاچەکەی سەر سنگم کەوت. دوکەڵی جگەرەکەی دایەوەو پرسی:

موسوڵمان نیت؟

ـ نەخێر موسوڵمان نیم.

ـ لە نامەکەدا نەنوسراوە کە پێشتر لە کوێدا کارت کردوە.

ـ پێشتر لە هیچ جێگایەك کارم نەکردوە. قاچەکانی نایە سەر یەك و گوتی:

بۆچی دەتەوێت کارەکەری بکەیت؟ لە کاتێکدا دەتوانیت ببیتە نمایشگەری جلوبەرگ، یان بۆنمونە هونەرمەند و یان ببیتە نەقاشو لەو رێگایانەوە پارەیەکی باشتر بەدەست بهێنیت. گوتم:

دەزانم، بەڵام زیاتر ئارەزوی ئەم کارە دەکەم. حەز دەکەم خزمەتی هونەرمەندێك بکەم. ئەزمونی ماڵداریش فێرببم. تێگەیشتم کە وەڵامەکەم ڕازی نەکردوە، بەڵام هیچی نەگوت و چیتر پرسیارێکی نەکرد. بەڵام ئیتر نۆبەی من بوو، پرسیم:

گرفتێك نیە ئەو ژورەی ڕوو بە ڕومان تایبەت کەم بە خۆم؟ سەری سوڕماو پرسی:

بۆچی دەتەوێت لێرە بمێنیتەوە؟ گوتم:

ئەگەر نەبمە هۆی بێزاریتان. بەڵێ، چونکە هەست دەکەم بۆ ئەزموون کۆکردنەوە دەبێت لەگەڵ کارکردنیشدا، ژیانیش بکەم. وەڵامی نەدامەوە. ماوەیەك چووە بیرێکی قوڵەوە وپاشان گوتی:

ئەم نهۆمەیان لە دەستی تۆدایە، بەڵام تکات لێ دەکەم پێ نەنێیتە ناوچەی منەوە! بە پەنجە ئیشارەتی بۆ نهۆمی سەرەوە کرد. گوتم:

هەر جۆرێك کە تۆ مەیل بکەیت، ئێستا بە یارمەتی خۆت پێم بڵێ تۆ ئارەزووی چ جۆرە خواردنێك دەکەیت؟ هەستاو لە کاتێکدا کە لە قادرمەکان دەچووە سەرەوە گوتی:

لەو لایەنەوە زەحمەتی خۆت مەدە، من زۆربەی کات لە ماڵەوە نیم کەبتەوێت خواردنم بۆ ئامادە بکەیت، بەڵام ئەگەر ڕۆژێك مامەوە لەو شتانەی کە لە ماڵدا هەیە خۆت سەر پشك دەکەم، کاتێك لەبەر چاوەکانمدا ون بوو، هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو دۆشدامام کە دەبێت چ کارێك بکەم و سەرەتا لە چ لایەکی ماڵەکەوە دەست پێ بکەم. دەرگای ئەو ژورەم کردمەوە کە دەبوو بۆ خۆمی ئامادە بکەم هەرلەوکاتەدا چومە خەیاڵەوە:

ئایا ژیان لەگەڵ ئەم پیاوەدا سەخت و دژوارە؟ لەوانەیە مەلەکی ڕاست بکات ی

دەیگوت، ناکرێت لێی نزیك ببیتەوە. لە ناکاودا ئازایەتیەکم لە خۆمدا هەست پێکرد

لەخۆمەوە پەلامارمدا کە ململانێ تازە دەستی پێکردوە. هەوڵی سەرکەوتن بدە! ئەگەر

نەشتوانی لە دڵی ئەودا جێگایەك بۆ خۆت بکەیتەوە. هیچ نەبێت ماوەیەك لەگەڵ ئەو

کەسەدا کە خۆشت ویستووە دەژیت و لە نزیکەوە لەگەڵ شێوازی ژیاندا ئاشنایەتی پەیدا

دەکەیت. ئەو بیرکردنەوەیە هێزێکی تازەی پێ بەخشیم. بوخچەکەم بردە ژورەکەی

خۆم، بە بانگی مامۆستا کە دەیگوت:

خانم گریگوریان! لە ژورەکە هاتمە دەرەوە بینیم کە قژی شانە دەکرد جانتایەکی بە

دەستەوە بوو ئامادەی ڕۆشتن بوو. گوتم:

بەڵێ؟ گوتی:

تا دەرفەتێکم دەبێت و ئەم شتە زیادانە دەبەمە دەرەوە. تۆ بۆ خۆت دەتوانیت کەڵك

لە یەکێك لەم ژورانە وەرگریت. من میوانی زۆرم نین و پێویستم بەئێرە نییە، پاشان لە

ماڵ چووە دەرەوە. دووبارە هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشاو دەستم بە کارکرد، تا کاتێك

کە لە برساندا زکم هاتە ژان. سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد، کاتژمێر پێنجی ئێوارە بوو من

تاکو ئەو کاتە زادم بە زار نەکەوتبوو! سەیرێکی ژورەکانم کرد، هەتا خۆشم گێژ ببووم.

هەموو جێگایەك پاك و خاوێن بوو جگە لە ژورەکانی نهۆمی سەرەوە، چومە بیری

خۆراکەوە. برسیەتی ئارامی لێ تێك دابووم! لەگەڵ ئەوەشدا کە برسیم بوو لەوەش

ئاگادار نەبووم مامۆستا بۆ نانخواردنی ئێوارە دەگەڕێتەوەماڵ یان نە؟ لە بەفرگرەکەدا

تەنها چەند هێلکەیەك و چەند تەماتەیەکی سیسەوە بووم دۆزیەوە! لە کاتی پاك

کردنەوەی چێشتخانەکەدا کیسەیەك نانم بینی بوو، بەئەستەم توانیم چەند پارویەکی لێ

بجووم. کەمێك برسیەتیەکەم باش بوو. دەست و دەم و چاوم شۆردو بەخۆمم گوت:

ماڵێکم بۆ ڕازاندۆتەوە کە شایستەی هونەرمەندێکی وەك ئەو بێت. بەرامبەر

چێشتخانەکە ڕاوەستام و چاوم بڕیە حەوشەکە. دەبوو بیرێك لە گوڵدانەکان بکەمەوە کە

تیشکی هەتاو ڕەنگی بردبوون. چەند دانەیکیانم لە قەراخی قادرمەکاندا ڕیز کردوو

باقیەکەی تریانم لە پشتی پەنجەرەی ژورەکەی خۆمەوە دانان. وام بە خەیاڵدا نەدەهات ژورەکەم بەو شێوەیە جوان و دڵگیر بێت. ئێستا تەنها تەختە خەوێکم هەیە لەگەڵ مێزێك و دو کورسیدا. بۆچی دوو کورسی؟ نازانم! لەوانەیە ئارەزوم کردبێت رۆژێك پێ بنێتە ژورەکەمەوەو منیش یەکێك لەو کورسیانەی بۆ دابنێم و بڵێم، فەرموو دانیشە! لەژێر تەختەکەوە تابلۆیەکم دۆزیبۆوە کەدیمەنی جەنگەڵەکانی باکووری تیابووو ئەمێستاکە لەسەر دیواری ژوورەکەم خۆی دەنواند. وێنەی کوخێکی دارین لە خواری دارستانەکەوە دەبینرا. دانیشتم و چاوم تێبڕی. چەند باش بوو ئەگەر من و ئەو پێکەوە لەو کوخەدا ژیانمان بکردایەو من وەك ژنانی گوندنشین نانم بۆ دروست بکردایە. ناوی نان و بیری نان دووبارە برسیەتیان وەبیر هێنامەوە! گەڕامەوە چێشتخانەکە. کتریە کارەباییەکەم لە کارەبادا. هێندە ماندوبووم و خەیاڵی جۆراو جۆر بە مێشکمدا دەهات و دەچوو کە لەناو چێشتخانەکەدا خەو بردمیەوە. لە دەنگی گیزە گیزی کتریەکە بەئاگا هاتم. چاکەم لێناو بە دوو نانەوە خواردم. دەمویست بچمە دەرەوە کە دەنگی کۆکەیەك لە جێگای خۆم وشکی کردم. سەرم لە دەرگای چێشتخانەکەوە بردە دەرەوەو ئەوم بینی کە بەکەیف خۆشیەوە سەیری حەوشەکەی دەکرد. ئێستا ئیتر گەڵا زەردەکان لەناو حەوشەکەدا نەمابوون. ماڵەکە وێنەیەکی تری بە خۆوە گرتبوو. هاتە نزیك چێشتخانەکەوەو گوتی:

هەمووت خاوێن کردۆتەوە؟ بە ڕاستی گەلێك سوپاست دەکەم. گوتم:

سوپاسی پێ ناوێ. کاری خۆمم ئەنجامداوە. چا ئامادەیە. ئارەزوی دەکەی؟ لەباتی وەڵام گوتی:

بەفر گرەکە بەتاڵە ئێستا کە لێرە دەمێنیتەوە دەبێت شتی بۆ بکڕم. ئەوەی گوت و چووە دەرەوە. لەبەر ئەوەی کە بوبومە هۆی دڵخۆشی و تروسکایی بۆ ژیانی ئەو گەلێك دڵخۆش بووم و ماندو شەکەتیم لەبیر چوەوە. کاتێك گەڕایەوە پیاوێکی تری لەگەڵدا بوو کە لە هەڵگرتنی شتەکاندا یارمەتی دەدا. هاتە لامەوەو گوتی:

تۆ لێرە بمێنەرەوەو نەچیتە دەرەوە! نەمزانی بە چ هۆیەك حەزی نەدەكرد ئەو من ببینێت. كاتێك پیاوەكە ڕۆشتە دەرەوە بۆ بردنی پاكەتەكان بەرەو چێشتخانە هاوكاریم كردو گوتی:

بەڵێنی چات پێ دابووم؟ گوتم:

ئامادەیە. پیاڵەیەك چام بۆ هێنا. لێی وەرگرتم و بەرەو هۆڵەكە گەڕایەوە. هێندەی شتومەك كڕی بوو كە بەشی ماوەیەكی زۆری دەكردین. كاتێك لە كارەكەم تەواو بووم گەڕامەوە هۆڵەكەو پیاڵەكەی لەسەر مێزەكە دانابوو، خۆیشی گەڕابووەوە ژوورەكەی خۆی. نەمدەزانی نانی ئێوارەی خواردوە یاخود چاوەڕوانە بۆی ئامادە بكەم؟ تەلەفۆنەكەم هەڵگرت و چەند جارێك زەنگم لێ دا، كاتێك گوێم لە دەنگی بوو گوتم:

نانت خواردوە یاخود بۆتان ئامادە بكەم؟ تەنها گوتی:

خواردومە.زۆرسوپاس. تەلەفۆنەكەی داخستەوە. چومە ژوورەكەمەوەو لێی ڕاكشام. گوێم لە چرپەی پێی بوو كە لە قادرمەكان دەهاتە خوارەوە، بەڵام من لە ژورەكە نەهاتمە دەرەوە. بە خۆم گوت، ئەگەر كارێكی پێم هەبێت بانگم دەكات. چاوەكانم لە ماندویەتیدا نەدەكرانەوە چونكە شەوی پێشتر هەر هیچ نەنوستووم. بیری ئەوەی كە بۆچی ئەو لە منی نەپرسی ئایا نانم خواردوە یان نە لەگەڵ ماندوبوونەكەمدا تێكەڵ ببوون. ئەو كە دەیزانی لەناوماڵدا شتێكی تیا نەبووە بۆ خواردن بشێت. ئایا وا باشتر نەبوو پرسیاری لێ بكردمایەو پاشان لە چێشتخانەی دەرەوە خواردنی بۆ بانگ بكردمایە؟ قسەكەی دایكم هاتەوە یادم كە گوتبوی" حەزناكەم كیژەكەم ببێتە پاشماوە خۆر". بوایە تاكوبەچاوی خۆی دەیبینی هەتا پاش ماوەوش بونێكی نیە تا كچەكەی پارویەكی لێ بخوات! لەسەر نوێنەكەم تەپاو تلم دەدا، دەنگی جیرە جیرێ بەرز بوەوە. هەوڵمدا بیر هێشتا خۆر بەتەواوی لە كەل دەرنەكەوتبوو كە لەخەو بێدار بووم. ئێسقانەكانم ژانیان دەكرد، بەڵام گوێم پێ نەداو بە تامەزرۆییەوە نانی بەیانیم ئامادەكرد. كاتێك بۆ نانكڕین لەماڵ چومە دەرەوە نەمدەزانی نانەوا لە چ لایەكەوەیە. كەمێك سەیری ئەملاو لام كرد

خۆشبەختانە گەیشتم بەو ئافرەتەی کە ڕۆژی پێشو لە بەرامبەر ماڵی مامۆستادا بینیبووم. پاش سڵاوو بەیانی باش ناونیشانی نانەواکەم لێ وەرگرت. خۆیشی بۆ نانەوا دەچوو، شان بە شانی یەکتر بەرەو نانەواکە بەڕێ کەوتین. پرسیاری کرد:

تۆ لە خزمەکانی مامۆستای؟ لە وەڵامی پرسیارەکەی دۆش دامام. نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە. بێ دەنگ بووم و دووبارە پرسیاری کردەوە:

من پێشتر تۆم نەبینیوە. ئێمە ساڵانێکە لەو گەڕەکەدا دەژین. مانای لە کاتێکدا کە دایك و باوکی مامۆستا هێشتا لە ژیاندا بوون. بە ڕەحمەت بن دوو مرۆڤی گەلێك باش بوون. مامۆستاش کەسێکی هونەرمەند و شایستەیە. ئەو جێگای شانازی ئێمەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسێکی کەم نوتقەو لەگەڵ کەسدا گەرم و گوڕ نیە. بەڵام هەموو خەڵکی گەڕەك خۆشیان دەوێ و ڕێزی لێ دەگرن. دوێنێ کاتێك تۆ ناونیشانی ماڵی مامۆستات لێ پرسیم. بە هاوسەرەکەم گوت، مامۆستا لە شارەوە میوانی هاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕوکەشدا بەڕێزتان لە خەڵکی شار ناچن. گوتم:

من لە تاراندا هاتومەتە دنیاوە، بەڵام چەند ساڵێك لە شیراز ژیاومو دایك و باوکیشم لە تاراندا دەژین، ئێمە لە هاوەڵانی دێرینی مامۆستاین و منیش بۆ یارمەتی مامۆستا هاتووم، کاتێك هەستم کرد کەسێك نیە کە لە کارەکانی ناو ماڵدا هاوکاری مامۆستا بکات. خۆم هەستام بەو کارە، چاوە واق وڕماوەکانی تێ بڕیم و گوتی:

بەڵام تۆ زۆر گەنجیت و بۆ ئەو کارە.... قسەکەم پێ بڕی و گوتم:

دەزانم مەبەستان چیە، ئەم کارە بەردەوام نابێت. من تاکو ئەو کاتەی کە مامۆستا کەسێك پەیدا دەکات لێرە دەمێنمەوە ئەگینا کاری من فرۆکەوانیە. بەخێرایی وەك ئەوەی شتێکی هاتبێتەوە یاد گوتی:

بەڵێ ئێستا دەتناسمەوە وێنەی تۆم لە ڕۆژنامەدا بینیوە زۆرم لەخۆم کرد کە بیرم بێتەوە پێشتر تۆم لە کوێدا بینیوە. گوتم:

بەڵێ چەند مانگێك پێش ئێستا وێنەی من و چەند هاوەڵێکی ترم چاپکرابوو، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

تۆ کچێکی ئازایت و جێگای شانازی ئێمەی ئافرەتانی. من لەلای خۆمەوە کاتێك وێنەی تۆم بینی گەلێك خۆشحاڵ بووم و هەستم بە غروری دەکرد. دەیویست بە پاشماوەی قسەکانی بەردەوامی بدات کە گەشتینە نانەواخانەکە. لەکاتی گەڕانەوەشماندا هەر ئەو بوو کە هاتە قسەو گوتی:

ماڵی ئێمە کەمێك لەسەرو ماڵی مامۆستاوەیە. ئەگەر پێویستیت بە هاوکاری هەبوو خۆم و منداڵەکانم بە هەموو توانایەکمانەوە لە خزمەتتدایین. گوتم:

سوپاسی هەست و سۆزتان دەکەم. هەروەکو گوتم، من زۆر لە ماڵی مامۆستادا نامێنمەوە، بەڵام بە چاوان، ئەگەر ڕوبەڕوی گرفتێك بومەوە ئەزیەتتان دەدەم. گوتی:

ئەو قسانە چییە؟ ئێمە ئەگەر بتوانین کارێکتان بۆ بکەین خۆشحاڵ دەبین هەم تۆش و هەم مامۆستاش مایەی شانازی ئەم ئاوو خاکەن. بە ناسینی و بە وتە ڕاستەکانیشی زۆر خۆشحاڵ بووم و بەڵێنم پێدا ئەگەر دەرفەتێکم بۆ هەڵکەوت سەردانیان بکەم. کاتێك گەیشتمە ماڵەوە مامۆستا هێشتا لە خەودا بوو. تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و چەند جارێك زەنگم لێ دا، بەڵام وەڵامم نەبیست . بە ناچاری چومە سەرەوەو بە پەنجە چەند جارێك بە ئارامی لە دەرگامدا، دووبارە وەڵامی نەبوو. بە خەیاڵمداهات نەکاکاتێك من بۆ نانکڕین چوبێتمە دەرەوە مامۆستاش لەو ماوەیەدا ڕۆشتبێت؟ بە هێواشی دەرگاکەم کردەوە، بەڵام ئەو بە ئارامی نوستبوو ژورەکەشی هەروەك خۆی شپرزە بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم، ئەمڕۆ نۆبەی خاوێن کردنەوەی ئەم ژورانەیە. ویستم دەرگاکە پێوەبدەم کە گوتی:

کارێکت هەبوو؟ گوتم:

نانی بەیانی ئامادەیە. کەمێك باڵی لەژێر سەری دەرهێناو لە کاتێکدا کە ورد ورد دەیجوڵاند گوتی:

فێریان نەکردوویت کە سڵاو بەیانی باش بکەیت، یان لەلای ئێوە باوی نیە؟ گوتم:

لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی قسەی جەنابتانەوە فێریان کردومو ڕسومی ئێمەش هەروایە، بەڵام لەناو ئێمەدا ڕسووم نیە کە هەر دەبێت ژن سڵاو لە پیاو بکات و بەیانی باش بڵێ. ئەوەم گوت و لە قادرمەکان هاتمە خوارەوە. یەکەمین ململانێی نێوان من و مامۆستا

دەستی پێ کرد، پێکدا هەڵشاخانێک کە مامۆستا هۆکارەکەی بوو. کاتێک هاتە خوارەوە سەرەتا قینی کردو ویستی خۆی چا بۆ خۆی ئامادە بکات. گوتم:

دەبێت مۆڵەتم بدەیت من نان و چات بۆ ئامادە بکەم. گوتی:

لەناوئێمەدا باونیە کەسێک خۆی لەکاری کەسێکی تر هەڵبقورتێنێ. تکایە خەریکی کاری خۆت بە! گوتم:

ئەوە خۆ هەڵقورتاننیە سەرەتا ئەوە کاری منەو دووەمین "چا"کەیە یان بە مانایەکی تر هاوکارییە. "چا"کەی خستە سەر سینیەکەو گوتی:

کێ داوای هاوکاری لێ کردویت؟ تکات لێ دەکەم برۆ دواوە! لە چێشتخانەکە چومەدەرەوەو ئەو خۆی سینیە چاکەی بردە هۆڵەکەوە. نەچوم بەلایەوەو خۆم بە کارەوە سەرقاڵ کرد. جارێکی تر هاتەوەو گوتم:

بۆ نیوەڕۆ دێیتەوە؟ گوتی:

من بەرنامەی ڕۆژانەی خۆم لە دەفتەری لای تەلەفۆنەکەدا دەنوسم هەرکاتێک ویستت پەیوەندیم پێوە بکەیت لەڕوی نوسراوەکەوە دەتوانیت بمدۆزیتەوە. هەردوکمان لە چێشتخانە هاتینە دەرەوە. ویستم بچمە ژورەکەمەوە کە ئەمەی لێ زیاد کرد:

من بەیانیان خۆم لەخەو هەڵدەستم و تۆ زەحمەت نەکێشیت. لەلایەکی کەشەوە نامەوێت بۆ نانکرین یان شتانێکی تر بچیتە دەرەوە، حەزناکەم ببیتە هۆی بەدواداچونی هاوسێکانمان، تۆش ئەگەر پێویستیت بە شتێک هەبوو یان بەخۆم بڵێ یان ئەوەیە لە هەمان دەفتەردا بینوسە. گوتم:

زۆرباشەو ئەو چووە نهۆمی سەرەوە. چومە ژورەوەو دەرگاکەم داخست. قینم هەستا بوو، بەخۆم گوت:

سەرەتا ئەو دەرگای قسەی ڕەقی ئاوەلا کرد، بەڵام ئەگەر وابیر دەکاتەوە کە دەتوانێت لەگەڵ منیشدا هەمان هەڵسوکەوت بکات کە لەگەڵ ئەوانی پێش مندا کردویەتی، بێگومان تەواو بە هەڵەدا چووە! ئەو بێئاگایە لەوەی کە من لەگەڵ کەسانی تردا جیاوازیم هەیە، هەرچۆنێک بێت من لەگەڵ کوڕاندا گەورە بووم و دەزانم کە دەبێت

چۆن لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو ببمەوە، لە کاتێکدا کە دەنگیم لە حەوشەکەدا بیست، لەوە ئاگادار بووم لەماڵ چۆتە دەرەوە. لەدەفتەرەکەدا نوسیبووی:

ئەگەر کەسێك تەلەفۆنی کردو کارێکی پەلەی هەبوو تا کاتژمێر نیوەڕۆ سەردانم هەیە، پەیوەندیم پێوە بکات و ئەگەر یازدە بەم ژمارە تەلەفۆنەو دوای نیوەڕۆ بەم ژمارەیە پەیامێك هەبوو بینوسم و سوپاسی کردبوو. خەیاڵم ئاسودە بوو کە بۆ نیوەڕۆ نایەتەوە، فیروسیام لێ کردو چومە قاتی سەرەوەو سەرقاڵی خاوێنکردنەوەی ژوورەکەی بووم. جلەکانیم ڕێك و پێك کردوو بە حاڵێکی نالەبارەوە ژوورەکەم ڕێك خست. بەتەنها نانم خوارد، لەناکاو هاتەوە یادم کە لەبارەی نانی ئێوارەوە شتێکی نەنوسی بوو. بێ تاقەت بووم و بۆ ئەوەی هەست بە تەنهایی نەکەم، بە دەنگی بەرز لەگەڵ خۆمدا دەدوام. نەمدەزانی چی بکەم، بیرم لەو خواردنانە دەکردەوە کە دایکم دروستی دەکردن، بەلام بەداخەوە لە شێوەی دروستکردنەکەیان شارەزا نەبووم، یان کەرەستەی پێویستیان لەو ماڵەدا گیر نەدەکەوت، مامۆستاش ڕێگای شت کڕینی لێ قەدەغە کرد بووم. باشە دەبوو چیم بکردبایە؟ بڕیارمدا داوای هاوکاری لە دایکم بکەم، بەلام هێشتا تەلەفۆنم هەڵنەگرتبوو کە زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا. ئاغای مەلەکی پەیوەندەی کردبوو دەیویست بزانێت لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا چی ڕویداوە؟ هەموو شتێکم بۆ ڕون کردەوەو لە دواجاردا ئەوەشم بۆ زیاد کرد کە ئەو گەلێك دڵ ڕەقە. پێکەنینێکی کردو گوتی:

شازادە خان تازە دوو ڕۆژە تۆ لەگەڵیدا ئاشنا بوویت و بەو خێراییە تێگەیشتیت کە مامۆستا دڵ ڕەقە؟ دەتەوێت دەست لە کارەکەت هەڵبگریت؟ گوتم:

نەخێر، بە نیازنیم دەست بەرداری کارەکەم بم. ئەو دەبێت بزانێت کە من وەك کەسانی تر نیم. پێکەنینێکی تری کردوو گوتی:

بەلام شازادە خان بەرامبەرەکەی تۆ لەڕوی جەستەوە پیاوێکی بەهێز نیە، ئەو لەگەڵ بەرامبەرەکانی تردا بە هەڵە وەرنەگریت! گوتم:

دڵنیابە، بێ ئەوەی بچمە مەیدانی بۆکسێنەوە شکستی پێ دەدەم! هێندە پێکەنی کە منیشی خستە پێکەنین و پاشان گوتی:

دەزانم سەرکەوتوودەبیت، بەڵام لە یادت نەچێت ئەگەر لەگەڵ گرفتێکدا ڕوبەڕوو بویتەوە ئاگادارم بکەیت. دەیویست ماڵئاوایی بکات کە لەناکاو بیرێك وەك بروسکە بە مێشکمدا هات و گوتم:

ئاغای مەلەکی لە ڕاستیدا پرسیارێکم هەیە، من نازانم هاوڕێ خۆشەویستەکەی ئێوە ئارەزوی چ جۆرە خواردنێك دەکات، ئەگەر دەکرێت پێمی بڵێیت. بە گاڵتەوە گوتی:

دەتەوێت کەڵك لە چەکی سك وەربگریت؟ گوتم:

لە هەر ڕێگایەکەوە پێویستبکات بۆ ئەوەی ئەم پیاوە ناحەزو لوت بەرزە بهێنمە سەر ڕێگای ڕاست، ئێستا هاوکاریم دەکەیت؟ گوتی:

من بەردەوام بۆ هاوکاری تۆ ئامادەم، تەنها کەمێك ئارام بگرە تاکو بێتەوە یادم کە ئەو زیاتر ئارەزوی لە چ جۆرە خواردنێکە. ماوەیەك بێدەنگ بوو، پاشان ناوی چەند خواردنێکی لە تەلەفۆنەکەوە پێ گوتم. لەناویاندا یەکێکیانم هەڵبژارد، چونکە هەم شێوەی دروست کردنەکەیم دەزانی و هەم دەیشمزانی ئەو کەرەستانەمان هەیە. کاتێك چێشت دروستکردنەکەم دوایی هات چوومە ژورەکەی خۆم و دەستم کرد بە خوێندنەوە. شەو کاتێك هاتەوە نەچووم بەپیرییەوە و مێزی نانخواردنم بۆ یەك نەفەر ئامادە دەکرد، هێشتا کارەکەم تەواو نەکردبوو کە لە دەنگی هاواری لە دڵەوە لەرزیم. وام بە خەیاڵدا هات کارەساتێکی بەسەر هاتووە. بە خێرایی بەرەو ژورەکەی هەنگاوم نا. کاتێك منی بینی دەستی نایە کەمەری وگوتی:

کێ بە تۆی گوتبوو ئەم ژورانە بەم شێوەیە لێ بکەیت؟ ڕوخساری لە تورەییدا سور هەڵگەڕابوو هەناسەی هەڵدەکێشا، لە سەرسوڕماندا زارم هەڵپچڕی بوو هیچ بیرم لەوە نەکردبوەوە کەخاوێن کردنەوەی ژورەکان ببێتە هۆی تورە بونی. گوتم:

چییە چی ڕویداوە؟ ژورەکەم بۆ خاوێن کردونەتەوە! بە هەمان نیگای پڕ لە قینەوە گوتی:

مەگەر ڕۆژی یەکەم بە گوێتمدا نەدا کە تەنها ژورەکانی خوارەوە پەیوەندی بە تۆوە هەیەو لە سنوری خۆت تێنەپەڕیت؟ گوتم:

تێپەڕین لە ئارادا نەبووە ئەگەر ڕێك خستن و پاككردنەوە تێپەڕینە من ئەو تاوان دەكەم. هەستم كرد دەیەوێت توانای خۆی بسەپێنێت هەر بۆیە منیش نەمبڕیەوە بەردەوامیم بە قسەدا. تۆ بەدوای بیانودا دەگەڕێیت و دەتەوێت بە هەر جۆرێك بێت بیسەپێنێت كە میری ڕەها تۆیت. من دەزانم دەسەلاّتداری ماڵ تۆیت. پێویست بە دەربڕینی ناڕەحەتی ناكات. تكا دەكەم بۆڵەو قیڕە قیڕ ببڕەوە! ئەمەم گوت و لە ژورەكە هاتمە دەرەوە. گوێم لە دەنگی بوو كە دەی گوت، خودایە ئەمە چ بونەوەرێكە! خواردنەكەم بۆ نایە سەر مێزەكەو ئەو ڕۆژنامەیەی كە لەگەڵ خۆی هێنابوی هەڵمگرت و چومەژورەكەمەوە و سەرقاڵی خوێندنەوەی بووم. هەمووم خوێندەوە هەتا ئاگاداریەكانیشی، بەلاّم وا پێ دەچوو ئارەزوی هاتنە خوارەوەی نەبێت. دوێ شەو مامۆستا تەلەفزیۆنەكەی هێنابووە خوارەوە هەڵمگرت بردمە ژورەكەی خۆم و سەرقاڵی تەماشاكردنی بووم. خواردنەكەی بە تەواوی سارد بوبویەوە، بەلاّم لێ گەڕام هەر بەو جۆرە بمێنێتەوە. بەیانیش مامۆستا بێ ئەوەی نانی بەیانی لە زار بنێت لە ماڵ چووە دەرەوە. مەلەكی گوتبووی كە پیاوێكی توندتەبیعەتە، بەلاّم نەمدەزانی تا ئەو ڕادەیە تورەیە. لە بیری چوو بوو لە دەفتەرەكەدا شتێك بنوسێت. بۆ یەكەمینجار لەوەی كە كاتی نیوەڕۆ بۆ ماڵ بگەڕێتەوە بێزار بووم و بۆئەوەی ڕوبەڕووبونەوەی تر لە نێوانماندا ڕونەدات، ماڵەكەم كلیل داو چومەوە بۆ ماڵی خۆمان. دایكم گەلێك خۆشحاڵ بوو منیش تاكو ئێوارە لای مامەوە، لە كاتی نانخواردندا دایكم پرسی:

ئایا نانت بۆ مامۆستا ئامادە كردووە؟. كتوپڕ ویستم ڕوداوی شەوی ڕابردوو بدركێنم، بەلاّم پەشیمان بومەوەو تەنها گوتم:

نانەكەی ئامادەیە. بەلاّم دەبێت گەرمی بكاتەوە. پرسیارەكانی دایكمم یەك بەیەك وەلاّم دەدایەوە، ئەو دەیویست بزانێت مامۆستا هەڵسوكەوتی چۆنە لەگەڵمدا. نەمدەویست درۆبكەم و لە هەمان كاتیشدا ئامادە نەبووم تاكو ڕاستییەكان لە بارەی ڕەوشتی مامۆستاوە بدركێنم. هەوڵمدا شتە باشەكانی باس بكەم و گوتم:

مامۆستا تفاقی چەند مانگێکی بۆ هێناوم تاکو پێویستیم بە شت کڕین نەبێت. هەروەها تەلەفزیۆنەکەی خۆی بۆ هێناومەتە خوارەوە تاکو لەکاتی بێکاریدا سەیری بکەم. پێمگوت کە مامۆستا لەبینینی پاك و خاوێنی ماڵەکە چەند خۆشحاڵ بووە و سوپاسیشی کردووم. دایکم دەیبیست، بەڵام لە ڕوخساریدا ناباوەڕییم هەست پێ دەکرد. خۆر لە ئاوابوندابوو کە لەوێ هاتمە دەرەوە ، دایکم هەندێك بابەتی خۆراکی بۆ ئامادە کردبووم تاکو لەو لایەنەوە هاوکاریم بکات. ئێستا ئیتر بۆ خواردن دروستکردن لە هیچ شتێکم کەم نەبوو، دەمتوانی هەموو ئەو خواردنانە بە ئاسانی ئامادە بکەم کە مامۆستا ئارەزووی دەکردن. کاتێك گەشتمە ماڵەوە مامۆستا هێشتا نەگەڕابویەوە. لە کاتێکدا دەمویست شتەکان بخەمە ناو فرێزەری سەلاجەکەوە دەنگی دەرگاکەم بەرگوێ کەوت، هەناسەم لەخۆم بڕی. نەمدەزانی بۆچی لەپڕدا لێی ترسام! ئارەزووم نەدەکرد لە گەڵیدا ڕوبەڕووببمەوە. چومە حەمام و پەنام بردە ئەوێ! بێ دەنگی و هێمنی ماڵەکە لەناخەوە دەی ترساندم، لەبەرئەوەی کە پەنام بۆ حەمامەکە بردبوو ڕقم لەخۆم دەبۆوە. مامۆستاش یەکەم جێگا کە لە هاتنە ژوورەوەدا سەری پێدادەکرد، حەمامەکەبوو. ئارامم گرت و هێنامە پێش چاوی خۆم کەئایا سەرقاڵی چییە، پاشان ورد ورد ئاگام لێی بوو تاکو گەشتە حەوشەکە! دەهات بەرەو چێشتخانەکە! سەرێکی دەکێشا تاکو بزانێت چی هەیە، ئێستا دەگاتە حەمامەکە، دەسکی دەرگاکە دەگرێت و دەیسووڕێنێت، ئای..خوایە..! هێندەی نەمابوو لەو خەیاڵانەی خۆمدا بێهۆش ببم و بکەومە سەر زەوی، بەڵام کاتێك دەرگاکەی نەکردەوە هەناسەیەکی ئارامم هەڵکێشا و بەخۆم گوت:

ئێستا ئەگەر کوڕان بهاتنایەو تۆیان بەم حاڵەوە بدیایە، هەرگیز لەناو خۆیاندا جێگایان نەدەکردییتەوە چ جای ئەوەی بە ناوی سەر دەستەی خۆیان هەڵتبژێرن! کاتێك سادە بەسەر هاتەکەی گەیاندە ئێرە هەستایەوە و لەگەڵ گوتنی چەندجارێك.. ببورە...ببورە...بەتەنها بەجێی هێشتم.

"٣"

قسەکانی هێندە سەرنجیان ڕاکێشابووم کە تێپەڕ بوونی کاتم هەست پێ نەدەکرد،

کاتێك گەڕایەوە زەردەخەنە بەسەر لێوەکانییەوە نەخشی بەستبوو، گوتی:

بۆم باس نەکردیت چۆنچۆنی بومە سەردەستەی کوڕان؟ بیستنی ئەم باسەش ناخۆش

نییە. گوتم:

تامەزرۆم بزانم، هەروەك مشتاقی پاشماوەی چیرۆکەکەم. بەڵام بەداخەوە دەبێت بڕۆم

ئەگەر مۆڵەت بدەیت کاتێکی کە دیاری دەکەین. گوتی:

ئەم نیوەڕۆیە میوانی منی بۆ گەڕانەوەشت مامۆستا لەگەڵت دێت. گوتم:

بەڵام... نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەمو گوتی:

من فێری شەرمکرن نەبووم، تۆش شەرم مەکەو لامان بمێنەرەوە، ئەگەر بڕۆیت وا

هەست دەکەم بەقسەکانم بێزارم کردویت. گوتم:

هەرگیز! نەك تەنها بێزار نەبووم، بەڵکو زۆریش تامەزرۆی بیستنی پاشماوەی

چیرۆکەکەم. گوتی:

باشە، کەواتە دانیشەو گوێ لە بەسەر هاتەکەم بگرە!

ویستم پێتی بڵێم کە چۆنچۆنی بومە سەردەستەی کوڕان، لەوکاتەدا لەناو کوڕاندا باوبوو کە یەکێکی چاو قایم و نەترس سەردەستەیی لە ئەستۆ دەگرت. بێگومان ئازایەتی و چاو نەترسی نیشانەیەك بوو کە هەر سەردەستەیەك دەبوو هەیبێت. ئەودەبوو لە هەموو شوێنێکدا لە کەسەکانی تر خۆی لە پێشتر نیشان بدات. بە تۆم گوتبوو کە زۆد

چاك بە فتبۆڵ یاریم دەكردو لە شوت لێداندا یەكەم بووم. لە بۆكسێن و زۆرانبازیشدا لەوانی تر لەپێش تربووم. مابوەوە ئازایەتی. كە دەبوو ئەویشم دەربخستایە. منداڵەكان زۆریان بیركردەوە لە كۆتایدا بەو ئەنجامە گەشتین كە من دەبێت شەوان بچمە سەر گۆڕستان و ئەوكتێبەی كە ئەوان لەسەر گۆڕێكیان دانابوو بیهێنمەوە. هەرئەو ڕۆژە یەكێك لە پیاوانی گەڕەك وەفاتی كردبوو، هەموو هاوسێكان بۆ ناشتنی تەرمەكەی چوبونە گۆڕستان، من و كوڕەكانیش لەو مەراسیمەدا هاوبەش بوین. منداڵەكان گۆڕی هەمان مردویان دەستنیشان كرد، گۆڕەكەی ئەو لەوپەڕی گۆڕستانەكەدا بوو، منداڵەكان وایان هەست نەدەكرد من بتوانم لەوكارەدا سەركەوتووبم، بەگاڵتە پێ كردنەوە دەیان ویست ورەم بڕوخێنن، بەلاّم من سەنگین و دامەزراو بووم. نزیكی خۆر ئاوابوون هەمووماں ڕۆشتین و كتێبەكەمان لەسەر گۆڕەكە دانا چاوەڕوانی تاریكی شەومان دەكرد، مایكل كوڕێك بوو كە لە منداڵەكانی تر زیاتر خۆشەویستی بۆم هەبوو، چەند جارێك ویستی پەشیمانم بكاتەوە. ئەو دەیگوت:

سادە تۆ كچیت، چونی كچێك بۆ گۆڕستان لە تاریكی شەودا ترسناكە. لەوانەیە سامی گۆڕەكان زمانت لە گۆبخات. وەرەو دەست لەم كارە وەرمەدە. بەلاّم من پەسەندم نەكردوو گوتم:

ڕاستە من لە ڕوكەشدا كچم، بەلاّم دڵ و بوێریم لە هیچ یەكێك لە ئێوە كەمترنیە. من دەبێت ببمە فەرماندەو ئەم كارەش دەكەم. كاتێك شەوهات هەموو چوینە پشت دەرگای گۆڕستانەكەوە و ویستمان بیكەینەوە كە بینیمان لە ناوەوە داخراوە، دیواری دەوری گۆڕستانە كە مان تاقی كردەوەو من گوتم كە دەتوانم لە دیوارەكەوە خۆم بگەیەنمە سەرەوە هەمان كاریشم كرد، من و مایكل هەردووك پێكەوە سەركەوتین، بەلاّم ئەو لەسەر دیوارەكە دانیشت، دوو سێیەك لەمناڵە ترسنۆكەكان هەڵهاتنیان هەڵبژارد. من بەتەنها ناچار بووم بەرەو گۆڕستانەكە بڕۆم. لەناو گۆڕستانەكەدا چرایەك تروسكەی دەدا، دەتوانم بڵێم هیچ نەترسام، چونكە لەپاش مردنی دایك و باوكم ترس لەولاّتی دڵمدا بارگەی خۆی پێچابوویەوەو هەڵهاتبوو. من مەرگم خۆش دەویست، چونكە دەمویست

لەپاش مەرگم دووبارە لەگەڵ ئەواندا بژیم. لەبەر ئەوەی جیهانی پاش مەرگم بەسەرەتای ژیانێکی تازە دەزانی و هەر لەبەر ئەوە تاریکی گۆڕستانەکە بەلای منەوە سامی نەبوو. دەنگی کوندەبوش نەیدەتوانی ترسم لا دروست بکات. بێ ترس و شڵەژان یەك یەك گۆڕەکانم جێدەهێشت، هەر وەك بڵێی بەڕۆژی نیوەڕۆ لەنێو باخێکی پڕ لەگوڵ و گیادا هەنگاو دەنێم. کاتێك گەیشتمە گۆڕی مەبەست، کتێبەکەم هەڵگرت و بۆ گیانی هاوسێکەمان چەند دوعایەکم خوێند و گەڕامەوە. کاتێك نزیکی دیواری گۆڕستانەکە بوومەوە کتێبەکەم لای دیوارەکە دابەیەکێك لەکوڕەکان و خۆیشم لەدیوارەکە سەرکەوتم و چووم بۆلای ئەوان. دەنگی هاواری شادی کوڕەکان ئارامیو بێدەنگیی گۆڕستانەکەی تێکدا و بووە هۆی ئەوەی کوندەبوو قیژەیەکی بڵند بکێشێ. کوڕەکان ترسان و ڕایان کرد. لەبەیانییەوە من فەرماندەیان بووم و ئەوانیش لەو کاتە بەدواوە گوێیان بۆ قسەکانم شل دەکرد، قسەم زۆر لەگەڵدا نەدەکردن و ئارەزووشم نەدەکرد گوێم لەقسەی زۆر بێت، هەموو شەڕو کێشەکانم بۆ وەرگرتنەوەی ماف کوڕانێك بوو کە زوڵمیان لێدەکرا، کاتێك لەنێوان منداڵانی دوو گەڕەکدا کێشەیەك بەرپا دەبوو تا ئاگادار دەبووو دەمویست قسەی تێدا بکەم کێشەکەیان کۆتایی پێدەهێنا و مافیان بۆ مافخوراو دەگەڕاندەوە. بۆیە ئەمەم باسکرد تاکوو بزانیت لەو شەوەوە چەندە گۆڕانم بەسەردا هاتبوو. من لەگۆڕستانی سامناك نەترسابووم، بەڵام ئەو شەوە لەمامۆستا ترسام، ترسێکی بێهوودە کە ئێستا پێکەنینم پێی دێ. عەشق گۆڕانی زۆر بەسەر مرۆڤدا دێنێ. عەشقی من ترسی تێدا دروست کردم. لەوانەیە ترسەکەی من لەمبارەوە بووبێ کە نەمدەویست مامۆستا لەدەست بدەم. پێ دەچێ لەوە ترسابم ئەگەر مامۆستا نیگای لەنیگام بدات من لەماڵەکەیدا وەدەرنێت. بەڕاستی نازانم! بەڵام دەرگای حەمامەکە نەکرایەوەو مامۆستا نەهات، ئاسوودە بووم و کەمێك دەرگاکەم کردەوەو سەیرێکی حەوشەکەم کرد، هیچ نەبوو، گڵۆپی چێشتخانەکەش کوژابوویەوە. ورد ورد چوومە هۆڵەکەوە، بەڵام لەوێش نەبوو، کەوتمە گومانەوەو بەخۆمم گوت ناشێت بەهەڵەدا چووبمو مامۆستا نەگەڕابێتەوە؟ بەناچاری چوومە نهۆمی سەرەوە، بەبینینی پێڵاوەکانی لەگەڕانەوەی دڵنیا بووم. کاتێك

هاتمە خوارەوە بەبینینی ڕۆژنامەی سەر مێزی نانخواردنەکە پێکەنینم دەهات. هەر چۆن بوو هەڵمگرت و چوومە ژوورەکەمەوە. سێ ڕۆژ بەمجۆرە تێپەڕی، ئێمە نە یەکترمان بینی و نە کارێکیشمان بەیەک هەبوو. تەنها پردی بەیەک گەیشتنمان دەفتەری یاداشتی تەنیشت تەلەفۆنەکە بوو. تا ئەوە بوو ڕۆژی چوارەم کاتێك لەکڵێسا دەگەڕامەوە مەلەکیم لەسەر شەقامەکەمان بینی، هەر لەوێدا وەستاین و پێکەوە کەوتینە گفتوگۆ. پێم گوت کە زۆری لێ تووڕە بووم و ئەویش گوتی:

مامۆستا هەموو شتێکی بۆ باس کردووم، بەو شێوەیەی کە من لێی تێگەیشتبم ئەویش خۆی بۆ ڕووبەڕووی بوونەوەی تۆ ئامادە کردووە. گوتم:

بەبۆچوونی تۆ لەم ململانێیەدا کێ براوە دەبێت؟ پێکەنی و گووتی:

من هەر لەئێستاوە گرەو دەکەم کە تۆ سەردەکەوی. گوتم:

ئەگەر بەچەکی سك سەرکەوتنم بەدەست نەهێنا لەوانەیە بتوانم بەزۆران شکستی پێ بدەم. گووتی:

بەڵام ئەوە دادپەروەرانە نییە و ئێوە هاوکێش نین. گوتم:

ئەگەر لەبەرامبەریشی دا ببەزێم، هێشتا هەر من براوەم، چونکە ئەو لەگەڵ ژنێکدا زۆرانبازی کردووەو شکستی پێ هێناوە، بەڵام بەپێچەوانەوە من بەسەر پیاوێکدا زاڵ بووم. سەرێکی ڕاوەشاندو جارێکی تر بەپێکەنینەوە گووتی:

حەق بەتۆیە، بەڵام تکات لێ دەکەم زۆر ئازاری نەدەی. هەر چۆنێك بێت ئەو هاوەڵی منەو وەك برایەکی خۆم خۆشم دەوێ. گوتم:

یانی دەترسی شانی دەربچێ. بەڵێنت پێ دەدەم کە لاوچاکانە زۆرانبازی بکەم. کەمێك چووە خەیاڵەوەو پاشان گوتی:

سادە وا هەست دەکەم تۆ سەرنجت ڕاکێشاوە، چونکە ئەگەر کەسێکی تر بوایە جگە لەتۆ تا ئێستا جوابی کردبوو، بەڵام دەستبەرداری تۆ نەبووە. گوتم:

لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە تاکوو ئێستا بەرامبەرێکی بەهێزی بۆ ململانێ گیر نەکەوتبێ. لەوانەیە ئەگەر ئەوانی تر وەک من لەبەرامبەریدا بوەستانایەتەوە، ناچار نەدەبوون واز لەکارەکەیان بهێنن و بقوچێنن. عەتا گوتی:

من وای بۆ دەچم بۆچوونی ئەو شتێکی تر بێت. ئەو تۆی ناسیوە - دەزانێ کە پێشتر فرۆکەوان بوویت، ئەو هەتا وێنەی تۆیشی لەرۆژنامەدا نیشاندام و لێی پرسیم:

چۆن هاتۆتە ئێرەو لەماڵی مندا مل بەکارەوە بنێت؟ گەلێک نیگەران بووم و پرسیم:

نە... من پیاوێکی نهێنی پارێزم!! بەس ئەوەم پێ گوت:

کە تۆ حەزت لێیە ئەزموونی ماڵداری بکەیت و لەلایەکی تریشەوە دەتەوێت بەشێوازی ژیانی هونەرمەندێک ئاشنابیت، تەنها ئەوە. پرسیم:

ئایا باوەڕی کرد؟ چەند جارێ سەری ڕاوەشاندو گوتی:

وا هەست دەکەم، بەڵام زۆریش دڵنیا نیم. هەناسەیەکی ئارامیم هەڵکێشاو گوتم:

زۆر باش بوو. چونکە قسەی هەر دووکمان تا ڕادەیەک هاوشێوە بوون. منیش بەمامۆستام گوت کە دەمەوێت ئەزموون خڕ کەمەوە، بەڵام منیش دڵنیا نیم باوەڕی بەقسەکەم کردبێت. گوتی:

بەهەر حاڵ بەو جۆرەی کە تۆ دەتەوێ لەمامۆستا تێ بگەیت وا هەست دەکەم ئەویش دەستی بەو کارە کردووە! لەمەودوا زیاتر وردبین و ئاگادار بە. گوتم:

سوپاست دەکەم بۆ ئەو زانیارییانەی کە پێتدام. گوتی:

تۆ ناچارت کردوم لەو نێوانەدا سیخوڕی بکەم! بەڵام ئەو یارییە تا کاتێک بەردەوام دەبێت کە زیان بەهیچ یەکێک لەئێوە نەگات، بەڵام ئەگەر ڕۆژێک هەست بکەم یەکێک لەئێوە زیانی پێ دەگات دەست لەم یارییە هەڵدەگرم و ڕاستی هەموو شتێک ئاشکرا دەکەم. گوتم:

لەلای منەوە خەیاڵت ئاسوودە بێت. کارێک ناکەم کە زیان بەهاوەڵە خۆشەویستەکەت بگات. لەبیرت کردووە کە من ئەوم لەگیانم زۆرتر خۆش دەوێ؟ دەستی گرتم و گوتی:

من تەنها بۆ ئەو نیگەران نیم. دەتوانم بڵێم زیاتر لەو لەبیری تۆ دام. گوتم:

نیگەران مەبە. هەر بەو شێوەیەی کە پێشتر بەڵێنم بەتۆ و خێزانەکەم داوە ئەگەر بۆ دواجار نەگەشتمە ئەنجام، وازی لێ دێنم. ئێستاش بەهەمان بەڵێنی خۆمەوە پابەندم، ئێستا بڵێ بزانم مامۆستا چی دەکا؟ گوتی:

کاتێك من چوومەماڵتان لەسەر وێنەی یەکێك لەپاڵەوانەکانی کتێبەکەی کاری دەکرد.

گوتم:

بەنیازم خواردنێك ئامادە بکەم کە جەنابتان ئارەزووتان لێیەتی. لەگەڵمدا بگەڕێرەوەو نانی ئێوارە لەگەڵ ئێمەدا بخۆ. گوتی:

با بمێنێ بۆ کاتێکی تر و لەیەك جیا بووینەوە. خواردنێك کە مامۆستا ئارەزووی دەکرد، دروستم کردو مێزەکەم ڕێکخست و پاشان تەلەفۆنم بۆ کرد. تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و گووتی:

فەرموو. گوتم:

خواردن ئامادەیەو بەخێرایی تەلەفۆنەکەم داخستەوە. ترسام بڵێ ئارەزووی خواردنم نییەو نائومێدم بکات. بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی منەوە هاتە خوارەوەو سەیرێکی مێزی نان خواردنەکەی کردو بەپەلە چوو دەستەکانی بشوات. کاتێك لەپشت مێزەکەوە دانیشت پرسی:

بەڕێکەوت ئەم خواردنەت ئامادە کردووە یان مەلەکی پێی وتی من حەزم لەم خواردنەیە. گوتم:

قسەی دووەمینتان ڕاستە، بەتامەزرۆییەوە دەستی بەخواردن کردو هەر لەو کاتەدا گووتی:

وامنەدەزانی دەگەڕێیتەوە. پرسیم:

بۆچی؟ خۆ هێشتا دەرت نەکردووم. گوتی:

ئەوانی تریش من دەرم نەدەکردن. بەڵام خۆیان ڕۆیشتن و نەگەڕانەوە. گوتم:

بەڵام من لەگەڵ ئەواندا جیاوازیم هەیە. وشەی جیاوازی دووبارە کردەوەو گوتی:

بەڵێ، تۆ ڕاست دەکەی. لەگەڵ کەسانی تردا جیاوازیت و پێدەچێت تایبەتمەندیشت لەوان زیاتر بێت. پرسیم:

بۆچی تایبەتمەندی؟ بۆچی تا ئێستا خزمەتکاری ژنت نەبینیوە؟ بزەیەکی کردو گوتی:

بۆ نا، بینیومە، بەڵام تا ئێستا فڕۆکەوانی خزمەتکارم نەبینیوە! دەیویست کاریگەری قسەکەی لەڕوخسارم دا بخوێنێتەوە، دەیویست کاردانەوەی من ببینێ، بەڵام نەیدەزانی پێش تر مەلەکی هەموو شتێکی لەبارەی ئەوەوە بۆ باس کردووم، کاتێك بەرپەرچم نەدایەوە، نائومێد بوو و گوتی:

دەتەوێ چی لەبارەی منەوە بزانیت؟ گوتم:

هیچ... چۆن چۆنی... مەگەر؟ وەڵامی نەدامەوەو دیسان پرسی:

چ هۆکارێك بۆتە هۆی ئەوەی کە وازت لەفڕین هێناوەو ئەم کارەت هەڵبژاردووە، گوتم:

پێشتر پێم گوتی تەنها دەمەوێت ئەزموون خڕ کەمەوە، ئایا کێشەیەك لەم کارەدا دەبینی؟

– کێشە؟ چیت عەرز کەم بە بۆچوونی من هەمووی گیانی کێشەیە، بەڵام پەیوەندی بە منەوە نییە، ئەوەی پەیوەندی بە منەوە هەیە، ئەوەیە کە بۆچی منت هەڵبژاردووە؟ شانم هەڵتەکاندو گوتم:

لەهەڵبژاردنی تۆدا مەبەستێکی تایبەتیم نەبووە، من دەمویست لەماڵێکدا کار بکەم و مەلەکیش تۆی دەست نیشانکرد، لەوانەیە مەلەکی بۆ بەرگرتن لەڕووداوی نالەبار ئێوەی لەبەر چاو گرتبێ، چونکە هەستی دەکرد جەنابت مرۆڤێکی پاك و بەڕەوشتیت و بۆ من نابیتە مایەی نیگەرانی و ئازار. ئایا ئەم تایبەتمەندییانە بۆ هەڵبژاردنی تۆ بەس نییە؟ ئێستا پێمبڵێ ئایا لەبارەی کارەکەمەوە لێم ناڕازیت کە دەتەوێت قسەم لێ دەربهێنی و بەهانەت چنگ بکەوێت؟ گوتی:

من بەهانەگر نیم و لەکارکردنیشت ڕازیم. مەلەکی بەتۆی گوتبوو کە من پیاوێکی توڕەوتۆسنم و حەزم لێ نییە کەسێك لەکاروباری تایبەتیم دەست وەربدات. ڕۆژی یەکەم

گوتم نهۆمی خوارەوە تایبەتە بە تۆ و کارێکت بەنهۆمی سەرەوە نییەو تۆش پەسندت کرد، بەڵام بەداخەوە لەسەر قسەی خۆت پابەند نەبویت. دەزانم کە ژوورەکەم شپرزە و نارێکە، بەڵام بەو جۆرە ئاسوودەترم، چونکە ئارەزووم لەهەر شتێك بێت، بەخێرایی دێتە بەر دەستم. من خووم پێوە گرتووە. وا هەست دەکەیت حەزم لە رێکوپێکی و پاك و خاوێنی نییە. نە... زۆریشم حەز لێیە، بەڵام لەژوورەکانی سەرەوە نە! لەکاتی پاك کردنەوەیدا ئاگادارتان دەکەم، بەڵام بەڵێنم پێ بدە تا ئەو رۆژەی بڕیاری لەسەر دەدەم کارێکت بەنهۆمی سەرەوە نەبێت. گوتم:

زۆر باشە، بەڵام چەند باش بوو ئەو رۆژەش بەم شێوەیە قسەمان بکردایە. هەم ئاگاداری هەڵەکەم دەبووم و هەم بەڕێزیشت تورە نەدەبوویت. دەستی لەخواردن هەڵگرت و بەفێڵبازییەوە گوتی:

ئەو کاتە ئەزموونت وەرنەدەگرت. پرسیم:

ئەمشەو رۆژنامەت کڕیوە؟ بەبێ ئەوەی وەڵامم بداتەوە رۆشت و رۆژنامەکەی هێنایە خوارەوەو گوتی:

لاپەڕەی ڕووداوەکان بخوێنەرەوە، پێکەوە مێزەکەمان پاك کردەوە و ئەو خۆی بەتەماشاکردنی تەلەفزیۆنەکەوە خەریککرد. منیش لاپەڕەی ڕووداوەکانم کردەوەو سەرقاڵی خوێندنەوەی بووم، چەند هەواڵێکیان لەبارەی پێکدادانی ئۆتۆمبیلەوەبوولەشەقامەکانداو هەواڵی دوایش پەیوەست بوو بە خۆکوشتنی کچ و کوڕێکی لاو کە بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتی مادی و دەرکردنیان لەلایەن خێزانەکانیانەوە دەستیان بۆ ئەم کارە بردبوو، کاتێك مەبەستەکەم خوێندەوە سەیرێکی مامۆستام کردو بینیم ئەویش بەوردی لێم ڕاماوە. پرسی:

خوێندتەوە؟ گوتم:

مەبەستتان خۆکوشتنی کچ و کوڕە عاشقەکەیە؟ گوتی:

بەڵێ، حەز دەکەم بۆچوونی تۆش لەو بارەیەوە بزانم، هەست دەکەی تاوانبار لەو نێوەندەدا کێیە؟ ئایا کرداری ئەو دوو لاوە پەسند دەکەیت؟ گوتم:

بەتەنها هەواڵێکی کورت ناگرێ دادوەری بکەین و تاوانباری ڕاستەقینە بناسێنین.

لەوانەیە هەموو کەسێك و لەوانەشە هیچ کەس. پرسی:

مەبەستتان لەهەموو کەسێك و هیچ کەس چییە؟ گوتم:

هەموو، لەبەر ئەوەی هەر یەکەمان بەجۆرێك لە جۆرەکان لەچارەنووسی یەکتریدا کاریگەریمان هەیە، جا چ بە چاك بێت یان خراپ. پەیمانە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگایەك بۆ تێکڕای خەڵك لە بەرچاو دەگیرێت و دیسان تێکڕای خەڵکیش لەژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا پەیڕەوی یاسازانەکانی کۆمەڵگان. پێشێلکردنی پەیمانێك لەلایەن گرووپێکەوە دەبێتەوە هۆی لێکهەڵوەشاندن و پاشاگەردانی، بەجۆرێك لەسەر ژیانی کەسانی دیکە کاریگەری دادەنێت. لەو بڕوایەدام یاساکانی ئێمە بۆ بەرژەوەندی کەمینەیەکی تایبەت لەخەڵکی دارێژراوەو بەرژەوەندی زۆرینەی لەبەر چاو نەگرتووەو هەر ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لەنێوان چینەکاندا. ئەو کەمینەیەش کە یاسا پشتیوانی لێدەکات بەمافی خۆیانی دەزانن ڕۆژ بەڕۆژ سامانەکەیان فراوان تر بکەن و هەوڵ و تێکۆشانی کەسانی دیکە بەئاسانی زەوت بکەن و زۆربەی خەڵکی تووشی هەژاری بکەن، هەژارییەکی نەخوازراو! لەدەرئەنجامەکەیدا ناعەدالەتی و نایەکسانی هاتۆتە ئاراوە، بەڵام بۆچی گوتمان هیچ کەسێك، چونکە لەم سەردەم و هەل و مەرجە هەنووکەییەدا بەو یاسایانەی کە ئێستا لەناو کۆمەڵگادا زاڵن، هەموو کەسێك ناچار دەبێت تەنها بیر لەخۆی بکاتەوەو بێ ئاگا بێت لە کەسانی دیکە. هەر ئەمەش دەبێتە هۆی بێتاوانی هەمووان. خێرخوازی و مرۆڤدۆستی خەریکە وەك ئەفسانەی لێ دێت. ئێوە وادەزانن ئەگەر ئەو دوو لاوە لەلایەن ڕێکخراوو کەسانێکەوە پشتگیریان لێ بکرایە، دیسانیش خۆکوژیان دەکرد؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر؟! بەڵام هەژاری لەشوێنێکدا کە هەندێك لە تێریدا خەریکن لێك ببنەوە، شتێکی زۆر ناشیرین و زاڵمانەیە. هەندێك بۆ پاك کردنەوەی ئەنگیی هەژاری دەبنە پەیڕەوی کەمینە و دەیانەوێ ڕێگەی سەدان ساڵ لەشەو و ڕۆژێکدا بڕبن. لەکاتێکدا ناتوانن خۆیان و ژیانیشیان بەلاڕێدا بەرن. بەڵام ئەگەر بتەوێت بە بێگەردی بمێنیتەوەو بەبێگەردیش بژیت، دەبێت بەدەستکەوتەکانت ڕازی بیت و لەو بڕوایەدا بیت

کە لەپاش هەر دژوارییەك ئاسایش و ئارامی بەدەست دێنیت. ئەگەر من لەجیاتی ئەو دوانە بوومایە، چاوەڕوانی هیچ کەسێکم نەدەکردو خۆم لەسەرەتاوە دەستم پێدەکردەوە و هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێش دەچووم. لەم کارەشمدا تەنها پشتم بەخواوەند دەبەست و هەرگیز بێ ئومێد نەدەبووم. بەو هیوایە ڕۆژێك یاسایەك لەبەرژەوەندی خەڵکی بێ بەش و چەوساوە دابڕێژێت.مامۆستاگوتی:

ئینجا بەم بیروڕایەی خۆتان، لەسفرەوە دەستتان پێکرد؟ گوتم:

شتێك لەو بابەتە. زەردەخەنەیەکی کردو بەردەوام بوو:

بەڵام مەلەکی بۆی باس کردووم کە ئێوە تاقانە منداڵی خێزانی خۆتانن و وەزعی مادی باوکیشتان خراپ نییە. گوتم:

ئەوەی کە باوکم و کەسانی تر هەیانە، پەیوەندی بەمنەوە نییەو من دەبێ هەوڵ بدەم تاکوو شتێك بۆ خۆم بەدەست بێنم.

ـ ئەم قسەیە ڕاستە، بەڵام سەرم سووڕ دەمێنێ چونکە دەتتوانی لەکاری فرۆکەوانیدا زۆرتر بەهرەمەند بیت لەکاتێکدا کە ئەم کارە هیچ بەرهەمێکی نییەو لەلایەکی تریشەوە ئەم کارە پێچەوانەی فرۆکەوانییە، نەپێشکەوتنی هەیە و نە ڕێزلێنان. گوتم:

بۆچی باوەڕ بەم خاڵە ناکەیت؟ ئێوە ئێستا نووسەرن لەکاتێکدا کە پێشتر بریکار بوویت، چ شتێك بووە هۆی ئەوەی واز لەو کارەت بهێنی و قەڵەم بەدەستەوە بگری؟ کە لەبریکاریدا زۆرترین پارەت دەست دەکەوت. پرسی:

مەلەکی بەتۆی گوت کە من پێشتر بریکار بووم؟ بەسەر قسەکەیم سەلماند. گوتی:

چ شتێکی تری لەبارەی منەوە پێ گوتوویت؟ هەستام میوە بهێنم لەو کاتەدا کە لەمۆڵەکە دوور دەکەوتمەوە، بەپێکەنینەوە گوتم:

هەموو شتێك. ئەو شتەی کە پێویست بوو بیزانم، بەرەو لام هات و گووتی:

پێویستی نەدەکرد پرسیار لەو بکەیت، پرسیارت لەخۆم بکردایە بەدڵنیاییەوە وەڵامی ڕاستت وەردەگرت. گوتم:

وەڵامی پرسیارەکانم لەبارەی ناسینی تۆوە لەپێشدا وەرگرتوە. پرسی:

ئێستا چی؟ ئایا پرسیارێکی تر نەماوە کە بتەوێ وەڵامەکەی ببیسی؟ گوتم:

نەخێر. هەر بەو شێوەی کە گوتم هەموو شتێك لەبارەی تۆوە دەزانم. گوتی:

بەڵام من هیچ لەبارەی تۆوە نازانم، ئەو زانیارییەی کە مەلەکی پێی گوتووم ناتەواوە و جگە لەوەش وا هەست دەکەم شتێك لە ئارادایەو لەمن شاراوەیە! هیوادارم خۆت ئەوە تەواو بکەیت. پرسیم:

دەتەوێت چی لەبارەی منەوە بزانیت. گوتی:

هەموو شتێك، وای بۆ دەچم ئەگەر تۆ بناسم و بەڕۆحت ئاشنا بم کەمتر ڕووبەڕووبوونەوە لەنێوانماندا ڕوو دەدات، ئایا تۆش لەگەڵ ڕایەکەی مندا نیت؟ گوتم:

بۆچی نا، بەتایبەتی کە دەمەوێت ئێرە یەکەمین و دواهەمین ماڵێك بێت کە کاری تێدا بکەم، باسەکەی گۆڕی و گوتی:

ئەگەر شتێکت پێویست بوو پێمبڵێ تا بیکرم، من نایەمە نێو ئەم چەشنە باسانەوە. گوتم:

لەڕاستیدا هیچ شتێکمان کەم نییە، بەڵام ئەگەر شتێکم ویست ئاگادارتان دەکەم.

دەرگای هۆڵەکەی داخست و لەکاتێکدا کە دەستەکانی لێك دەخشاند گوتی:

هەوا زۆر ساردە، هەست دەکەم دەبێت زۆپاکان داگیرسێنین. گوتم:

خەڵکی دەمێکە زۆپایان ئێش پێکردوە، بەڵام من مۆڵەتی ئەم کارەم نەبوو، ڕووی گرژ کردو گوتی:

مۆڵەتی چی؟ وا هەست دەکەی من پیاوێکی ڕەزیل و چرووکم؟ گوتم:

بیرم لە ڕەزیلی تۆ نەکردۆتەوە، بەڵکوو لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئەگەر سەرماتان بوو خۆتان دەڵێن زۆپاکان داگیرسێنن. ئێستا کە دەتەوێت بەیانی ئەو کارە دەکەم. پرسی:

بۆچی بەیانی؟ هەر ئێستا ئەو کارە دەکەین. چووە ناو ژوورێکەوە کە وەك ئەنبارێك وا بوو و لەوێدا دوو زۆپای هێنایە دەرەوەو خەریکی پاك کردنەوەیان بوو. یارمەتیمدا. کاتێك دامانگیرساند، یەکیانی بردە ژوورەکەی من و ئەوی تریشیانی لە هۆڵەکەدا دانا، گوتم:

ژوورەکەی تۆ چی؟ ئەوێش ساردە، بزەیەکی کرد و گوتی:

ژوورەکەی من بچووکە، کاتی نوستن ئەم یەکەیان دەبەم و ژوورەکە زوو گەرم دەبێت، پرسیم:

ئارەزووی میوە دەکەن یان چاتان بۆ بهێنم. گوتی:

هەردووکیان، بەڵام لەپێشدا چا دەخۆمەوە. کێشە نییە ئەگەر کترییەکە بهێنمە ئێرە، چاکە تا دەگاتە ئێرە سارد دەبێتەوە. گوتم:

ماڵی خۆتانەو لەبیرت چووە تۆگەورەی ماڵیت؟ سیمای گۆڕاو سەیرێکی کردم و گوتی:

نە من ئاغام و نە تۆش ڕەعیەت. تکا دەکەم تیری زمان مەهاوێژە. من ماڵەکەم بەش کردووەو ئەم نهۆمە تایبەتە بە تۆ. پرسیارم لێ کردیت، چونکە نەمویست بە بێ مۆڵەت بێمە هەرێمی تۆوە. گوتم:

ئێستا کە وای لێهات لێگەڕێ خۆم کترییەکە بهێنم و تۆ وەک میوانێك دانیشە تاکوو میوانداریت لێ بکەم. گوتی بەچاوان و لەسەر قەنەفەکە دانیشت و پاڵی دایەوە، کترییەکەم نایە سەر مێزی نان خواردنەکەو دام لە کارەبا، پاشان سینی و پیاڵەکانم هێنا، کاتێك پیاڵە چایەکم نایە بەردەمی بە گوتنی سوپاس کابانی من پیاڵەکەی هەلگرت، پێکەنیم و گوتم:

لەکەیەوە بوومەتە کابان؟ گوتی:

هەر لەو جێگایەدا کە عەتا بەشازادە خانم بانگی دەکردیت. گوتم:

تۆ ئەمەت لەکوێوە زانی، لەکاتێکدا من و ئەوبە تەنهابووینو تۆ لەوێدا نەبوویت. پێکەنی و گوتی:

بەبێ ئامادەبوونتان عەتا تۆ بەشازادە خانم ناو دەبات. ئەو هێندەی تۆ خۆش دەوێت کە کاتێك ناوی تۆی بەزباندا دێت، روخساری لەخۆشیاندا سوور هەڵدەگەڕێت. گوتم:

کاك عەتا یەکێکە لەدۆستە بەڕێزەکانی بنەماڵەی ئێمە. هێندە ئەومان خۆش دەوێت کاتێك سەردانمان دەکات لەیادمان دەچێت کە لەیەك تیرە و ئایین نین. ئەو لە ڕاستیدا بەیەکێك لەئەندامانی خێزانی ئێمە دێتە ئەژماردن! بەتایبەتی عەتام بەشێوەیەك

دەناساند کە مامۆستا وا هەست نەکات لەنێوانی من و مەلەکی عەشقێك بوونی هەیە، قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

ئەمشەو لەو شەوانەیە کە ئارەزووی کارکردنم نییە. تەنها حەز دەکەم لەگەڵ کەسێکدا قسە بکەم. ڕوونتر بڵێم زیاتر حەز دەکەم گوێ بگرم. کاتێك لە چێشتخانە دابووین بەڵێنت پێ دام کە لەبارەی خۆتانەوە بدوێن. ئێستا دەست پێ بکە، چونکە هەموو گیانم گوێیە. گوتم:

ئەگەر بمەوێت لەبارەی خۆمەوە بدوێم لەوانەیە چەند کاتژمێرێك درێژە بکێشێت و ببێتە هۆی ماندووبونتان... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

ماندوو نابم، لەمە زیاتر با چاوەڕێ نەبم و دەست پێ بکە و منیش دەستم بەقسان کرد. لەهەموو ئەو ماوەیەدا کە قسەم بۆ دەکرد یەکجار چیە قسەی پێ نەبڕیم. کاتێك قسەکانم تەواو بوو شەوگار نیوە ببوو، هەموو لایەنێکی ژیانم باسکردبوو جگە لەوەی کە پەیوەندی بەوەوە هەبوو. وەك دەروونناسێك کە گوێ بۆ قسەی نەخۆشەکانی شل بکات، ورد دەبۆوە. کاتێك قسەکانم کۆتاییان هات، گوتی:

لەبارەی دایك و باوکتەوە زۆر نیگەرانم، تۆ دەورانێکی سەختت بەڕێ کردووە، بەڵام خۆشحاڵم کە سەلامەتی خۆت بەدەست هێناوەتەوەو توانیوتە لەگەڵ ڕاستیدا ڕووبەڕوو ببنەوەو خۆتانی لەگەڵ بگونجێنن. لەکاتی هەستانەوەمدا، گوتم:

بەڵێ، بەسەرچووەکان چوون و دەبێت بیر لە ژیانی داهاتوو بکەمەوە. کاتێك چومە سەر نوێنەکەم خۆشحاڵ بووم و هەستم بەئاسوودەیی دەکرد. بەخۆمم گوت:

ئێستا ئەو هەموو شتێك لەبارەی منەوە دەزانێت. خەوی ئەو شەوەم پڕ بوو لە خەونگەلێکی شیرین.

"٤"

ڕۆژی دواتر کاتی نیوەڕۆ گەڕایەوە ماڵ و پرسی:

پەیامێکم بۆ نەهاتووە؟ گوتم:

نەخێر، ئەگەر کەسێکیش تەلەفۆنی کردبێت من لەماڵ نەبووم تاکوو وەڵامی بدەمەوە.

هەندێك کتێبی بەدەستەوە بوو خستیە سەر مێزەکەو گوتی:

بۆ کوێ چووبوویت؟ پێکەنینێکم کردو گوتم:

چووبووم بۆ ماڵی هاوسێکەمان. پشتی لەمنەوە بوو بەخێرایی بەرەو ڕووم وەرسوڕایەوەو بەتوندی گوتی:

چیت دەکرد؟ ئایا باش گوێم لێ بوو؟ گوتم:

ژنە هاوسێکەمان هات و خولقی کردم کە پێکەوە پیاڵە چایەك بخۆین و منیش پەسندم کرد. نەدەبوو بڕۆم؟ بەهەمان توڕەییەوە گوتی:

بەدڵنیاییەوە دەبووڕازی نەبوویتایە. تۆماڤ ئەوەت نییە نهێنییەکانی ماڵی من بۆ کەسانی تر ئاشکرا بکەیت. گوتم:

کام نهێنی؟ مەگەر شتێك ڕووی داوە؟ کە من ئاگام لێی نییە؟ کورسیەکەی هێنایە پێشەوەو لەسەری دانیشت و گوتی:

هەر ئەوەی کە تۆ لەماڵی من دایت خۆی بۆ خۆی باسێکە. ئایا ئەو خانمەی دراوسێمان بەتەواوی بەدوای ئەوەدا نەدەچوو کە بزانێت تۆ لەماڵی مندا چی دەکەیت و چ خزمایەتییەکت لەگەڵ مندا هەیە؟ گفتوگۆکانی ئەو ڕۆژەم هێنایەوە یادم و گوتم:

خانمی دراوسێمان دەزانێ من کار بۆ تۆ دەکەم و هەروەهاش دەزانێت کە ئێمە دۆستی دێرینی یەکترین. بەشێوازێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی:

زۆر باشە، چی تر بزانێت؟ بێگومان ئەوەشت پێ گوتوە کە ئەم کارەت بۆ بەدەستهێنانی ئەزموون هەڵبژاردوەو هەروەها لەبێنەو بەرەکانی ئێمەش ئاگادار بووە، وا نییە؟ گوتم:

وای دابنێ وەهایە چ شتێکی تێدایە؟ بەتوڕەییەوە قیڕاندی:

خانمی خۆشەویست گەلێکیش کێشەیە. من حەز ناکەم هاوسێکانم لەمەڕ ژیانمەوە بەدواداچوون بکەن. ئەگەر ناتوانیت لەنێوماڵدا ئۆقرە بگریت پێم بڵێ تاکوو سەرگەرمییەکی نوێت بۆ فەراهەم بکەم، بەڵام ڕێگەت پێ نادەم پێی هاوسێکان بەرەو ئەم ماڵە بکەیتەوە، تێگەیشتیت؟ گوتم:

زۆر باشە ئەوە تووڕە بوونی ناوێت.گوتی:

دەترسم. ترس نەك لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ هاوسێکاندا هاودەمی دەکەی، بەڵکو دەترسم لەوەی ... قسەکەی بەناتەواوی کرد. گوتم:

بۆچی قسەکەتان تەواو ناکەن؟ گوتی:

نەیڵێم باشترە، بەڵام بەڵێن بدە کە جارێکی تر دووبارەی نەکەیتەوە. ئەگەر تەنهایی بێ تاقەتی کردیت، ویستت بچیتە دەرەوە بچۆ بۆ ماڵی باوکت، بچۆرە پارك یان شت بکڕە، گوتم:

بەڵام ئێوە شت کڕینتان لێ قەدەغە کردووم. گوتی:

شت بکڕە بەڵام نەك لەگەڕەکی خۆمان! شت بۆخۆت بکڕە ئەگەر پێویستیت بەپارە هەیە پێم بڵێ تاکوو بیخەمە خزمەتتان. گوتم:

پێویستیم پێی نییە سوپاست دەکەم، دەستی بەسکییەوە گرت و توند گوشی. پرسیم:

گەدەتان ژان دەکات؟ گوتی:

بەڵێ، هەر کاتێك تووڕەبم، برسێتیش ئازارەکەی زیاتر دەکات. گوتم:

تاكوو جلەكانت دەگۆڕی خواردن ئامادە دەبێت، نیگەرانی سەلامەتی ئەو بووم و نەمدەزانی بۆ سەلامەتیەكەی دەبێ چ كارێك بكەم. تاكوو ئەو ڕۆژە نەمبینیبوو كەڵك لە داودەرمان وەربگرێت، باوەڕەم بەخۆم هێنا كەشتێكی گرنگ نییەو برسێتیەكە بۆتە هۆی ئەو ئازارە، بەڵام دەبێت لێی بكۆڵمەوە بزانم پێشتر ئەم نەخۆشییەی هەبووە تاكوو بۆ چاكبوونەوەی چارەیەك بدۆزمەوە؟. كاتێك خەریكی نان خواردن بوو پرسیم:

یەكەمجارە گەدەتان ژان دەكات؟

ـ نەخێر نزیكەی یەك ساڵە، پزیشكەكان بڕوایان وایە كە نابێت بەهیچ جۆرێك تووڕە بم، بەڵام بەدەستی خۆم نییە. گوتم:

تۆ دەبێت پارێز لەخواردندا بكەیت. لەهەر جۆرە خواردنێك كە بۆت خراپە. گوتی:

دەزانم بەڵام لەو حاڵەتەدا كە تێی دام ناچارم. گوتم:

بەڵام چیتر ناچار نیت، من هەر ڕۆژی یەكەم پێم گوتیت ئامادەم خواردنتان بۆ ئامادە بكەم، بەڵام خۆت ڕازی نەبوویت، دان بەوەدا دەنێم كە لەمبارەیەوە ئەزموونم نییە، بەڵام هەر چۆن بێت لەنانی دەرەوە باشترە. گوتی:

لەبەر ئەوە ڕازی نەبووم، چونكە حەزم نەدەكرد ئەركتان زیاتر بكەم. ددانیش بەوە دادەنێم كە گەلێك دەستڕەنگینی و هەر لەبەر ئەوەشە دەبینی دێمەوە ماڵ و لەڕێگادا لەگەڵ خۆمدا دەدوێم كە ئەمڕۆ چ خواردنێكی ئامادە كردووە، پێكەنینێكم كرد و گوتم:

ئایا هەر لەبەر دەست ڕەنگینیەكەی من بوو سكت هاتە ژان؟

ـ نەفس شكێنی نەكەیت ئەم نەخۆشییە یەك ساڵە یەخەی پێ گرتووم، بەم كتوپڕییە چاك نابم. لەمەبەستەكەی حاڵی بووم، بەڵام هیچم نەگوت. لەكاتی دەمەوئێوارەدا دوو تابلۆی نەقاشی نیشان دام و بۆچوونمی لەبارەیانەوە پرسی. بۆچوونی خۆم بۆ ڕوون كردەوەو ئەویش پەسندی كرد. تابلۆكانی لەلایەكەوە داناو گوتی:

دوێ شەو لەنێوان قسەكانتدا گوتت كە یاریچی بوویت، ڕاستت گوت یان شتێكی كە؟ گوتم:

تاقیم كەرەوە.

ـ چۆن چۆنی؟

ـ چاك... بەتۆپ.

ـ بەڵام تۆپمان لەماڵدا نییە.

ـ لای وردەواڵە فرۆشەکەی سەر کۆڵانەکەماندا هەیە، تاکوو من قاپەکان دەشۆم بۆ بیکڕە، بەخێرایی پەسندی کردو لەماڵ چووە دەرەوە. لەوکاتەدا هیچ بیرێکم نەبوو جگە لەوەی پێی بسەلمێنم تا چ ڕادەیەك لەیاری تۆپێندا لێزان و چالاکم. تراکسوودم لەبەر کردو دانیشتم و چاوەڕوانی بووم. تۆپێکی لاستیکی بچووك بوو. گوتم:

بۆ ئەوەی نەچێتە ماڵی دراوسێکانەوە کەمێك هەواکەی کەم کەرەوە. تۆپەکەی بۆ هەڵدام و گوتی:

خۆت ئەو زەحمەتە بکێشە. دەرزییەکم کرد بە تۆپەکەداو کاتێك هەواکەی کەم بووە و دەرزییەکەم لەهەمان کوندا بەجێ هێشت و گوتم:

ئامادەیە، باشە دەتەوێ چۆن چۆنی دەست پێ بکەم. گوتی:

مەهێڵە بکەوێتە سەر زەوی، دەستم بەیاری کرد و ئەو یەکە یەکە دەیژمارد. سەیرم دەکرد بەتاسەوە ئامادەیە، ئەو باوەڕی نەدەکرد بتوانم لەچەند دانەیەك زیاتر بەردەوام بم. کاتێك ماندوو بووم تۆپەکەم بۆ هەڵدا و گوتم:

تۆ دەست پێ بکە، پێکەنی و بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

من؟ گوتم:

بەڵێ تۆ.

ـ بەڵام من چەند ساڵێکە قاچم بەر تۆپ نەکەوتووە. گوتم:

تاقی بکەرەوە زیانی نییە. قەبووڵی کردو دەستی کرد بەیاریکردن، بەڵام نەیتوانی لەسێ دانە زیاتری لێ بداو بەشەرمێکەوە گوتی:

من گوتم توانام نییە. دڵم نەهات هەستی بریندار بکەم. گوتم:

هیچ نییە، بەتەمرین چالاکی رابردووت بۆ دەگەڕێتەوە. ئێستا وەرە شووت لێ بدەین. یارییەکە هێندە گەرم ببوو کە ئاگامان لەتێپەڕبوونی کات نەبوو، ڕۆژ لەئاوابووندا بوو کە

هەردووکمان ماندوو ببووین بەهەناسەبڕکێ پێکەوە لەسەر قادرمەی حەوشەکە دانیشتین، ئارەقم کردبوو قژم هاتبۆوە دەرەوە، کۆم کردەوە تا فێنکم بێتەوە. نیگایەکی تێ بڕیم و وتی:

تۆ زۆر لە قەرەجەکان دەچیت. گوتم:

هۆی ئەوەیە من دووڕەگم. پێکەنی و گوتی:

خانمی دووڕەگ ئاگات لەخۆت بێت سەرمات نەبێت، چونکە من هیچ لەزانستی پزیشکی نازانم. گوتم:

دڵنیابە من نەخۆش ناکەوم. بەلوعەکەی کردەوەو دەست و دەموچاوی شت و گوتی:

هێندە ماندووبووم کە هەست بە برسێتی دەکەم. ئەگەر گەنج بوومایە لەوانەیە بەم ڕادەیە ماندوو نەبوایەم. گوتم:

هێشتا گەنجی، بەڵام ماسولکەکانی تۆ لەسەر وەرزش ڕانەهاتوون، ئێمە دەبوو پێش یارییەکە خاومان بکردنایەتەووە. لەبەیانییەوە سەرەتا خاوی دەکەینەوە و پاشان دەست بەوەرزش دەکەین. پێکەنی و گوتی:

وا هەست دەکەم تۆ دەتەوێت بمکەیتە وەرزشکار. گوتم:

عەیبی چییە! زۆرێك لەنەخۆشیەکان بەوەرزش چاك دەبنەوە. بەلەقاندنی سەری قسەکەمی پەسند کرد. دەمویست بۆ ئامادەکردنی نانی ئێوارە بچمە چێشتخانەکەوە، لەناکاو زەنگی دەرگاکە لێدرا. مامۆستا چوو بۆ کردنەوەی، پاش چەند خولەکێك گەڕایەوە، بەڵام ئیتر ئەو مامۆستایەی چەند خولەکێك لەمەوپێش نەبوو، توڕە دەهاتە بەرچاو. پرسیم:

کێ بوو؟ بەتوڕەییەکی ئاشکراوە گوتی:

خانمی هاوسێمان بوو. کاری بەتۆ هەبوو، بەڵام من پێم گوت لەماڵ نیت و ئەویش ڕۆیشت، ئێستا هاتیتە سەر قسەکەم؟ تۆ بوویتە هۆی ئەوەی ئارامی ماڵەکە بشێوێنیت. گوتم:

لەوانەیە ئەو ئافرەتە کارێکی گرنگی بووبێت، دەبێت مۆڵەت بدەیت بیبینم. هاواری کرد:

بەچ زمانێك مەبەستمت تێ بگەیەنم؟ من حەز ناکەم کەسێك دەست بخاتە ژیانمەوە. ئەگەر تۆ بۆ دیداری بچیت بانگهێشتی دەکەیت بۆ ماڵەوەو پاشان ئەم کارە چەند بارە دەبێتەوە. گوتم:

حەزت لەهاودەمی هاوسێکان نییە، یان هەر ئارەزووی هاودەمی ناکەیت؟ گوتی:

من هاوەڵەکانم خۆم هەڵیدەبژێرم، بەڵام حەزم لەهاودەمی هاوسێکان نییە، تێگەیشتیت؟ ئەوەی گوت و چوە سەرەوە. لەخانمی دراوسێمان کە ببووە هۆی ئەوەی مامۆستا تورە بکات و بۆڵەبۆڵ لەنێوانماندا ڕوو بدات، ڕەنجام، هەرچەند ئەو بێچارەیە نەیئەزانی بەو کارەی چ کێشەیەکی ناوەتەوە. ڕووداوێکی سادەو ساکاری لەوجۆرە شایانی نیگەرانی نییە، بەڵام بچووکترین کردارو دڵگەرانیی مامۆستا لەلای من بەهای تایبەتی خۆی هەبوو. من عاشقێك بووم کە دەمویست لەنهێنیەکانی رۆحی خۆشەویستەکەم ئاگادار بم. کاتێك شەو هات و چوومە جێگاکەمەوە، بیرەوەرییەکانی رۆژانەم تاوتوێ دەکردو ئەوانەم وەك یادەوەرییەکی شیرین لەمێشکمدا دەپاراست. لەخەونەکانمدا بوونێکی بەدەستهاتوو بوو، هەستم دەکرد لەبەدەستهێنانی ئارەزووەکانمدا زیاتر لەچەند هەنگاوێك دوور نیم، بەڵام کاتێك ئەو بەرامبەرم دادەنیشت دەمبینی کە بەدەستهێنانی ئەو کارێکی هێندەش ئاسان نییەو مەودای نێوانمان دوور دەهاتە پێشچاو. بێئاگا دڵەڕاوکێم دادەمرکایەوەو هەروەك دوو بوونەوەرێ کە ساڵەها پێکەوە ژیابن و لێك وەڕەز بووبن، رۆژانمان تێدەپەڕاندو تاکوو شەو دادەهات لەبیرم دەچوو کە ئەو تاکە بوونەوەرێکە کە لەپاش خودا دەمپەرست. کاتێك لەماڵدا بوو هەستم بەهیچ نیگەرانیەك نەدەکردو کاتژمێری رۆژانەی ئێمەش وەك هەموو خێزانێکی ئاسایی تاکوو شەو تێپەڕ دەبوو. بەڵام...وای...، کاتێك لەماڵ نەدەبووبەیەکجاری پەرێشان دەبووم‌و وام هەستدەکرد شتێکم ونکردووە، هێندە نیگەران دەبووم‌و پەژارە دایدەگرتم کە بەبێ هۆ دەگریام. مامۆستا جار جار لەبیری دەچوو لە دەفتەرەکەدایاداشت بنوسێت کە

ئایا دێتەوە بۆماڵ یان نە، ئەو بێئاگایی‌و چاوەڕوانییە زیاتر ئازاری دەدام، نازانم چۆن دەری ببڕم کە چەندە ئازارم دەکێشا. دوورکەوتنەوەی لەهەموو شتێك زیاتر ئازاری دەدام، زۆرجار بەخۆم دەگوت، بۆچی کاتێك لەلاتایە نرخی نازانی‌و کاتێکیش جێتدەهێڵێت ناتوانیت لە دووری ئارامبگریت؟ بەڵام بۆخۆشم وەڵامێکم بۆ ئەو پرسیارە پێ نەبوو. ماوەیەك بەسەر مشتومڕی ئەو شەوەدا تێپەڕیبوو من کە سەردانی خانمی دراسێمانم تەرك کردبوو، خۆم بە کاری دەستییەوە سەرقاڵ کرد. دایکم ژنێکی هونەرمەند و بەسەلیقە بوو کە لەکاری چنین و دروومانیدا شارەزایی تەواوی هەبوو لەو ڕێگایەوە بەرهەمێکی باشی بەدەست هێنابوو. من بە شێوەی کارەکەی ئاشنا بووم، بەڵام هەر بەو جۆرەی کە لەپێشدا گوتم هیچ کاتێك ئارەزووم لەکاری ژنانە نەبوو، بەڵام کاتێك پەیوەندیم لەگەڵ هاوسێکەمان بەربەست کرا، هەوڵمدا هونەری دایکم تاقی بکەمەوەو خۆم خەریك بکەم. یەکەمین تابلۆی پوولەکەدوورینم لەکۆتایی زستاندا تەواو بوو و لەلایەن دایکمەوە پەسند کرا. باوکم بۆ هەڵنانی من پێشوازی لەم کارەم کرد. ئەو بەپارەی خۆی لەچوارچێوەی گرت. وەك منداڵان کەیفم دەکردو چەندین جار دەستەکانم لەبەردەم خۆم ڕادەگرت و لێیان ورد دەبوومەوە. باوەڕم نەدەکرد ئەو تابلۆ جوانە بەپوولەکە چنراوە کاری من بێت. گوتم کە چیتر هاودەمی کەسم ناوێ، بەڵام بەهەڵەدا چووم، چونکە تەنها کەسێك کە دەیتوانی بەئازادی هاتوچۆی ماڵی ئێمە بکات عەتا بوو، تەنها ئەو بوو کە لە بچووکترین کارەساتی ژیانی من ئاگادار بوو، دەیزانی لەچ ئاگرێکدا دەسووتێم و ناتوانم دەری ببڕم. هێندە لەتەنهایی و بێهاودەمیدا وەڕەز ببووم کە بە بینینی ئەو فرمێسکی شادی لەچاوەکانم بەر بوونەوە. گوتم:

بەجۆرێك لە بینینت خۆشحاڵم کە پڕ بەدڵ حەز دەکەم بەکوڵ بگریم. گوتی:

بەڵام شازادەخانم، تۆکەهەر ڕۆژەی لەقسەی شیرینی خۆشەویستەکەت بەهرەمەند دەبیت، چۆنە هەست بەتەنهایی دەکەیت؟ گوتم:

ئەو قسەیەی کە بەتۆی دەڵێم هەرگیز جورئەت ناکەم لەلای مامۆستا بیدرکێنم. عەتا بۆ خۆی کەسایەتیەکی تایبەتی هەبوو. ئەو لەڕووی هەستکردنەوە بڕیاری نەدەدا نەك وا

ئەخێر! هەتا دەتوانم بڵێم گەلێك دڵسۆز و هەست بکەیت پیاوێکی بێ دەرك بوو بێت. ئەخێر! هەتا دەتوانم بڵێم گەلێك دڵسۆز و میهرەبان بوو، چونکە بەباشی هەستی بەوشەکانم دەکرد بەڵام بەشێوازێکی لۆژیکیانە رووبەرووی بەدەستهێنانی ئەنجام دەبۆوە و ئەنجامگیری لەرووی ئەقڵەوە بوو ی بەتایبەتمەندییەکانی ئەو ئەژمار دەکرا. من لەلایەنی خۆم و ئیحساسمەوە قسەم دەکرد و ئەو گوێی دەگرت. کاتێك کێشەکەم بۆ روون کردەوە بێ ئەوەی کاریگەری ئیحساسی منی بەسەرەوەی بێ رێنمونی دەکردم. خۆشم دەویست و وا هەست دەکەم ئەویش منی خۆش ویستبێت. لەو خۆرئاوابوونەشدا دەردەدڵم لاکردو ئەویش بە وردی گوێی گرتبوو، کاتێك قسەکانم کۆتایی هات بەپێچەوانەی رابردووەوە نازانم چی لەقسەکانمدا خوێندەوە کە گوتی:

ئیتر تەواو. تۆ دەبێت دەست لەوکارە هەڵبگریت. بەسەرسورمانەوە گوتم:

بۆچی؟ من لەکارەکەم رازیم. گوتی:

سەیرێکی خۆت بکە، تۆ لەماوەی ئەم چەند مانگەدا بێ ئەندازە لاواز بوویت و ئیتر ئەو سادە شادو روو گەشاوە نیت. تۆ دەبوو زووتر دەستت لەم کارە هەڵگرتبا. هەر لەرۆژی یەکەمەوە کە دەرکت بە رەوشت و هەڵسوکەوتی مامۆستا کرد. لەو لایەنەوە من زۆر نیگەرانم، چونکە حەزم کرد خۆت باشتر و زۆرتر مامۆستا بناسیت. من بەڵێنم بەخێزانەکەت داوە کە تۆ زۆر زوو دەست لەو عەشقەت دەشۆیی و ئەوانیش هێشتا بەئومێدن بۆ لایان بگەرێیتەوە، نابینی تەنهایی چۆن رۆژگاری رەش کردوویت؟ وادەزانی نازانم بۆچی درەنگ درەنگ سەردانی ماڵی باوکت دەکەیت؟ تۆ ناتەوێت ئەوان بزانن لێرەدا چ ئازارێك دەکێشیت، بەڵام ناتوانی لەمنی بشاریتەوە. تۆ ویستت بەختی خۆت تاقی بکەیتەوەو کردت، بەڵام زۆر بەداخەوە لەم رێگایەدا شکستت هێنا. من بەتۆم گوتبوو کە هیوای سەرکەوتنت نیە، بەڵام تۆ ورکت گرتبوو و پێداگریت لەسەر ئەم کارە کرد، ئێستا ئەنجامەکەیت بەچاوی خۆت بینی، دەبێت تا لەمە زیاتر لەناو نەچوویت دەست هەڵبگری. هەستە خۆت ئامادە بکە تاکوو بتگەیەنمە ماڵی باوکت. لەو ساتەدا پابەندی قسەکانی بووم و دڵنیا بووم شکستم هێناوەو هەستام، بەڵام کاتێك چوومە

ژوورەکەمەوە چاوم بەدەفتەری یاداشتەکە کەوت و بینیم نوسیویەتی "شەو زوو دێمەوە" سەیرێکی کاتژمێرەکەم کردو بەخێرایی بەرەو چێشتخانەکە چووم. عەتا وای زانی کارەساتێك ڕووی داوە، بەرەو لام هات و پرسی:

چی بوو؟ گوتم:

هەر ئێستا مامۆستا دێتەوەو من هێشتا خواردنم ئامادە نەکردوە، بەسەرسوڕمانەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

مانای دەتەوێت لەگەڵمدا نەیەیتەوە؟

ـ نەخێر، نایەمەوە! مامۆستا پێویستی بە من هەیە، چۆن دەتوانم دەستبەرداری بم. مامۆستا منی دامەزراندوە، ئەو نازانێت من چەندم خۆش دەوێ و ئەم عەشقە یەك لایەنەیەو هەر بەو شێوەی کە گوتت بەختی سەرکەوتن بۆ بردنەوەی من خاڵی سفرەو من لەگەڵ ئەو زانیارییەشمدا ئامادەم کاری بۆ بکەم. ئێستا ناتوانم دەستی لێ هەڵبگرم چونکە ئەو هێشتا دەرکی بەمن نەکردووە. توڕە بوو و گوتی:

مەگەر دەتەوێت تەمەنی لاویت بنێیتە ژێر پێی کەسێکەوە کە خۆشی ناوێیت؟ گوتم: ئاشکرا نییە خۆشی دەوێم یان نە. مەگەر خۆت نەتگوت کە هیچ کارەکەرێك لەچەند هەفتەیەك زیاتر لای نەماوەتەوە؟ بەڵام خۆت دەبینی کە مامۆستا تا ئێستا منی دەر نەکردووەو منیش لەکاری خۆم بەردەوام دەبم. باشە ئەمە نیشانەی چییە. تکات لێدەکەم ئەم خەونە شیرینەم مەشێوێنەو مۆڵەتم بدە بەو ئومێدەوە بەردەوامی بەکارەکەم بدەم.

ـ ئاخر لەناو دەچی.

ـ نە. لەناوچوون لەتەنیشت ئەودا ژیانە و ژیانیش بەبێ ئەو لەناوچوونە! چەند جارێك سەری ڕاوەشاندو گوتی:

نیگەرانم. من جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە کە هیوای سەرکەوتن لەم کارەدا بوونێکی نییە و دەترسێم ڕۆژێك لەم کارە پەشیمان ببیتەوە، ڕۆژێك کە پەشیمان بوونەوە سوودێکی نییە. گوتم:

دۆستی باش نائومێدم مەکە. ئارەزووم وایە کاتێك کە تەمی نائومێدی باڵی بەسەرمدا دەکێشێ، تۆ ئەو ئەمە بڕەوێنیتەوەو وەك پیشەی هەموو کاتێکت قسەهیوابەخشەکانت بەردەوام هێزی سەقامگیریم زیاد بکات، ئێستاش لەنێوانی ڕێگادا بەتەنها جێم مەهێڵە و مۆڵەتم بدە بیر بکەمەوە، ئەمجارەش پشتیوان و دالدەی منبە لەکاتی کێشە و گرفتەکانمدا. دەستی گرتم و چاوی لەچاوەکانم بڕی و گوتی:

بەڵام من ناتوانم دەستخەڕۆت بکەم. بۆچی دەتەوێت تەفرەت بدەم، من ئایندەی بەرۆشنی نابینم هەر وەك ئێستاش نایبینم. سادە تۆ نابێت بەخۆڕایی داهاتووت لەناو ببەیت. تۆ جوانی، گەنجی، دەستت لەکارێك وەرداوە کە کەم ژن هەیە جورئەتی ئەم کارە بکات. تۆ بۆ ئەم کارە دروست نەبوویت. من وێنەی تۆم بەجلی فڕۆکەوانییەوە بینیوە. تۆ دەبێت بفڕیت، تۆ دەبێ بگەیتە لوتکەی سەرکەوتن. تۆ ڕێگایەکی ڕۆشنت لەپێشەو لەخۆتی تاریك مەکە. بیر بکەرەوە، ئەم کارەشت یەکێکە لەسەرگەرمییەکانی سەردەمی منداڵیت کە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بینێیتەلاوە. دوێشەو چووم بۆ ماڵتان، باوکت گوتی کە ئافرەتەکانی هاوەڵت فڕینی ناوخۆییان دەست پێکردوە. حەز ناکەیت وەك ئەوان بفڕیت؟ ئایندەی تۆ لێرە نییە. چۆن مەبەستەکەمت تێگەیەنم؟ گوتم:

لەقسەکانت تێدەگەم و سوپاسی دڵسۆزییەکەشت دەکەم، بەڵام مۆڵەتم بدە ڕاستییەك هەیە پێتی بڵێم. من تاکوو ئێستا هیچ کارێکم بەبێ سەرکەوتن واز لێ نەهێناوە! لەمنداڵییەوە خووم بەمەوە گرتووە. ویستم ببم بەسەردەستەی منداڵان، بووم. ویستم پاڵەوانی بۆکس و تۆپێن و تەواوی ئەو شتانەبم کە ئارەزووم دەکرد، بووم. بەگوێرەی ئارەزووم خواستەکانم بەدەست هێناوە و ئێستاش نامەوێت ئەم کارەم بەنیوە ناچڵی جێ بهێڵم، لەمەبەستم تێگەیشتی؟ تۆ و خێزانەکەم وا هەست دەکەن کە ئەم کارانەم هەر وەك ئارەزووەکانی دەورانی منداڵی وایە. لەوانەیە تا ئاستێك هەق بەئێوە بێت، بەڵام دەبێت تەواوی بکەم. چ لەم ڕێگەیەدا سەربکەوم و بەقسەی تۆش شکست بێنم، هەرگیز بەلامەوە گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە تا کۆتایی لەخەباتدابم. باوك و دایکم

بەتایبەتمەندییەکانی رەوشتی من ئاشنان، بەلام حەز دەکەم تۆش بزانیت کە هەرگیز هیچ کارێك بەناتەواوی جێ ناهێڵم. گوتی:

بەلام من وا هەست دەکەم هەندێك لەو کارانە نابێ دەستیشی بۆ ببرێت، چونکە دەست بۆ بردنیان جگە لەزیان شتێکی تر نییە.

ـ تۆ وا هەست دەکەی کارەکەی من بێهوودەیە؟

ـ لەلایەنی مرۆڤدۆستییەوە نەخێر. ئەگەر بمانەوێت لەم ڕوانگەیەوە لێکی بدەینەوە کارەکەی تۆ شایانی ڕێزە، چونکە من دەزانم لەم کارەتدا چ مەبەستێکت هەیە. دەبێت بڵێم بەڵێ بێهوودەیە، کەسێك ئەم کارە دەکا کە چارەیەك و هونەرێك و پشتیوانێکی نەبێت، بەلام تۆ هەموو ئەمانەت هەن، بۆ ڕازیکردنی ئارەزوو و ویستی خۆت دەتەوێ بەخۆتی بسەلمێنی کە دەتوانی لەژیانی مامۆستادا کاریگەریت هەبێت، هەر بۆیە ئەم کارەت پەسەند کردووە، من دەترسم پاش ئەوەی سەرکەوتنت بەدەستهێنا، دەستبەرداری مامۆستاش بیت وەك هەموو شتەکانی ترو بەدوی کارێکی دیکەدا بڕۆیت، تاوانبارکردنی نادروستی دڵمی بریندار کرد، لەکاتێکدا کە هەوڵم دەدا بەر بەفرمێسکەکانم بگرم گوتم:

بەلام مامۆستا بوکڵەی مندالان نییە کە بمەوێت پاش ماوەیەك وازی لێ بهێنم. لەبیرت کردووە من عاشقی ئەوم، زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی کرد و گوتی:

بەلام تۆ پێشتریش عاشقی شتانێکی تریش بوویت، مرۆڤ تاکوو بەنیازی شتێك نەبێت دەست بۆ ئەنجامدانی نابات. گوتم:

لەوانەیە هەق بەتۆ بێ. من گەلێك کارم کردووە کە ئارەزووم کردوون، بەلام هەرگیز عاشقیان نەبووم. تێدەگەیت؟ من بوومە فڕۆکەوان، چونکە دەمویست بۆشایی بوونم بەفڕین پڕ بکەمەوە دەمویست کاتێك بەئاسماندا دەفڕم خۆم بەئازادی ببینم. دەمویست لەخۆم و لەکەسانی تر دوورەپەرێزبم، بەلام بۆشاییەکانی بوونی من هەرگیز پڕ نەبوویەوە. تەنها کاتێك لەتەنیشت مامۆستادام بەتەواوی هەست بە بوونی خۆم دەکەم. ئەم بیرکردنەوەیە لەوانەیە لای تۆ و کەسانی تر هەڵە بێت، بەلام بەبۆچوونی خۆم

بەتەواوی دروستە. من دەمەوێت وا هەست بکەم کە زیندووم و دەژیم. من دەمەوێت بوونێکی کامڵ بم و تەنها لەتەنیشت مامۆستادا هەست بەوانە دەکەم. کاتێک ئەو لەماڵەوە نییە هەست بەدڵتەنگی و پووچی دەکەم، من وابەستەی بووم و بەشێکە لەبوونی من و لەگەڵ ئەودا بەختەوەرم. چی تێدایە ئەگەر ئەوینی من تاک لایەنە بێت؟ ئەو سەربەستە کە خۆشی بوێم یان نا. من دەبێت خۆشم بوێت کە خۆشیشم دەوێت.

پێکەنی و گوتی:

وا هەست دەکەی تاکوو کەی بتوانی بەردەوام بی. ئایا بیرت لەوە کردۆتەوە ئەگەرمامۆستا کچێکی تری خۆش بوێت و بیەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکات تۆ چ سەرئەنجامێکت دەبێ؟ ئایا هەر بەڕاستی ئەم بابەتەت لای خۆت لێکداوەتەوە؟ ئایا هێندە ژیری کە ئەم زەبرانە بەئاسانی وەربگریت و ژیرانەش خۆت دوور بخەیتەوە؟ گوتم:

وا هەست دەکەم بتوانم. هەرچەندە کێشەیە، بەڵام رۆژانە خۆم ڕادێنم کە بتوانم لەزێواری ژیانی مامۆستادابم و تەنها تەماشاکەریم، من دەمەوێ ئەو کامەران بێ چ لەگەڵ مندا و چ لەگەڵ کەسێکی کەدا. زەردەخەنەیەکی کرد، دەمزانی کە باوەڕ بەقسەکانم ناکات و لەو هەلومەرجەشدا هەق بەو بوو. کاتێک کارەکەم دوایی هات، هەردووک بەرەو هۆڵەکە گەڕاینەوە.

"٥"

قسەکانی من ئەویان بۆ بیرکردنەوە کێش کردبوو وەک ئەوەی بۆ ڕێگایەکی تر بگەڕێت تاکوو بتوانێت بۆ گەڕانەوە ڕازیم بکات. دەستم نایە سەر شانی و گوتم:

هاوڕێ گیان زۆر بیر مەکەرەوە. من سەرکەوتوو دەبم و کامەرانیش بەدەستدێنم، هەر چەند کە ئێستاش خۆم بەکامەران دەزانم. پرسی:

ئەگەر بەڕاستی هەست بەکامەرانی دەکەیت ئەی بۆچی ڕۆژ بەڕۆژ لاوازتر دەبیت؟ بۆچی چیتر شەوقی شادی بەروخسارتەوە نابیندرێت؟ گوتم:

لەوانەیە ماندووبم، چونکە لەسەر کارکردنی ناومالّ ڕانەهاتووم، بەلاّم باوەڕ بکە هەست بە بەختەوەری دەکەم، ئێستا بائەم باسە کۆتایی پێ بهێنین و بیدەینە دەست ڕۆژگار. با قەدەرو چارەنووس کاری خۆیان ئەنجام بدەن. مەبەستی گەڕانەوەی هەبوو، لەپڕمامۆستا هاتەوە. بەبینینی ئێمە زەردەخەنەیەکی پڕ ماناى کردو پرسی:

عەتا تازە هاتوویت یان دەتەوێ بڕۆیت؟ گوتی:

دەمەوێت بڕۆم. ماوەیەکە لێرەم. مامۆستا گووتی:

بۆ سەردانی من نەهاتبوویت؟ گوتی:

هاتم حالّی سادە بپرسم و بزانم ئایا خەیالّی گەڕانەوەی نییە؟ چونکە هاوکارەکانی فڕینی ناوخۆییان دەست پێکردووە. مامۆستاگوتی:

زۆر باشە، وەلاّمی چی بوو؟ عەتا سەیرێکی کردم و گوتی:

سادە بڕوای وایە لەماڵداری دا ئەزموونی تەواوی بەدەست نەهێناوە. ئەو کچێك نییە کە کارێك بەنیوەناچڵی جێ بهێڵێت. پێکەنینێکی کرد کە بوە هۆی ئەوەی منیش پێ بکەنم. مامۆستا شتومەکەکانی نایە سەر مێزەکەو دەستی عەتای گرت و لەتەنیشت خۆیەوە داینیشاندو گوتی:

ئێستا کە من هاتوومەتەوە ناتەوێت لەحاڵی منیش بپرسیت؟ عەتا گوتی:

دەبینم کە لەش ساغ و دڵخۆشیو... مامۆستا قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

لەرۆژێکەوە کە لەچێشتخانەی دەرەوە نان ناخۆم و لەرێجیمی خۆراکی گریگۆریان خانم کەڵك وەردەگرم حاڵم زۆر باشە و ژانە سکە نەفرەتییەکەم کەمتر بەلامادێت. عەتا سەیرێکی کردم و پاشان ڕووی بەرەو مامۆستا وەرگێڕا و گوتی:

کەوایە ڕێزی سادەبگرەولەدەست خۆتی مەدە، هەردووکیان پێکەنین‌و منیش بۆ ئەوەی مێزەکە ڕێك بخەم بەجێم هێشتن. هێندەی پێ نەچوو کە عەتا هات بۆ لام و گوتی:

یارمەتیت ناوێ؟ گوتم:

لەم لایەنەوە نەخێر، بەڵام خۆت دەزانی کە هەمیشە پێویستیم بەیارمەتی تۆ هەیە، قاپەکانی لەدەست وەرگرتم و بەپێکەنینەوە گوتی:

شازادەخان هەمیشە بۆ خزمەتگوزاریت ئامادەم. لەبەرچاوی مندا مامۆستا قەڵەو بووە. دەبێ هەر ئاوا بێت! کاتێك کە کەیبانوویەکی جوان و میهرەبان پەرستاری مرۆڤ بێت ئەوا ناتوانی جگە لەباشی چاوەڕوانییەکی تری لێ بکەیت، من وا دەزانم مامۆستا بە بوونی تۆ چیتر خەمێکی نییە، لەقسەکانی دا هەستم بە حەسوودی دەکرد. گوتم:

بۆچی ناڵێیت کاتێك مامۆستا هاوەڵێکی وەك منی هەبێت ئیتر خەمێکی نییە! لەقسەکەم خۆشحاڵ بوو و گوتی:

من خۆشم دەوێ، بەڵام دانی پێدا دەنێم کە لەئێستا دا حەسوودی پێ دەبەم.

– حەسوودی لەبەر چی؟ تۆ شتێکت لەو کەمتر نییە.

ـ من کەبانوویەکی وەك تۆم کەمترە، بەڵام کاتێك بزانم ئێوە هەردووکتان بەختیارن، منیش هەست بەبەختەوەری دەکەم. گوتم:

هیوادارم مامۆستاش هەمان بۆچوونی تۆی هەبێت و خۆی بەبەختیار بزانێت. بەگاڵتەپێکردنەوە گوتی:

دەبێت پیاوێکی ساویلکە بێ ئەگەرهەست بەمە نەکات. مامۆستا سەری کێشایە ژووری چێشتخانەوە و گوتی:

ئەگەر گفتوگۆی دادەو کاکە کۆتایی هاتوە، تکایە نان ئامادە بکە. گوتم:

ئەگەر زەحمەت بکێشیت هاوەڵە هەستیارەکەتان لەگەڵ خۆتاندا ببەن، ئەگینا خواردن ئامادە نابێ! قسەکەم لەگەڵ پێکەنین و تانوودا تێکەڵ بوو. مامۆستا قۆڵی عەتای گرت و گوتی:

هاورێی ئەزیز، تکا دەکەم لەگەڵ مندا وەرە تاکوو خانم بەکارەکەی رابگات. لەسەر مێزی نانخواردن قسەکانیان بەئاقارێکی تردا برد و چوونە سەر باسی کۆمەڵایەتی و سیاسی. کاتێك نانخواردن کۆتایی هات، عەتا گوتی:

دەستێکی خاوێن و رەنگینت هەیە، بەڵام هێشتا بەدەستی رەنگینی دایکت ناگا. نەمزانی چ مەبەستێکی لەو قسەیەدا هەبوو. ئایا دەیویست مامۆستا تێگەیەنێ کە تا چ ئاستێك لەخێزانەکەی ئێمەوە نزیکە؟ یان شتێکی تر. بەهەر حاڵ شەوێکی زۆر خۆش بوو. کاتێك عەتا ماڵئاوایی لێکردین بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکە داکێشا، بەجۆرێك کە مامۆستا ئاگادار بوو گوتی:

چ ئارامی و بێدەنگییەکە! دەڵێی عەتا بەرۆیشتنی خۆی ژیانیشی لەگەڵ خۆیدا بردووە. گوتم:

منیش هەمان هەستم هەیە، ئەو پیاوێکی رووخۆش و قسە خۆشە و هەڵسوکەوتی دەبێتە هۆی ئەوەی تا کاتێك لەلای ئێمەیە هەست بکەین زیندووین و ژیان بەکامی ئێمە دەگەرێت. کەمێك بیری کردەوەو پاشان گوتی:

ئایا ئەو کاتانەی بەتەنها دەمێنیتەوە هەست بەپەشێوی دەکەیت؟ گوتم:

مرۆڤ پێویستی بەهاوڕێ و هاودەم هەیە تاکوو کەمتر هەست بەماندوو بوون بکات.
کاتێك عەتا دێت بۆ سەردانمان من هەست بەتێپەڕینی کات ناکەم. ویستی شتێك بڵێ ی
زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. پاش وتووێژێکی کورت ڕووی تێکردم و گوتی:

کاریان بەتۆ هەیە. سەرم سووڕما لەو شەوە درەنگەدا دەبێت کێ بێت. کاتێك
تەلەفۆنەکەم هەلگرت، دەنگە پڕ لەخۆشەویستییەکەی دایکم نیگەرانییەکەی ڕەواندمەوە.

ئەو گوتی:

نەمویست لەم ناکاتەدا تەلەفۆن بکەم، بەڵام سامۆئیل گەڕاوەتەوە ئێران و چاوەڕوان
تۆ ببینێت. پرسیم:

ئایا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا گەڕاوەتەوە؟ دایکم گوتی:

نە... بەتەنهایە و چەند ڕۆژێك زیاتر لەئێران نامێنێتەوە. حەزی دەکرد پێش
گەڕانەوەی تۆ ببینێت.

ـ لەبارەی منەوە چیت پێ گوت؟

ـ دلگران مەبە ئەو هیچ شتێك نازانێت جگە لەوەی کە تۆ چەند ڕۆژێکە میوانی
هاوەڵێکتی، تەنها ئەوە. گوتم:

تۆ ئاگاداری هەستی منی بەرامبەر بەو. نامەوێت ببینم، پێی بڵێ نەتتوانیوە من
بدۆزیتەوە. هاتە نێو قسەکانمەوەو گوتی:

بەڵام سامۆئیل تەنها بۆ دیداری تۆ هاتۆتەوە، وا هەست دەکەم بۆ داهاتووت
بەرنامەیەکی پێیە، وا چاکترە ئەم هەلە لەدەست خۆت نەدەیت، ئەگەر بۆ یەکجاریش
بووە ببینە. گوتم:

بەلامەوە گرنگ نییە بۆ دیداری من هاتۆتەوە یان کەسێکی کە. چاوەڕوانی ئەوەش نیم
ئەو نەخشە بۆژیانی من بکێشێت، من خۆم ئایندەی خۆم دروست دەکەم، بەو شێوەیەی
کە ئارەزووی دەکەم. توڕە بوو و گوتی:

کارەکەری بۆ خەڵك چ پاشەڕۆژێکی هەیە؟ هێشتا ماندوو نەبوویت؟ بۆچی دەتەوێت
یاری بەخۆت و بەژیانیشت بکەیت؟ ئەو کارە لەتۆ ناوەشێتەوە، وازی لێ بێنە! کارێك

مەکە من و باوکت دەستەو ئەژنۆ بین کە ئەنجامەکەیمان ناوێت. یان خۆت بگەڕێرەوە یان ئەوەیە کە... گوتم:

نیازت چییە؟ بۆچی لێناگەڕێیت بژیم؟ من ئەم کارەم خۆش دەوێت دەمویست بڵێم من کە کارەکەری دەکەم لەبەر کەسێکە کە خۆشم دەوێت، بەڵام بوونی مامۆستا لەمزڵەکەدا بووە رێگر لێم و گوتم:

دایکە ئەگەر دیدار لەگەڵ سامۆئیل دا بکەم وازم لێدەێنن؟ رازی بوو و گوتی:

دەبێت هەر بەیانی بۆ ماڵ بگەڕێیتەوە، تەلە فۆنەکەی داخست، پاش داخستنی تەلەفۆنەکە کەوتمە بیرکردنەوە. ئایا چ نەخشەیەکیان بۆ کێشاوم؟ بۆچی سامۆئیل دەیەوێت چاوی پێم بکەوێت؟ ئەوێک کە ژنی هێناوە و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەختەوەرە.

مامۆستا زنجیرەی خەیاڵی پچڕیم و گوتی:

شتێک ڕویداوە؟ سەیرێکم کردوو گوتم:

نەخێر شتێکی گرنگ نییە، یەکێک لە دۆستەکانمان لەدەرەوە گەڕاوەتەوەو بەنیازە من ببینێت. گوتی:

بەڵام تۆئارەزووی ئەو دیدارەت نییە، وایە؟ گوتم:

بێگومان، گوتی:

تۆکچێکی ڕاڕایت، چەند خولەکێك لەمەو پێش گوتت مرۆڤ دەبێت هاوڕازو هاودەمێکی هەبێت، ئێستا بۆ هەڵدێیت؟ گوتم:

ڕۆژێك بەڕێزتان گوتتان هاودەمەکانتان بۆ خۆتان هەڵی دەبژێرن، لەکاتێکدا لای من بەوجۆرە نییە و کەسانی تر دەستنیشانی دەکەن. من بەیانی لەماڵەوە نابم، بەڵام خواردنتان بۆ ئامادە دەکەم بۆ ئەوەی بێ خواردن نەبیت. گوتی:

سوپاست دەکەم. خۆت ماندوو مەکەو بەخەیاڵی ئاسودەوە برۆ، لەلایەنی منەوە ئاسودەبە. خواردنی ژەمێك نەخۆشی من چارەناکات، هیوادارم پەیوەندییەکی پڕچێژو خۆشی باوەشت بۆ بگرێتەوە. ئەوەی گوت و ڕۆشتە سەرەوە، بەڵام من دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە. نەخشەم دەکێشا کە چۆنچۆنی لەگەڵ سامۆئیلدا ڕووبەڕو ببمەوە و بەچ

کاتێك هیلاك‌وماندوو بەخەیاڵی ئاڵۆزەوە

شێوەیەك ئارەزووەکانی بکەم بە بڵقی ئاو.

چومە سەرجێگاکەم هێشتا نەمتوانیبوو نەخشەیەکی دروست بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بکێشم.

بەیانی زۆر زوتر لە ڕۆژانیکە لەخەو بەئاگاهاتم. ئاگاداربووم کە مامۆستا لەماڵ چۆتە

دەرەوە، لەدەفتەری یاداشتەکەدا هیچ شتێکی نەنوسی بوو. کاتێك گەشتمە ماڵی باوکم،

کاتژمێر لەدەوروبەری "١٠"دا بوو. لەکاتی چونە ژوورەوەمدا سڵەمیمەوە، چونکە ماڵی

وەك مەزاتخانە وابوو، لەهەر سوچ و قوژبنێکدا شتێکی نوێی سامۆنیل بەرچاو دەکەوت.

دارەکانی خلیسکێن زیاتر سەرنجیان ڕاکێشام . دایکم ڕوخساری ماچ کردم و پرسی:

بەیانی زووی تۆ ئێستایە؟ ورد ورد خەریك بوو نائومێد دەبووم. گوتم:

هاتم تاکوو بزانم تۆ و باوکم چ نەخشەیەکتان بۆ مامۆستا کێشاوە، چونکە دەزانن

لەگەڵ مندا ناتوانن هیچ کارێك بکەن! پێکەنینێکی کردو گوتی:

دڵنیابەهیچ پیلانێکمان بۆخۆشەویستەکەت دانەڕشتوە. هەناسەیەکی ئاسوودەییم

هەڵکێشا و گوتم:

ئێرە ماڵە یان بازاڕ؟ دەستی گرتم و لەتەنیشت خۆیەوە لەسەر قەنەفەکە دایبنیشاندم و

گوتی:

باوەڕدەکەی تەواوی ئەم شتانە سامۆنیل بۆ تۆی هێنابێت؟ بەحەپەسانەوە گوتم:

بۆ من؟ سەرێکی لەقاندو گوتی:

بەڵێ بۆ تۆ. لە تفەنگی ڕاوەوە بیگرە تاکوو ئەم کەوڵە پڵینگەی کە لەژێر پێتدا

کەوتووە هەمووی لەبەر تۆیە. سامۆنیل دەیگوت چونکە سادە زیاتر پەیوەندی بەشتی

پیاوانەوە هەیە وەك شتی ژنانە هەر بۆیە ئەمانەم بۆ هێناوە. وەرەو بیانبینە. دەستی

گرتم و بردمیە ژوورەکەی خۆم و گوتی:

سەیری ئەم پاڵتاوە چەرمە بکە، پاڵتاوێکی گەلێك جوان بوو. گوتم:

هی تۆیە؟ پێکەنی و گوتی:

نەخێر، ئەمانە هەمووی هی تۆن هێشتا دەرفەت نەبووە جانتاکانی بکانەوە. ئەم پاڵتاوە چەرمە ئێرانییەی دوێنێ شەو هێنا، حەزی پێدەکەیت؟ کردمە بەرم و بەرەو ڕووی ئاوێنەکە وەستام و گوتم:

گەلێك جوانە ودەبێ زۆریش گرانبەهابێت. دایکم کەمەستی بەخۆشییەکەم کرد، گوتی:

بەڵێ، هەم جوانەو هەم گرانبەهاش. پاڵتۆکەم داکەند و گوتم:

ئێستائەولەکوێیە؟ منْ هاتووم ئەو ببینم، بەڵکو بتوانم زووتر بگەڕێمەوە، ناتوانم زۆر لێرە بمێنمەوە. دایکم روخساری تێکدا و گوتی:

خەیاڵی ڕۆیشتنەوە لەمێشکت دەرکە. تۆ دەبێت ئەمڕۆ لێرەبیت. گوتم:

بەڵام ... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

بەڵامی ناوێ.. من و باوکت ماف ئەوەمان هەیە کە ڕۆژێك لامان بمێنیتەوە. گوتم:

زۆر باشە، بەڵام پێت نەگوتم سامۆئیل لە کوێیە. گوتی:

چەند خولەکێك پێش ئەوەی تۆ بگەیت لەماڵ چووە دەرەوە، بەڵام بۆ نیوەڕۆ دەگەڕێتەوە. ئێستا وەرە شتەکانی ترت پیشان بدەم، ناتوانم بڵێم خۆشحاڵ نەبووم و ئەو هەموو دیارییە سەرنجیان ڕانەکێشام. من لە تێپەڕینی ئەو چەند مانگەدا گۆڕابووم و بەبینینی ئەو هەموو شتە ڕەنگاوڕەنگانە گەلێك دڵخۆش بووم. هەتا کاتێك سامۆئیل لەپڕەیەکی بەهۆی دیدارەکەمانەوە کردە ملم لەخۆشی دا روخسارم شەوقی دەدا، کەش و هەوای ناو ماڵەکەو بینینی ئەو هەموو شتە ئەنتیکە و جوانانە گۆڕانیان لەمندا دروست کردبوو. سامۆئیل قسەی دەکرد و پێدەکەنی. دەتوانم بڵێم کە شادی ئەو لەمنیشدا ڕەنگی دابوویەوە. بەجۆرێك کە ئاگام لەکاتژمێر نەمابوو. بەقسە و گاڵتەکانی سەرگەرم ببووم. ئەو هەمووومانی بۆ نانی ئێوارە بانگهێشت کرد بۆ هوتێل هیلتۆن، لەکاتی گەڕانەوەدا پرسی:

ئۆتۆمبیلەکەت نەگۆڕیوە. گوتم:

پێویستی بەو کارە نەدەکرد، چونکە کارێکی وام بە ئۆتۆمبیل نییە. پێکەنی و گوتی:

ناشێ ئۆتۆمبیلەکەت بگۆڕی بە فڕۆکە. گوتم:

رۆژێك بڕیارتدا فرۆکەم بۆ بکڕی، ئایا ئێستاش لەسەر بەڵێنەکەت ماوی. ئەو بەدەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:

بۆچی نە؟ ئەگەر بزانم ئارەزوو دەکەی بۆت دەکڕم. گوتم:

سامۆئیل نەکا تۆ "راکفلێر"بی و ئێمە ئاگامان لێ نەبێت. گوتی:

سەروەت و سامانی من لەو کەمتر نییە. باوکم خاوەنی سێ کارگەی ئەڵماسە و خەزووریشم خاوەنی چاڵی نەوتە. پێکەنیم و گوتم:

کام چاڵی نەوت؟ لەئێران یان ئیمارات؟ هەمدیسان پێکەنینێکی تری کردو گوتی:

بۆ تۆ چ جیاوازییەکی هەیە. ئەوەم بۆیە گوت تاکوو بزانی دەتوانم فرۆکەت بۆ بکڕم. گوتم:

نا، سوپاست دەکەم. من وازم لەفڕین هێناوە. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

کەشتی گەشت و گوزارت دەوێ؟ گوتم:

زەحمەت مەکێشە نێوانم لەگەڵ دەریاوانیدا نییە. گوتی:

تاکوو لەیادم نەچووە دەبێ بڵێم بەیانی دەچین بۆ خلیسکێن. ئەو دارانەی کە بۆم هێناویت، باشترین جۆری داری خلیسکێنە. من لەگەڵ چەند کەسێکی تر بۆ بەیانی بەڵێنم داوە و تۆش لەو لیستە دایت. سەرپێچیم نەکردو چاوم بڕیە شەقامەکە. بەتۆم گوت بەخاك و هەوایەکی تردا دەمڕوانی و هەموو شتەکان وەك خەوێك وابوون. وەك ئەوەی لەتەواوی ئەو رۆژانەدا لەخەونمدا ڕوویان دابوو و راستی نەبوون. بەیانی زوو کاتێك چووین بۆ خلیسکێن سێ ئۆتۆمبیلی تر لەگەڵماندا بوون، لەسامۆئیلم پرسی:

بۆچی هاوسەرەکەت لەگەڵت نەهات؟ تیلەی چاوێکی تێگرتم و گوتی:

ئەو بۆ گەڕان و شت کڕین چوو بۆ پاریس ،منیش هاتم بۆ ئێرە. گوتم:

بەڵام ئێرە هێندە سەرنج ڕاکێش نییە. گوتی:

تۆ لە کوێ دەزانی؟ من هاتووم تاکوو سەرکەوتوو بم. پرسیم:

لەچ کارێکدا؟ دووبارە نیگای تێ بڕیەوە، بەڵام لەمەبەستی حاڵی نەبووم. کاتێك پرسیارەکەم دووبارە کردەوە، گوتی:

لەسەر ئەوە ڕاهاتووم کە ئارەزووی هەر شتێك بکەم، بەدەستی بهێنم! بەگاڵتەوە

گوتم:

بەتەواوی وەکوو من. ئەو بەردەوام بوو:

ئێستاش شتێکم دەوێ کە ساڵی ڕابردوو تێیدا سەرکەوتوو نەبووم و دەستگیرم نەبوو.

گوتم:

جا دەتەوێ زۆرانبازی بکەیت؟ گوتی:

زۆرانبازی لەئارادا نییە. لەبیرت نەچێت کە پارە هەموو کێشەکان چارەسەر دەکات.

گوتم:

من لەگەڵ ئەو ڕایەدا نیم، چونکە زۆربەی شتەکان ناکرێ بەپارە بەدەست بێت.

پرسی:

وەکوو چی؟ گوتم:

وەکوو عەشق. ئەو هێندە بەدەنگی بەرز پێکەنی کە من حەپەسام. گوتی:

گیانەکەم ئەوە بچووکترین کاڵایە کە بەپارە دەکڕدرێت. گوتم:

بەڵام ئەوە پێی ناڵێن عەشق. ئەوە ئارەزووە. گوتی:

ڕۆمانتیکیانە بیر مەکەرەوە. کاتێك پارەت هەبێ ڕەقترین دڵ نەرم دەبێت. گوتم:

بۆچوونەکانمان جیاوازە، بەڵام عەشقێك بەپارە بکڕدرێت من بەعەشقی نازانم. گوتی:

ئاییندە پێتی دەسەلمێنێت کە توانای پارە تا چ ئاستێکە و چۆن چۆنی دڵە سەختەکان نەرم دەکات. ئەو ڕۆژە لەقسەکانی تێنەگەیشتم. هەر زۆر زوو لەبیر خۆمم بردەوە. ڕۆژێکی تر لەماڵی باوکمدا مامەوە. بەرنامەکانی سەیرانە جۆربەجۆرەکان منیان بەتەواوی لەمامۆستا بێ ئاگادار کردبوو. بەرنامەکانی سامۆئێل بۆ ڕابواردن و گەڕان هێندە زۆر بوون کە بواری بیرکردنەوەیان نەدەدا. کاتێك نیوەشەو دەچوومە سەر جێگاکەم، هێندە ماندوو بووم کە بەخێرایی خەو باڵی بەسەرمدا دەکێشاو بوارێك بۆ ئەندێشەکانم نەدەمایەوە. شەوی سێیەم بوو کە مامۆستام لەخەونمدابینی، نەخۆش، ڕەنگ زەرد لەسەر جێگاکەی کەوتبوو، بانگی منی دەکرد. بەهەراسانی لەخەو ڕاپەڕیم و کەوتمە

بیرکردنەوە. بێزم لەخۆم دەهاتەوە. من بۆ تاقێك مۆڵەتم لێ وەرگرت، ئێستاش سێ ڕۆژە جێم هێشتوە؟ گڵۆپەکەم داگیرساندو بەدەوروبەرمدا ڕوانیم. بەخۆم گوت:

سادە ڕۆژت بەچی گەیشت؟ تۆ عەشق و خۆشەویستی مامۆستات بەو شتە منداڵانەیە گۆڕیەوە؟ وای بۆ تۆ! بینیت عەتا هەقی بوو کە دەیگووت ڕۆژێك عەشقی مامۆستاش هەر وەکوو شتی یاری وەلا دەنێیت و تۆ باوەڕت نەدەکرد. ئێستا سەیر کە و دڵنیابە. تۆ مامۆستات بەڕاستگۆیانە خۆش دەوێت. تۆ ژیانی مامۆستات کردە گاڵتەجاڕی خۆت. تۆ کچێکی باش نیت. ئازاری ویژدان کۆڵی لێ نەدام تاکوو بەیانی خەو لەچاوەکانم تۆرا. کاتێك دنیا ڕۆشنی کرد خۆم ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە. دایکم بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم:

بۆ ماڵی مامۆستا. تۆ داوات لە من نەکردبوو تەنها دیداری کۆتایی لەگەڵ سامۆئیلدا بکەم، بەڵام ئەمڕۆ سێ ڕۆژە من لێرە ماومەتەوە، ئیتر بەسە. دەبێت هەرچی زووترە بگەڕێمەوە، دایکم دەستی گرتم و گوتی:

بەڵام سامۆئیل! ئەی سامۆئیل چی؟ گوتم:

دایکە چاوەڕوانی چی دەکەیت؟ ئایا دەتەوێت تاکوو کاتێك ئەو لێرە دەمێنێ منیش بمێنمەوەو سەرگەرمی بکەم؟ من کارگەلێکی زۆر گرنگترم هەیەلەسەرگەرمکردنی سامۆئیل. زەردەخەنەیەکیگاڵتەئامێزی کردو گوتی:

بەڵێ کارەکەتم لەبیر چووبوو. لەبیرم چووبوو کە کارەکەری ماڵانی. گوتم:

ئەوە چەندین جارە تانوتم لێدەدەیت، چونکە دایکمی قسەکانت بەدڵەوە ناگرم، بەڵام تۆش کارێك نەکەیت کە بڕۆم و چیتر پێ نەنێمە ئەم ماڵەوە. من بەو بوکڵانەی کە بۆت دەستەبەر کردبووم سەرحاڵ بووم و چێژم وەرگرت، بەڵام ئیتر بەسە. لەزمانی منەوە بەسامۆئیل بڵێ سوپاسی هەموو ئەو شتانەی دەکەم و لەماڵ چوومە دەرەوە. چوومە ناو ئۆتۆمبیلەکەمەوەو بەخێرایی وەڕێکەوتم. هەر وەك لەشتێك هەڵبێم و دەمویست پەناگایەك بدۆزمەوە. ماڵی مامۆستا هەروەك جاران وابوو. هەموو شتێك خاوێن دەهاتە بەرچاو. ئەو هەتا چایشی بۆخۆی لێنەنابوو لەدەفتەری یادداشتەکەشیدا شتێکی

نەنووسیبوو. بەخێرایی دەستم بەکار کرد، خواردنی تایبەتیم بۆ مامۆستا ئامادەکردو دانیشتم وچاوەڕوانی بووم. کاتێك هاتەوە، هەستم کرد هیچ شتێك لەم جیهانەدا بەوێنەی ئەو بەهای لای من نییە، نیگەران و خەمبار دەهاتە بەرچاو. کاتێك سڵاوم لێکرد بەساردی وەڵامی دامەوەو بەگاڵتەجاڕییەوە پرسی:

خۆشت گوزەراند؟ گوتم:

خراپ نەبوو. گوتی:

جێگەی سوپاسە کە خۆشت لەو دیدارە نەهات وتەنها سێ ڕۆژ درێژەی کێشا. ئەگەر دیدارەکەت پێ خۆش بوایە چەند ڕۆژت پێدەچوو؟ گوتم:

داوای لێبوردن دەکەم، بەجۆرێك بەرنامەیان دارشتبوو کەماوەی گەڕانەوەم نەبوو. ئەو چەند ڕۆژ دوورکەوتنەوەیەم لە ڕۆژانەکەم ببرە. لەکاتی ڕۆیشتنیدا بۆنهۆمی سەرەوە لەسەر قادرمەکان وەستاو گوتی:

وادەزانیت ئەوکارە ناکەم؟ گوتم:

بۆچی، چونکە لەتۆ زیاترلەمە چاوەڕوان ناکرێت. بەتوورەییەوە بەرەو لام گەڕایەوەو گوتی:

تۆ دەتتوانی بەتەلەفۆن لەنەهاتنەوەت ئاگادارم بکەیتەوە، نەتدەزانی نیگەران دەبم؟ هێندە دڵخۆش ببووم کە نەمتوانی وشەیەك بڵێم. لەدڵی خۆمدا گوتم ئۆخەی خوایە گیان! من بەلای ئەوەوە بێ بەهانیم. بەشەرمەزارییەوە سەرم داخست و گوتم:

بەداخەوە نەمزانی نیگەران دەبیت. گوتی:

تکا دەکەم دووبارەی مەکەرەوەو چووە سەرەوە، پڕ بەدڵ حەزم دەکرد لەوکاتەدا ئەتاش ئامادە بوایە تاکو خۆیشی ئەم قسانەی لەدەمی مامۆستاوە دەبیست.

"٦"

لەم کاتەدا سادە ئاهێکی درێژی هەڵکێشاو گوتی:

هەموو شتێك بەباشی بەڕێوە دەچوو بەڵام ... ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان بەردەوام بوو:

من دڵنیام هەمیشە هەق بەدایك و باوك نییە. جاری وا هەیە خۆشەویستەکەیان و نەخشەو بەرنامەکانیان بەسوودی ئەوەکانیان تەواو نابێت و نەخوازراوانە هۆکاری بەدبەختیان بۆ فەراهەم دەکەن. بۆ نموونە وەك ئەوەی دایك وباوکی من بەرامبەرم کردیان. ئەوان وایان بیر دەکردەوە من بەهۆی سەروەت و سامانە زۆرەکەی سامۆئیلەوە خۆشبەختی بەدەست دەهێنم، دەیانزانی ئەو منی خۆش دەوێ و بەلاشیانەوە گرنگ نەبوو کە هاوسەری سامۆئیل دووچاری چ چارەنووسێك دەبێت. ئەوان تەنها بیریان لەبەختیارییەکی درۆینەی من دەکردەوەوباقی شتەکانی کەیان بەلاوە بێبەهابوو. بەبۆچوونی ئەوان سامۆئیل باڵندەی بەختەوەری بوو، ئارەزوویان دەکرد لەسەر بانی من بنیشێ و بۆ ڕاستی و دروستی ئەوەش دەستیان بۆ کاری وادەبرد کە بۆخۆشم باوەڕم نەدەکرد. ئەوان هەموو شتێکیان بۆ سامۆئیل ڕوون کردبوویەوەو داوایان لێکردبوو ڕزگارم بکات، ئەویش بەڵێنی هاوکاری پێدابوون، منیش بێئاگا لەهەموو شتێك بیرم لەئایندەو مامۆستا دەکردەوە. ئەو ئێرانی بەجێهێشت، بەڵام بۆ کریسمس گەڕایەوە، ئەمجارەیان لێبڕاوانەتر لەپێشوو، بەهاتنی جەژنی کریسمس من و مامۆستا لەلایەن ماڵی باوکمەوە بانگهێشت کرابووین، بەڵام ئەو حەوسەڵەی بەشداریکردنی جەژنی نەبوو، بەڵام کاتێك

ئامەزرۆییی منی بینی، ڕازی بوو و هەردووکمان پێکەوە ڕۆیشتین. لەبەر ئەوەی کە مامۆستا لەگەڵ خێزانەکەماندا ئاشناداەبوو، هێندە کەیفخۆش بووم کەلەهەموو شتەکانیتر بێئاگا بووم. لەو شەوەدا کاجی کریسمسی ئێمە وەك ئەڵماس دەدرەوشایەوە، چونکە بەڕاستی بەو چەند پارچە ئەڵماسەی کە سامۆئێل بەدیاری هێنابووی، ڕەونەقی پەیدا کردبوو، من بەجلی ئاساییەوە لەو ئاهەنگەدا بەشداریم کردبوو، بەڵام لەسەر داوای دایکم جلەکانم گۆڕی و یەکێك لەجلە دیارییەکانی سامۆئێلم لەبەر کرد. لەوکاتەدا دەمویست لەبەر چاوی مامۆستادا بەجوانی خۆم بنوێنم، هەر بەو هۆیەوە ملوانکەیەکی ئەڵماسی سامۆئێلم کردە ملم، کاتێك لەگەڵ کۆڕی میوانەکاندا کە ئەو شەوە ماڵەکە لەمیواندا جمەی دەهات و هەموویان جگە لەمامۆستا هاودین و هاومەزهەبی ئێمە بوون. ئەو خۆی لەناو ئێمەدا بەنامۆ دەزانی و تەواوی ئاراستەکردنی خۆشەویستی منیش تەنها دەبوە هۆی ئەوەی لەو ناوەندەدا زیاتر هەست بەبێگانەیی خۆی بکات. لەکاتی بەخشینەوەی دیارییەکاندا سامۆئێل ئەنگوستیلە یەکی نگینداری ئەڵماسی پێشکەش کردم و ئەوانیتریش دیاری گرانبەهاکانی خۆیان پێشکەش کردم، بەڵام دیارییەکەی سامۆئێل زیاتر دەدرەوشایەوە، بەڵام بەلای منەوە هیچکامیان نرخیان نەبوو، خۆشحاڵی من لەو لایەنەوە بوو کەمامۆستا لەماڵی باوکمدا لەتەنیشتم دابوو، بەڵام بێئاگا لەوەی کە دایکم هیچ شتێکی لەبارەی منەوە لەگەڵدا نەگوتبوو! هێندە لەبارەی سامۆئێل و ئەو کارانەی کەبەنیاز بوو لەداهاتوودا بۆم ئەنجام بدات قسەی کردبوو، مامۆستا گومانی نەمابوو کەبە زوویی دەبینە هاوسەری یەکتری. ئەو شەوە هیچی نەگوت و منیش بێئاگا لەهەموو شتێك سەرقاڵی خزمەتکردنی میوانەکان بووم. کاتێك ئاهەنگەکە کۆتایی هات، گوتم:

ئەگەر نەختێك ئارام بگریت، لەگەڵتا دێمەوە. نیگاکانی غەمگین بوون. گوتی:

ناتەوێت لای میوانەکان بمێنیتەوە؟ ئەمشەو شەوی جێژنی ئێوەیە. گوتم:

ئیتر بەسەو دەمەوێ بگەڕێمەوە. گوێم بەناڕەزایی ئەوانی تر نەداو لەگەڵ مامۆستادا چووینە دەرەوە، هەوڵیدەدا خۆی بێئاگاو نەگۆڕ نیشان بدات. کاتێك گەیشتین ماوەیەك

درەنگ کەوت و سەرنجی دەوروبەریدا. وەك بڵێی یەکەمین جارە دەچێتە نێو ئەو ماڵەوە.

لێم پرسی:

چی بووە؟ شتێك ڕووی داوە؟ زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

نەخێر! دەمەوێت بزانم ئێرە چ جاربەیەکی هەیە، کە بۆتە هۆی ئەوەی تۆ ئەو ماڵە جوانەت واز لێ بهێنیت و ئەم وێرانەیە هەڵبژێریت؟ گوتم:

یەکەم ئەم ماڵە وێرانە نییەو دووهەمین بەلای منەوە ماڵێك کە هونەرمەندێکی تێدا دەژی لەهەموو کۆشکێك بەشکۆترە! قسەکەم بووە هۆی پێکەنینی و چەند جارێك وشەی کۆشکی دووبارە کردەوە، پاشان کۆتایی پێهێناو ئیتر هیچی نەگوت. چاوەڕوانی پرسیاری ترم لێدەکرد، بەلام ئەو لەگەڵ گوتنی شەوێکی خۆش بوو و سوپاست دەکەم، شەو شادی گوت و چووە ژوورەکەی خۆی. پەشیمان بووم لەوەی کە ئەوم لەگەڵ خۆمدا بردبوو. وام هەست دەکرد بابەتی خۆشحاڵی مامۆستام فەراهەم کردووە، بەلام هەرگیز وام بەخەیاڵیشدا نەدەهات کە بەخەمگینی بگەڕێتەوە. بەیانی زوو مامۆستا لەماڵ چووە دەرەوەو لەو کاتەدا هەستم بەبێزارییەکەی کردبوو. لەچێشتخانەکەدا بووم کە دەنگی دەرگاکە لێیدا. دەرگاکەم کردەوە، بەبینینی ئۆتۆمبیلێکی پڕشتومەك سەرم سوڕما و پرسیم:

ئەمانە بۆ کێن؟ سایەقەکە سەیری ئەو ناونیشانەی کرد کە بەدەستیەوە بووو پرسی:

مەگەر ئێمە ماڵی مامۆستا میهرزاد نییە؟ گوتم:

خۆیەتی. گوتی:

ئەم کەلوپەلانە بۆ ئەم ماڵە نێردراوەو بۆ خانمێك بەناوی سادە. مەگەر ئەو لێرەدا ناژی؟ گوتم:

بۆچی نە، من سادەم، بەلام چاوەڕوانی گەیشتنی شتێکی وام نەدەکرد. گوتی:

من نازانم چ کەسێك ئەمانەی ناردوە، تکا دەکەم شتەکان وەربگرە. پسولەی وەرگرتنیشم بدەرێ. دوو حەماڵ شتەکانیان هێنایە ژوورەوەو لەپاش وەرگرتنی پسوڵەکە ڕۆیشتن. یەکەم بەستەم کردەوە، هەموو شتێکم بۆ ڕوون بوویەوە. دایکم

هەموو دیارییەکانی سامۆئیلی بۆ ناردبووم. بە ڕقەوە تەلەفۆنم بۆ کرد، تەلەفۆنەکەی هەلگرت و پرسیم:

دایکە ئەمە چ کارێك بوو کردتان؟ زۆر بێ بایەخانە گوتی:

شتەکانی خۆتمان بۆ ناردوویت. حەزمان نەکرد سوود لە شتانێك وەربگریت کە تایبەت بەخۆت نین. گوتم:

بەڵام دایکە گیان تۆدەزانی کە ئێرە ماڵی من نییە، ئەگەر دەتویست شتێکم بۆ بنێریت وا باشتر بوو پەیوەندی بەخۆمەوە هەبێت. پێکەنی و گوتی:

بەڵام کچی خۆم. سامۆئیل ئەمانەی بۆ ئێمە نەکڕیبوو. گوتم:

بەڵام من نازانم چیان لێ بکەم. ئێمە هێندەمان جێگا نییە کە بتوانین چودێرییان بکەین، پێویستیشمان پێی نییە. گوتی:

زۆر باشە کەلوپەلە کۆنەکان دوور خەرەوە! من وا هەست ناکەم کە مامۆستا خۆشەویستەکەت خۆشی لەو شتە تازەو جوانانە نەیەت. ڕاستە تۆ کار بۆ ئەو دەکەیت، بەڵام ئەوە بەو مانایە نیە کە کەڵك لەشتی خۆت وەرنەگری. قسەو گفتوگۆم لەگەڵیدا بەبێهوودە دەزانی، هەر بۆیە تەلەفۆنەکەم داخستەوەو لەشتەکان ڕامام. ماڵەکە ببوو بە مەزاتخانە. بەخۆمم گوت:

ئێستا دەبێ چی بکەم؟ هێشتا مامۆستا شتە زیادەکانی لەماڵ نەبردۆتە دەرەوەو ئەمانەشی هاتە سەر. وڕ و گێژ دانیشتم و بەلایانەوە دۆش دامام. ئەوێ ماڵی خۆم نەبوو کە بەئارەزووی خۆم گۆڕانکاری تێدابکەم. لەکاری دایکم توڕە بووم و مێشکم بەتەواوی کاری نەدەکرد. نیوەڕۆ کاتێك مامۆستا دەرگاکەی کردەوەو ئەو هەموو کارتۆن و شتە پێچڕاوانەی لەناو هۆڵەکەدا بینی، خولەکێك مات و سەرگەردان لێیان ڕاما و پاشان وەك ئەوەی کە لەخەونێکی ترسناکدا بەئاگا هاتبێت، هاواری کرد:

سادەخان! من لەسەر قەنەفەکە دانیشتبووم و دەمتوانی بەباشی ئەو ببینم، بەڵام بوونی ئەوهەموو شتومەکە ڕێگرییان لەمامۆستا دەکرد من ببینێت. بەهێواشی گوتم:

بەڵێ. شوێنی دەنگەکەمی هەڵگرت و لەنێوان کێوێك لەبارگەو بنەدا دۆزیمیەوەو پرسی:

لێرە چ باسە؟ ئەمانە چین؟ لەگەڵ سەر ڕاوەشاندنێکدا گوتم:

ئەمانە دایکم بۆی ناردووم. گوتی:

دایکت ناردوویەتی؟ زۆر باشە، بەڵام پێم بڵێ چین؟ گوتم:

پێویستییەکانی خۆمن. پاشان دووبارەی کردەوە:

پێویستییەکانی تۆ؟ زۆر باشە، بەڵام لێرەدا چی دەکەن؟ گوتم:

دایکم بۆی ناردووم تاکوو کەڵك لەشتە تایبەتیەکانی خۆم وەربگرم. ئەو بێئاگا بووە لەوەی کە ماڵەکەی بەڕێزتان شوێنی بەتاڵی نییەو دەنا کاری وای نەدەکرد، من خۆشم سەرم سوڕماوە. بەتوڕەییەوە چەند هەنگاوێکی نا و جارێکی تر تەماشای کەل و پەلەکانی کردەوەو گوتی:

تۆ نەدەبوو ڕێگا بدەی ئەم شتانە بهێننە ئێرە. دەبوو هەموویانت بۆ شوێنی خۆیان بگێڕایەتەوە. گوتم:

لەوکاتەدا مێشکم بەباشی کاری نەدەکردو ... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

من هەرگیز لەعەتا خۆش نابم. ئەو هۆکاری ئەم هەموو کێشانە بوو. ئەو بەناساندنی تۆ ئاسایش و ئارامی ماڵەکەمی تێکدا. ئەو لەنامەکەیدا نوسیبووی کە تۆ بەمەبەستی کارکردن هاتووی پاشان تێگەیشتم کە ژوورت دەوێ و ئێستاش ئەم کەل و پەلانە، دەترسم ڕۆژێکی تر شوێنی خۆم لەم ماڵەدا نەبێتەوە! تۆ دەبێت ڕێکوڕاست بڵێیت مەبەستی هاتنتان بۆ ئەم ماڵەو نەخشە و بەرنامەتان چی بوو. من بۆ ئاهەنگێك بانگهێشت دەکەیت کە کوڕی "ئوناسیس"ی لێیەو مستیلەی ئەڵماس وەك دیاری دەبەخشێت. دایکی بەڕێزیشتان وای نیشان دەدا کە لەمەودوا پێکەوە زەماوەند دەکەن. لەو لایەنەوە ئەو کەل و پەلانەی ناردووە تاکوو کچە تاقانەکەی کەڵك لەپێویستیە تایبەتییەکانی خۆی وەربگرێت. تۆ دەبێ بڵێیت چ پەیوەندییەك لەنێوان کارکردنی تۆ لەم ماڵەداو ئەم کەلوپەلانەدا هەیە؟ لەوانەیە وا بخوازیت ماڵەکەی من بکەیتە جێگەی

ململانێ؟ ئەمە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ عەقڵێکی سەلیمدا نایەتەوە! کەسێك کە دەستگیرانێکی وەك سامۆئیلی هەبێ کە ئامادەیە فرۆکەی بۆ بکڕێت، زۆر بەچاکی دەتوانێت لەجێگەی ئەم ماڵە کۆشکێك بکڕێت. تکا دەکەم تاکوو منتان بەم کارانەتان شێت نەکردوە، پێمی بڵێت مەبەستتان چییەو چ خەیاڵێکتان لەسەر دایە؟ گوتم:

باوەڕ بکە شتێك لەئارادا نەبووە و من مەبەستم نییە دەست لەنێو ماڵی بەڕێزتان وەربدەم، هەر وەك گوتم دایکم لەنەزانینەوە ئەم کارە کردوە کە بۆتە هۆی دەردیسەری، تەنها ئەوە. ئەگەر بزانم بەڕاستی ناتوانم سوود لەم کەل و پەلانە ببینم، هەموویان دەنێرمەوە. گوتی:

وا باشترە واز لەم کارە بهێنن. ئەو پەنجە جوانانەی کە موستیلەی ئەڵماسی تێکراوەو تێیدا دەدرەوشێتەوە نابێ بەکارکردن زبرو نارێك ببن! تۆ دەتویست ئەزموون خڕ کەیتەوە، کردت، بەڵام منیش شتانێك لەتۆوە فێر بووم، فێری ئەوە بووم کە تەواوی ئەو کەسانەی هاوسۆزی بۆ کەسە لاوازەکان دەردەبڕن و هاواری یەکسانی دەکەن، کەسانێکن کە لەناز و نیعمەتدا نوقم بوون و بۆ سەرنجڕاکێشان و فریودانی خەڵکی بێبەش سنگ دەکوتن. قسەکانی ئەو شەوەت ڕاست بوون، دوێ شەو خۆیشم هەموو شتێکم بەچاوی خۆم بینی، هەرچەندە کە ڕاستییەکی تاڵ بوو، بەڵام... قسەکەم پێبڕی و گوتم:

بەڵام من... ئەمجارەیان ئەو قسەکەی پێبڕیم و گوتی:

بەڵامی ناوێت! داوات لێدەکەم ئەم ماڵە جێ بهێڵە، چونکە ئیتر ناتوانم تۆ بەچاوی کارەکەرەوە سەیرت بکەم. هەرچەندە کە لەرۆژی یەکەمیشەوە نەمدەتوانی، بەڵام ئێستا ئیتر بەڕاستی ناتوانم. بوونی تۆ لەم ماڵەدا نەك تەنها کێشەی من چارەسەر ناکات بەڵکوو زیاتریشی دەکات، لەگەڵ پرمەی گریانێکدا کە لەگەروومدا بوو، گوتم:

ئەگەر بڵێم هەموویان لێرە ببەنە دەرەوە، ڕازی دەبیت! گوتی:

گرفتەکە خۆتی. کەئیتر ناتوانم شانی بدەمە ژێر. گوتم:

بۆچی؟ تۆ پێشتر لەکاری من ڕازی بوویت. خۆت لای عەتا ددانت پێدانا. چی ڕوویدا کە چیتر ناتەوێ کارت بۆ بکەم؟ بۆ لام گەڕایەوەو بەتوڕەییەوە گوتی:

بۆچی تێناگەی؟! ئەو مووچەیەی کە لەبەرامبەر کارکردنتدا وەریدەگری تەنانەت پارەی جووتێك پێڵاوی تۆش نییە! من ئەگەر تەواوی سەروەت و سامانم وەك مووچە بەتۆ بدەم، هێشتا هەست بەشەرمەزاری دەکەم. لەمەبەستم تێگەیشتی؟ گوتم:

بەڵام من لەرۆژی یەکەمەوە گوتم کە بۆپارە کار ناکەم. ئەگەر وا هەست دەکەیت مووچەکەم زیادەو دەتەوێت کەمی کەیتەوە، نارەحەت نابم. بەتوڕەییەوە پێی بەزەویدا دەکوتی، گوتی:

بۆچی وەك کچە ناحاڵییەکان قسە دەکەی! مەسەلەی من مووچەی کەم و زیادی تۆ نییە. مەسەلەکە ئیحساسە کە بەرامبەر بەکارکردنی تۆ هەمە لەمماڵەدا. من ئیتر ناتوانم وەك رابردوو داوات لێبکەم کارێکم بۆ بکەیت. من ئیتر رێگە بەخۆم نادەم کە داخوازی کارێکم لێت هەبێت. تۆ ئیتر ... دەستی بۆ ریشی بردو گوتی:

قسەکردن بەسەو من وا هەست ناکەم تۆ بتوانی لەمەبەستم حاڵی بیت. ویستی جێم بهێڵێت کە گوتم:

مۆڵەتێکم بدەرێ. گەڕایەوەو پرسی:

بۆ چ کارێك؟ گوتم:

تاکوو بتوانم ئەزموونەکانم تەواو بکەم. دەزانم بەلای جەنابتانەوە دژوارە، بەڵام تکات لێدەکەم رازی ببەو ئەوە لەبیر بکە کە من کێم. دەمەوێت وەك رابردوو سەیرم بکەیت. من ئەگەر لێرەدا برۆم، بەو مەرجانەوە ناتوانم لەجێگایەکی کەدا کار بکەم و بەدڵنیاییەوە شکست دەخۆم. من لەگەڵ خێزانەکەمدا پەیمانم بەستووە کە دەتوانم لەسەر قاچی خۆم راوەستم و ژیانی خۆم بەرێوە ببەم. ئەگەر دەرمبکەیت ناچار دەبم دووبارە پشت بەوان ببەستمەوە، ئەوەش خواستی من نییە. بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

بۆچی دەتەوێت ئەم کارە پەرە پێ بدەیت؟ تۆ کە لەئایندەیەکی نزیکدا دەبیتە دەوڵەمەندترین ئافرەتی ئێران، چ پێویستییەك لە ئەنجامی ئەم کارەدا دەبینی؟ گوتم:

زەماوەندێك لەئارادا نییە، من نازانم دایکم چی بەتۆ گوتوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە بزانە من نەهاوسەری سامۆئیل دەبم و نەمەعشوقەی ئەویش، چونکە نەخۆشم دەوێ و نەرێگە

بەخۆیشم دەدەم یاری بەژیانی هاوسەرەکەی بکەم. زاری لەسەرسوڕماندا کرابەوە، لۆچ کەوتە نێوچاوانی و پرسی:

بۆچی سامۆئیل هاوسەری هەیە؟ گوتم:

بەڵێ هاوسەرەکەی کچی یەکێك لەدەوڵەمەندە گەورەکانی ئیسرائیلەو خاوەنی چاڵی نەوتە. پرسی:

ئەی بۆچی دایکت بڕوای وابوو کە ئێوە بەزویی پێکەوە زەماوەند دەکەن؟ گوتم:

نازانم مەبەستی دایکم لەگوتنی ئەم قسەیەدا چی بووە. لەوانەیە سامۆئیل گوتبێتی کە بەنیازە هاوسەرەکەی تەڵاق بداو پاشان لەگەڵمندا زەماوەند بکات، بەڵام دڵنیا بە کەهەرگیز کاری وا ناکەم!٠هەرگیز! مامۆستا، ئەگەر دەرم بکەیت بێگومان خواستەکانی ئەوانت جێبەجێ کردوە! باوکم و دایکم کەسانێکی خراپ نین، بەڵام بەقسەی سامۆئیل هەڵخەڵەتاون کە ئەودەوڵەمەندەو هەموو شتێکی کڕیوەو من وای بۆ دەچم بریسکەی ئەڵماسەکانی سامۆئیل هەستی دایك و فرزەندی کوێر کربێت. من نامەوێ تۆ دووچاری گرفتەکانی من ببیت، تەنها داوای ئەوەت لێدەکەم مۆڵەت بدەیت لێرەدا بمێنمەوەو وەك پێشان لەکاری خۆم بەردەوام بم. ماوەیەك بێدەنگ بوو و پاشان گوتی:

من دەبێت لەمەڕ ئەم مەسەلەیەوە بیر بکەمەوەو پاشان وەڵامت بدەمەوە. ئەمەی گوت و چوە سەرەوە، چونکە سەرمێزی نانخواردنەکە پڕ بوو لە قوتوو و کارتۆن و جێگەی نانخواردنمان نەبوو، نانمان لەچێشتخانەکەدا خواردو لەسەرماندا هەڵدەلەرزین. هەردووکمان بێدەنگ بووین، هیچمان نەدەگوت. ویستم قاپەکان لا ببەم کە ئەویش دەستی برد بیانشوات، بەرم پێ گرت و گوتم:

داوات لێدەکەم ئەم کارە نەکەیت! قسەکەم پاڕانەوەی پێوە دیار بوو. سەیرێکی کردم و دەیویست شتێك بڵێ، بەڵام پەشیمان بۆوەو قاپەکانی نایە ناو قاپشۆرەکەوەو چێشتخانەکەی بەجێهێشت. مامۆستا تا کاتی خۆرئاوابوون لەژوورەکەی خۆیدا مایەوەو قوتووەکان بەهەمان شێوە لەناو هۆڵەکەدا مابوونەوە. کاتی نانی ئێوارەش وشەیەك لەنێوانماندا ئاڵوگۆڕ نەکرا، بەڵام کاتێك ویستم بڕۆم بنووم، گوتی:

تکایە چەند خولەکێك دانیشە. دانیشتم و چاوم لەزاری بڕی. جگەرەیەکی داگیرساندو لەکاتێکدا کەسەیری بازنەی دووکەڵەکەی دەکرد، پرسی:

ئایا لەبارەی سامۆئیلەوە ڕاستت گوت؟ ئایا ئەو بەڕاستی ژنی هەیە؟ گوتم:

بەڵێ، ئەگەر باوەڕ ناکەیت دەتوانم سوێندت بۆ بخۆم. گوتی:

سوێندی پێ ناوێ. باوەڕم بەقسەکانتان هەیەو لەگەڵ ئەوەشدا دانی پێدادەنێم کە مەبەستمە بزانم چۆن دەتەوێت لەگەڵیدا بەربەرەکانێ بکەیت. منیش تاڕادەیەك لەگەڵ سامۆئیلدا هاوڕام کە بەپارە گەلێك کار دەکرێت. ئێستا ئەگەر تۆ دەتەوێت پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنیت زۆر باشەو فەرموو ئەمە ئەرزو ئەمەش گەز! لەخۆشیاندا وەخت بوو بفڕم و گوتم:

سوپاس. زۆر سوپا ستدەکەم کە ئەو سەنگەرەت پێدام،زەردەخەنەیك هاتە سەر لێوەکانی و گوتی:

بەڵام وەك تەڵەیەك کەڵکم لێ وەرنەگریت، لەناخەوە لەرزیم، بەڵام هیچم نەگوت و ئەو بەردەوام بوو:

من خۆم لەململانێی تۆدا هەڵناقورتێنم، بەڵام وەك ڕێنماییەك پێتدەڵێم دەبێت یەکەم هەنگاو پێت قایم دابنێیت و ڕێگا نەدەیت لەو بۆچونەی خۆت پەشیمانت بکەنەوە. گوتم:

لە مەبەستتان تێدەگەم. بەیانی زوو هەموویان دەنێرمەوە. بەوردی سەیرێکی کردم و پرسی:

بەڕاستی ئەمانەت ناوێن، گوتم:

نەخێر... نامەوێن. لێرەدا هەموو شتێکی پێویستم هەیە. پێکەنی و گوتی:

لەئێستاوە تا بەیانی ماوەی بیر کردنەوەت هەیە، ئەگەر ڕاکەتان گۆڕی، دەتوانی بیانهێڵیتەوە. من ڕەزایەت دەدەم کە ئەم ژوورە خاڵی بکەیت. وا هەست دەکەم سێ ژوور وهۆڵەکە بۆ شتەکانی تۆ بەس بێت. گوتم:

وانازانم بۆچوونم بگۆڕم، بەڵام سوپاسی پێشنیارەکەتان دەکەم. کاتێك تەنهابووم بۆچوونەکەی مامۆستام پەسەند کرد کە پێی وابوو نابێت بهێڵم ئیرادەیان بەسەرمدا

بسەپێنن وبەیانی کاتێک مامۆستا لەماڵ چووە دەرەوە، تەلەفۆنم کردو شتەکانم بۆ ماڵی باوکم گەڕاندەوە. ئەوکات تەلەفۆنم لەگەڵ دایکمدا کردو گوتم:

چونکە شوێنمان نەبوو وا شتەکانم ناردەوە. بەتورەییەوە گوتی:

یانی کەرەستەکانی ژیانی مامۆستا لەمانە بەنرختترن؟ گوتم:

نەخێر دایکە. باسی نرخ لەئارادا نییە، بەڵام بیرت لەوە کردۆتەوە کەئێرە ماڵی مامۆستایە نەک ماڵی من. ژیان و کەرەستەکانیش پەیوەستە بەخۆیەوە. من کابان و خاوەنی ماڵ نیم کە هەر جۆرێک دڵم بیخوازێت هەڵسوکەوت بکەم و ئەوانە تێپەڕین، مامۆستا هەموو جۆرە کەلوپەلێکی ئاسوودەیی هەیەو پێویستی بەگۆڕینیان نییە. ئاهێکی هەڵکێشاوگووتی:

بەڵام هیچ تێدەگەی کە بەم کارەت چەندە سامۆئیل بێزار دەکەی؟ تۆ لەڕاستیدا هەڵەت کردووە. گوتم:

ئێوە لەناردنی ئەم شتانەدا بەهەڵەدا چووبوون، دەبوو سەرەتا لەگەڵ خۆمدا قسەتان بکردایەو پاشان دەستتان بۆ ئەم کارە ببردایە، خۆتان کارەکەتان تێکداوە و دەبێ هەرخۆشتان باجەکەی بدەن. گوتی:

بۆچی؟ هیچ جێگایەک لەماڵی مامۆستادا نەبوو تا ئەوانەت بەمجۆرە نەناردایەتەوە؟ گوتم:

باوەڕ بکە لێرەدا جێگەیەکی بەتاڵ نییە. ئێستا هێندە کەل وپەلی زیادە هەن کەمامۆستا دەیەوێت زۆربەیان ببەخشێت. دایکە گیان تکایە جارێکیتر کارێکی وانەکەیت کە ببێتە هۆی شەرمەزاری من لای مامۆستا. ئاهێکی تری هەڵکێشاو گووتی:

تۆ دەبوو هەموویانت پیشانی مامۆستا بدایە. لەوانە بوو هەڵوێستی بگۆڕێت و... گوتم:

دایکە مامۆستا هەموویانی بینی. لەبیرتچوو کە شەوی کریسمس هات بۆ ماڵمان؟ بەڵام ئا دایەگیان! باوەڕ بکە مامۆستا هەرگیز لەگەڵ کەل وپەلی نوێ و مۆدێرندا نێوانی نییەو بەبوونی خۆی قانعە. بەڕووکەش ڕازیم کردبوو. پاش داخستنی تەلەفۆنەکە ڕۆیشتم تاکوو بەکارەکانم ڕابگەم. کاتێک ویستم نەوت بکەمە زۆپاکەیەوە، پێم نایە ژوورەکەیەوەو سەرم

سوڕما. هەموو شوێنێك پاكوخاوێن بوو. تەختە خەوەكەی رێكوپێك و چەرچەفەكەی بەڕێكی بەسەردا كێشابوو، شپرزەیی بەتەواوی لەبەین چووبوو، سەرم لەژووری كارەكەیدا، ئەویش لەخاوێنیدا دەبریسكایەوە. بەخۆم گوت:

دەیەوێ وا نیشان بدات كە پیاوێكی رێك و پێكە. بەگەڕانەوەی سامۆئیل بۆ دەرەوە، كێشمەكێشی ئێمە كۆتایی هات و من لەجەنگی دوو بەرەدا لەیەكیان ڕزگاربووم، ئیتر بەئاسوودەیی دەمتوانی بەمامۆستا ڕابگەم، بەڵام بێئاگا لەوەی كە دایك و باوكم، بۆ زەماوەندی من لەگەڵ سامۆئیلدا رێككەوتبوون و ئەو رۆیشتبوو تاكوو پێشەكی كارەكەی رێكبخات.

"٧"

شەوێکی ساردی زستان مامۆستا بەکتێبە تازەکەیەوە خۆی بەژووردا کردو کتێبەکەی لەسەر مێزی تەنیشت تەلەفزیۆنەکە داناو ڕۆیشت بۆ ئەوەی خۆی بگۆڕێت. کتێبەکەم هەڵگرت وسەیرێکی بەرگەکەیم کردو پاشان لاپەڕەی یەکەمم خوێندەوە. کاتێک هاتە خوارەوە هەروا خەریکی خوێندنەوەی بووم، بەهۆی بڵاوکردنەوەی ڕۆمانە تازەکەیەوە پیرۆزباییم لێکرد. بەبێ فیزییەوە سوپاسی کردم. لەکاتێکدا کە پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە گوتم:

هیوادارم ئەم ڕۆمانەش وەك ڕۆمانەکانی پێشووت نایاب بێت. پرسی:

بۆچی تۆ ڕۆمانەکانی دیکەمت خوێندۆتەوە؟ گوتم:

هەر یەکەیانم چەندینجار خوێندۆتەوە. کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نیشان نەدا. گوتم:

ئەتوانم ئەمەش بخوێنمەوە؟ گوتی:

بێگومان. پاشان پرسی:

زیاتر ئارەزووی چ جۆرە کتێبێك دەکەیت؟ گوتم:

عاشقی ڕۆمانم و هیچ شتێك هێندەی خوێندنەوە بەلامەوە چێژی نییە.

- زیاتر ئارەزووی نووسراوی نووسەرە ئێرانییەکان دەکەیت یان بیانییەکان؟

- جیاوازی نییە، بەڵام نووسەرە ئێرانییەکان بەلامەوە باشترن.

- کامەیان؟ دەیویست قسەم لێ دەربهێنێت. گوتم:

- سادقی هیدایەت. گوتی:

نووسەرێکی چاك بوو. خوای لێخۆش بێت، چ نووسینێکیانت زیاتر پێ خۆشە؟ وتم:

هەموویانم خوێندۆتەوەو هەر یەکەیان بەجیاواز سەرنجی ڕاکێشاوم. کاتێك دەڵێت: ئایا قسە لەهاوتەمەنی کردن کە وەك سێبەرێکی ناپەسند لەهیچ شوێنێك دەستمان لێهەڵناگرێت و بەردەوام بەخەندە، خەندەی ژەهراوی و تانووت لەگەڵمان هەنگار هەڵدەگرێت"سەر گوزەشتەیەك نییە بۆناسینی ژیانی ڕاستەقینە؟ ئایا ئەمە گەوجی نییە کە خۆمان فریو بدەین؟ ئەم قسەیەی هیدایەت هەمیشە لەگوێمدا دەزرینگێتەوە: خۆفریودان. ئایا ئێمە هەر بەڕاستی خۆمان فریو دەدەین. وەڵامی نەدامەوەو کتێبەکەی هێناو دایە دەستم و گووتی:

وەڵامەکەت لەم کتێبەدا دەستگیر دەبێت. ئەمە بەوردی بخوێنەرەوە، بەڵام ئەوشەوە خوێندنەوەی خودی مامۆستا بەلامەوە لەخوێندنەوەی کتێبەکە گرنگتر بوو. لەبەر ئەوە دانیشتم و هەرلەوێدا لەسەر قەنەفەکە خەوم لێکەوت. کاتێك بەئاگا هاتم، لەوە ئاگادار بووم کە مامۆستا بەبەتانییەك دایپۆشیووم. سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد، چەند خولەکێکی زیاتر نەمابوو بۆ کاتژمێر ١٢. ویستم هەستم، بەڵام هێشتا خەوم دەهات. کزەبایەکی سارد کە لەژێر دەرگای هۆڵەکەوە دەهاتە ژوورەوە، ببووە هۆی ئەوەی کە ڕێزی جێگە گەرمەکەی خۆم لابێ و هەمدیسان بخەومەوە! زەنگی کاتژمێر ٢ لێیدا. کە چاوم هەڵێنا بەبیستنی بۆنی دوکەڵی جگەرەکەی لەوە بەئاگابووم کە مامۆستا هاتۆتەوە. ئەو هات و لەتەنیشتمەوە دانیشت و پرسی:

ماندوویت؟

ـ نە.. تەنها کەمێك خەوم دێ، چونکە دوێ شەو تا بەیانی بەئاگا بووم و سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبەکەت بووم. بەسەرسامییەوە پرسی:

بۆچی کتێبەکە لەدەستتان هەڵدەهات؟

ـ نەخێر، بەڵام چۆن چۆنی بڵێم. هێندە سەرنجی ڕاکێشابووم کە نەمدەتوانی دەستبەرداری ببم و بەنیوەناچڵی بەجێی بهێڵم. هەستایەوەو گوتی:

کارێکی باشت نەکرد، ئەو جۆرە خوێندنەوە هەم زیان بەچاو دەگەیەنێ و هەم ... قسەکەم پێ بڕی و گوتم:

وە هەم کارەکانی نێومالَیش بەسەر یەکدا دەکەون و هەم مامۆستا بێ شیو دەبێت! ئەو قسانەم بەشێوازی گاڵتەوە دەربڕی، بەڵام مامۆستا ئاگاداری شێوازی قسەکردنەکەم نەبوو، چونکە گوتی:

مەبەستم شتێکی تر بوو. گوتم:

دەزانم، ویستم ... بەڵام باسەکەی گۆڕی و گوتی:

هەرچەند هێشتا خەو بەری نەداوی، بەڵام وا باشترە تا خواردنیان نەهێناوە، خۆت لەو حاڵەتە ڕزگار کەی. وەك منداڵان بەشەوق کەوتم و گوتم:

ئەی گیان! ئەمڕۆ لەچێشت لێنان ڕزگارم بوو! وەك هەڵۆ لەسەر قەنەفەکە هاتمە خوارەوەو بەخێرایی دەستم کرد بەکۆکردنەوەی بەتانییەکە. پێکەنینی دەهات، بەڵام دانی بەخۆیدا گرت و گوتی:

هەموو ڕۆژێك من میوانی تۆم، ئەمڕۆش تۆ میوانی منبە. گوتم:

لەمێژبوو چاوەڕوانی ڕۆژێکی وام دەکرد. بڕۆم سفرەکە ئامادە بکەم؟ کاتێك چوومە حەوشەکەوە بەفرێکی زۆر باریبوو کە ڕێگەی چێشتخانەکەی لێ بڕیبووم. بەدەنگێکی بڵند گوتم:

نەخشەی ئەم ماڵە هی سەردەمی دەقیانووسە! لەگەڵ ئەو هەموو جێگایەدا نەدەبوو چێشتخانەکە لەنێو ماڵەکەدا بینا بکرایە؟ دەنگی بیستم، بەڵام هیچی نەگوت. کاتێك کارم تەواو بوو، پەلەم کرد بۆ یارمەتیدانی و گوتم:

تۆ ماوەیەك بحەسێرەوە، پاشماوەکەی من ئەنجامی دەدەم. گوتی:

ئەم کارە بۆ تۆ زەحمەتە. لەکاتێکدا کە بێڵەکەم لەدەستی دەسەند، گوتم:

بەڵام من چالاکم، لەبیرت کرد وەرزشکارم؟ بەپێکەنینێك دانی پێدانا:

بەڵێ، تەواوە. لەلامەوە وەستاو سەرقاڵی تەماشاکردن بوو. بەرزکردنەوەی بێڵەکە بەلامەوە ئەستەم بوو، چونکە هەتاو بەفرەکەی تواندبۆوەو قورسی کردبوو. بەفرەکانم

فڕێ دایە ناو باخچەکەوەو کێوێکمان لەبەفر دروست کردبوو. بێڵەکەم نایە سەر زەوی و
پرچە شێواوەکەم هەڵدایە پشتمەوەو گوتم:
تەواو بوو، بەڵام دانی پێدادەنێم کە کارێکی سەخت بوو. دەنگی زەنگی دەرگای
بەرگوێم کەوت. بۆ کردنەوەی چووم و هەلم بۆ هەڵکەوت تا پرچم کۆ بکەمەوە. کاتێک
سەری بەداپۆشراوی بینم، زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:
سەری داپۆشراو لەگەڵ روخساری تۆدا نایەتەوە. وەرە تا خواردنەکە سارد نەبۆتەوە
بیخۆین. لەتەشەر و هێمای جارجارەی، لەڕق و قینی، چێژم لەهەموویان وەردەگرت و
ورد ورد زانیارییم لەبارەی سەلیقەی ئەوەوە زیاتر و زیاتر دەبوو. سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە
چەند کەسێك لەهاوڕێکانی بانگهێشت کرد بۆماڵەوە. ئەوان میوانی مامۆستا بوون، بەڵام
لەگەڵمدا راوێژی کرد کە ئایا توانای میوانداریيانم هەیە. بەسەرسوڕمانەوە گوتم:
ئەم ماڵە تایبەتە بەخۆت. بۆچی پرسیار لەمن دەکەی؟ ئەگەر وا هەست دەکەی بوونی
من دەبێتە هۆی نیگەرانیتان، تاکاتێك میوانەکان لێرەن، من دەتوانم بڕۆم بۆ بۆلای
دایکم. بەڵام ئەو لەوەڵامدا گوتی:
بەپێچەوانەوە، زۆر مەبەستمە کەلەگەڵ ئەواندا ئاشنابیت. یەکێك لەوان کچێکی
گەنجەو چەند زووتر ئێوە پێکەوە دیدار بکەن باشترە! لەترسان دەلەرزیم و زەنگێکی
ترسناك وەك دەنگی زەنگی کڵێسە لەگوێمدا دەنگی دەدایەوە. ئەو بەردەوام بوو. وای
بۆدەچم ئێوە دۆستێکی باش بن بۆ یەکتری، چونکە ئەو کچێکی باش و بەهەستە.
لەوەڵامیدا تەنها زەردەخەنەیەکم کردو دەمویست زانیارییەکی باشتر لەبارەی ئەو کچەوە
بەدەست بێنم، بەڵام شپرزەیی ڕێگر بوو، تاکوو ڕۆژ بۆوە هەزاران بیرو ئەندێشەی
جۆراوجۆر هەستیان ئازار دەدام. لەبەر ئەوەی کە دەمبینی مامۆستا بەڕاپاییەکی تەواوە
لەهۆڵی ئامادەکردنی تفاقی میوانداریيدایە، زیاتر دڵگەران دەبووم. میوانەکانیش دوو
ئافرەت و دوو پیاو بوون. ئەو کیژەی کە مامۆستا ئاماژەی پێکردبوو، کچێکی جوان بوو.
دەستی بەر مەکینەی قیمەکردن کەوتبوو. دوو پەنجەی دەستی عەیبدار کردبوو. ئەو
کچێکی هونەرمەند بوو کە بەهەمان دەستی نیگاری دەکێشا و هەر یەکێك لەکارەکانی

بەقسەی مامۆستا، شاکارێك بوون. لەو دیدارەدا بۆم ڕوون بوویەوە کە ئەویش وەك من پاشماوەی زەمین لەرزەیەو لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە من ساغ مابوومەوە، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەوەشدا کە دایك و باوکی لەدەست چوبوو، خۆیشی کەم ئەندام ببوو. لەوکاتەدا بوو کە مەبەستی مامۆستام لا ئاشکرا بوو. ئەو هاوەڵ و هاودەمێکی گونجاوی بۆ هەڵبژاردبووم تاکوو ئیتر خەمی لەدەستدانی دایك و باوکم ئازارم نەداو خۆم بەهۆکاری لەناوچوونیان نەزانم. هەر بەو شێوەیەی کە مامۆستا پێشبینی کردبوو نێوانمان بەدۆستایەتیەکی پتەو گەیشت. ئەو شەوە من گەلێك شتی لێوە فێر بووم. ئەو دەیگووت:

ژیان بێهوودە نییەو نابێت هیچ ساتێك بەبەتاڵی بەسەر ببرێت و پێی نیشان دەدام کە مرۆڤ چۆن چۆنی دەبێت بۆ کەسانی ترو خۆیشی بەرهەم هێن بێت و گەلێك شتی تر. ئەوشەوە لەبەرامبەر ئەوو قسەکانیدا چەندە خۆم بە بوودەڵە دەزانی! من نرخ و ڕێزی تەندروستیمم نەدەزانی و هەستم بە بەهای مرۆڤگەلێك نەکردبوو کە منیان لەدامێنی پڕ میهرەبانی خۆیاندا پەروەردە کردبوو. ئەو شەوە خەیاڵی فریشتە یەك چرکە لێم دوور نەدەکەوتەوە. بریا دەهات و لەگەڵ ئێمەدا دەژیا! نیوەشەو بوو، لەپشتی پەنجەرەکە وەستام و لەبەفرەکەم دەڕوانی کە ورد ورد بەرەو زەوی شۆڕ دەبوویەوەو لەدڵی خۆمدا گوتم، ئەگەر فریشتە بێتە لای ئێمە دەتوانم ژووری عەمبارەکەی بۆ ڕێك بخەم و بۆی ئامادە بکەم! بەڵام نەمدەزانی چۆن چۆنی ئەم بۆچوونەم بەمامۆستا ڕابگەیەنم، ئایا ڕازی دەبێت؟ بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی گونجاو بەسەر بەفرەکەدا هاتوچۆم دەکرد. کزەی بەفرەکە کاری لەمۆخ و ئێسقانم دەکرد. ئاگام لەوە نەبوو کە مامۆستا لەپشتی پەنجەرەکەوە سەیرم دەکات. داگیرساندنی گڵۆپی حەوشەکە سەرنجی مامۆستای ڕاکێشابوو. کاتێك بینیمی لەو هەوا ساردەدا لەنێو حەوشەکەدا پیاسە دەکەم، نیگەران بوو و پەنجەرەکەی کردەوەو بانگی لێکردم. بۆ یەکەمینجار بوو کە ناوم بەزباندا بهێنێت. بەبێ ئەوەی کەبەدوای دا شتێکی تر بڵێت. تەنها گوتی:

سادە؟ بارینی بەفرەکە بەجۆرێك توند بوو کە نەمدەتوانی بەباشی بیبینم. مامۆستا
پەنجەرەکەی پێوەدا و هاتە خوارەوەو جارێکی تر بانگی کردم و گوتی:
سادە بەم نیوەشەوو کرێوەیە لەوحەوشەدا چی دەکەیت ؟! بۆچی پۆشاکێکی
گونجاوت لەبەر نەکردووە؟ لەو کاتەدا هەستم کرد بەبێ بالاپۆش لەحەوشەکەدا پیاسە
دەکەم. بردمیەوە بۆ هۆلەکە. پەتویەکی هێناو دای بەسەر شانمدا و گوتی:
ئارەزووت هەیە هۆکاری ئەم کارەتم بۆ ڕوون کەیتەوە. سەیرێکم کرد، بەلام هیچم
نەگووت. جارێکی تر پرسیارەکەی دووبارە کردەوەو گوتی:
بۆچی لەم نیوەشەوەدا لەدەرەوەیت؟ ئەگەر شتێك ڕووی داوە، بیلێ بەلکوو بتوانم
یارمەتیت بدەم. گوتم:
رقم لەخۆم دەبێتەوە. من ساڵانێکە بەگرییەکەوە ژیانی خۆم لەناو بردووە و لەبوونی
خۆم هەلاتووم. هەر لەبەر ئەو گرێیە تا ئەم تەمەنە هاوڕێیەکی کچم نەبووە، من بەردەوام
وام هەست دەکرد کەدنیا لەگەلمدا لەجەنگ دایەو دەیەوێت لەناوم ببات. دەمویست بچمە
جەنگی هەموو خەلکییەوە. من حەزم دەکرد بەتەنها لەگەلیاندا ململانێ بکەم. دەمویست
گەلێك کار بکەم، بەلام ئەمشەو بەبینینی فریشتە تێگەیشتم کە تەنها خۆم فریوداوە،
چونکە هیچکەس لەگەلمدا لەجەنگدا نییە. مامۆستا، فریشتە منی هۆشیار کردەوە! من
کچێکی بیرکورت بووم. خۆشحالم کە بەڕێزت منت لەگەلیدا ئاشنا کردو چەند باش دەبوو
ئەگەر بمتوانییا بۆ هەمیشە لەهاودەمیەکەی سوود وەربگرم. ئەو دەبێت مالێکی گەرم و
گوڕی هەبێت، ئێمە دەتوانین ئەو جێگایەی بۆ فەراهەم بکەین.. نەیهێشت قسەکەم تەواو
بکەم لەبەردەمما دانیشت و گوتی:
ئایا دوچاری ئازاری ویژدان بوویت؟ بەلام مەبەستی من لەناساندنی بە تۆ ئەوە نەبوو،
من ویستم ببینی کە مرۆڤ لە هەموو هەلومەرجێکدا دەتوانێت بەردەوامی بەژیان بدات و
بێ هیوا نەبێت. ئەگەر دەمزانی ئەو پەیوەندییە تۆ بەم حالّ و ڕۆژە دەگەیەنێت هەرگیز
کاری وام نەدەکرد. گوتم:

بەڵام من خۆشحاڵم. باوەڕ بکە هەتا ئەو شەوە لەگەڵ مرۆڤێکی وادا ڕووبەڕوو نەبوومەتەوە. ئەو کچێکی چاك و میهرەبانە. ئەگەر دەبینیت غەمگینم لەبەر ناشنایەتی ئەو نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ناتوانم کارێکی بۆ بکەم. ئەگەر ئێوە ڕازی بن ئەو بێتە ئێرە، گەلێك چاکە. من دەتوانم ئاگاداریی هەردووکتان بکەم. شانازی پێوە دەکەم کە پەرستاری دوو هونەرمەندبم. چاوەکانی مامۆستا ماتونەبلەق تەماشایان دەکردم. دەستی گرتم و گوتی:

سادە تۆ دەزانی چی دەڵێیت؟ تۆ داوای ئەوەم لێدەکەیت کە فریشتە بێنمە ئێرەو لەگەڵ ئێمەدا بژی؟ گوتم:

بەڵێ ئارەزوو دەکەم. من و ئەو هاوتەمەنین و هەردووکیشمان بەدەست یەك دەردەوە دەناڵێنین، جگە لەوەی کە من لەزۆر ڕووەوە لەو بەختیارترم. لەوانەیە ویستی خودا بێت کە ئێمە یەکترمان ناسیوەو من ببمە پەرستاری. کێ دەزانێ؟ ڕەنگە ئەمە چارەنوسی من بێت. ئەو لەپڕدا قیڕاندی و هاواری کرد:

بیبڕەرەوە! تۆ هیچ ئاگات لەخۆت نییە کە چ داواکارییەکم لێ دەکەیت، تۆ بیر لەخۆت و فریشتە دەکەیتەوە، ئایا لەونێوانەدا بیرت لەمنیش کردۆتەوە کە چیتان لێبکەم؟ ژیان لەگەڵ دوو کچ قا...قا... پێکەنینی دەوێ! لەگەڵ تۆدا کەم گیرۆدەی دەردیسەری بووم، ئێستا دەتەوێت کەسێکی تریشم بۆ زیاد بکەیت؟ نە گیانەکەم. زۆر سوپاست دەکەم. با تا ئێرەبێ و بەس، هەرگیز بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە هەرکات من ویستم زەماوەند بکەم، چارەنووسی فریشتە بەکوێ دەگات؟ ئەو دەبێ چی بکات؟ گوتم:

ئەو کاتەش دایك و باوکم ڕازی دەکەم کە بەکچی خۆیان قەبووڵی بکەن. کەمێك کەوتە بیرکردنەوەو بەدەستە ڕەقەڵەکانی ریشی خوراندو پاشان گوتی:

چی بەدراوسێکان بڵێم؟ نە. هەر ئەوەیە کە گوتم. من بەقەت تووکی سەرم کێشەم هەیە. گوتم:

هەر جۆرێك ئارەزوو دەکەن، بەڵام مۆڵەتم بدە سبەینێ سەرێك لەماڵی باوکم بدەم و لەبارەی فریشتەوە قسەیان لەگەڵدا بکەم. من دەتوانم ئەوان ڕازی بکەم. پرسی:

ئەو کات من بەجێ دەهێڵیت؟ گوتم:

خۆتان ئەمەتان دەوێ. نەمتوانی تۆ ڕازی بکەم، بەڵام لەوان دڵنیام. جگەرەیەکی داگیرساندو گوتی:

بۆچی دەتەوێت سەرکێشانە بڕیار بدەیت؟ من دەزانم شایستەیی فریشتە زۆرزیاترە لەوەی کەلە ناو کچانی بێ سەرپەشتدابێت، بەڵام پرسیارت لەخۆت کردوە؟ ئایا ئامادەیە واز لەوێ بهێنێت و لەگەڵ تۆدا بژی؟ تۆ ناتوانی لەجێگەی ئەو بڕیار بدەیت. گوتم:

تۆ ڕازی بە. ڕازی کردنی ئەو لەسەرخۆم. مامۆستا چەند جارێك لەڕووی ئەسەفەوە سەری لەقاندو گوتی:

کاتێك دەڵێم عەجولانەو بێ بیرکردنەوە قسە دەکەی بەهەڵەدا نەچووم. وای دابنێ من ڕازی بووم، ئایا وا هەست دەکەیت یاسا ئەم ڕێگەیەم پێ دەدات کە دوو کچی گەنج بەبێ پەیوەندییەکی خزمایەتی لەماڵی خۆمدا جێ بکەمەوە؟ ئەگەر پرسیاریان کرد ئەو دوو کچەگەنجە لەماڵی تۆدا چی دەکەن، چییان وەڵام بدەمەوە؟ بە بێ بیرکردنەوە گوتم:

باشە، بڵێ خوشکمن! پێکەنی، پێکەنینێکی وەها کە بووە هۆی حەپەسانم. گوتی:

هەر بەو سادەییە، بەڵێ؟ تەنها بڵێم هەردووکتان خوشکی منن؟ زۆر باشە، ئەگەر بەڵگەیان داوا کرد چییان نیشان بدەم؟ بەدڵنیاییەوە دەتەوێت بڵێیت، ناسنامەی ساختەتان بۆ دروست بکەم، وا نییە؟ گوتم:

نەخێر، تۆ هیچ کارێك مەکە ئێمە خۆمان پێیان دەڵێین کە تۆ سەرپەرشتی ئێمەت وەئەستۆ گرتوەو هیچ نیازێکی خراپت نییە. جارێکی تر پێکەنی و گوتی:

تۆ زۆر منداڵی و قسە منداڵانەکانت دەمهێنێتە پێکەنین. ئەوان هیچکات مۆڵەتێکی ئاوا نەك بەمن، بەڵکوو بەئێوەش نادەن، پاشان لەکوێ هێندە دڵنیایت کە من دەستدرێژیتان ناکەمە سەر؟ چ کەسێك ئەو دڵنیاییەی بەتۆ داوە؟ گوتم:

خۆم! خۆم باش دەزانم کە تۆ زیانێك بەئێمە ناگەیەنیت. ئەمجارە ڕاشکاوانە گوتی:

هێندەش دڵنیا مەبە. ئەگەر تا ئەمڕۆ تاوانێکم نەکردووە هۆی ئەوە نییە کە بەردەوام بارودۆخ بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت. لەبیرت نەچێت کە من مرۆڤێکم وەك باقی

مرۆڤەکانی تر کە خاوەنی غەریزەن، لەبیرتە ساتێك پێش ئێستا لەرۆژنامەدا چ بابەتێکت خوێندەوە؟ لەوانەیە ئەمجارەیان دروستکەری ڕووداوەکە خۆمان بین. گوتم:

بەلام مەسەلەی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا جیاوازە، تۆ نە عاشقیت و نە بێ پارەش، نیگاکانی غەمگین بوون، لەژێر لێوەوە گوتی:

تۆ لەکوێ ئەزانیت؟ دڵم داخورپا. ویستم لێو هەڵبێنمەوە کە مامۆستا بەخێرایی مژڵەکەی بەجێهێشت. لەخۆشیاندا وەخت بوو بفرم! ئایا ئەو دانی بەعەشقی خۆیدا نابوو؟ لەخۆشیاندا شەقێکم لەپاڵپشتی سەر قەنەفەکە هەڵدا. پاڵپشتەکە دای لەگوڵدانە شووشەکەو شکاندی. لەدەنگی شکانی گوڵدانەکە مامۆستا جارێکی تر هاتە خوارەوەو لەنێوانی قادرمەکاندا وەستاو پرسی:

چی بوو؟ بەدەنگی بەرز قاقایەکم کردو گوتم:

هیچ! عاشق مەعشوقەکەی خۆی لەم شەوە تاریك و ساردەدا کوشت! لەقسەکانم سەری دەرنەدەکرد، بەتەواوی هاتە خوارەوەو دووبارەی کردەوە، چیت گوت؟ گوتم:

عاشق مەعشوقەکەی خۆی کوشت! سەیرێکی پاڵپشت و گوڵدانەکەی کردو ساتێك چووە خەیاڵەوەو پاشان گوتی:

بەلام من لەنێوان شکاندنی گوڵدان و پاڵپشتی سەر قەنەفەکەدا پەیوەندییەکی عاشقانە نابینم. گوتم:

تۆ لەکوێ دەزانی؟ لەوانەیە ئەو دوانە یەکتریان خۆش ویستبێت، بەلام نەیانتوانیبێت ئاشکرای بکەن. گوتی:

تۆ ئەمڕۆ گۆڕاویت و سادەکەی رۆژێك لەمەوبەر نیت، ئەگەر دەتەوێت لەمەبەستت حالیم بکەو ڕوون تر بدوێ. گوتم:

عەیبی گەورەی تۆ ئەوەیە کە چاوی دڵت نییە. جگەرەیەکی داگیرساندو لەسەر قەنەفەکە دانیشت و گوتی:

ئەمشەو بووی بەفەیلەسووف؟ گوتم:

مامۆستا پرسیارێکت لێ دەکەم، وەلامم بدەرەوە:

زمانی عەشق چییە؟ ئایا جگە لەنیگا زمانێکی تری هەیە؟ ئەی ئەوە نییە کە عاشق بەزمانی نیگا لەگەڵ مەعشوقەکەیدا دەدوێ؟ من بەباشی هەست بەوە دەکەم کە تۆ عاشق نیت، ئەگینا تێدەگەیشتی. پرسی:

لەچی تێدەگەیشتم؟ ئەوە نییە خەڵکان منیان خۆش ناوێ و لەبەر رەفتارم لێم دوور دەکەونەوە؟ ئەوە نییە ... گوتم:

بۆچی تەنها رووە خراپەکەی دەبینیت و ئاگاداری رووە باشەکەی نیت؟ بۆچی وا بیردەکەیتەوە کەسێك تۆی خۆش ناوێت؟ هەموو ئەو کەسانەی کە لەدەوری تۆن خۆشیان دەوێیت، لەخەڵکی گەڕەکەوە بگرە تادۆستان و ئاشنایان. هەموو تۆیان خۆش دەوێت و شانازیت پێوە دەکەن. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

لەوانەیە قسەکەت راست بێت. گوتم:

لەوانەیەی پێ ناوێت، بەڵکو بەدڵنیاییەوە حەق لای منە. تەنها ئەوە بەسە کە بەچاوێکی کراوەوە سەیری دەوروبەری خۆت بکەیت. ئەو کاتەی کە دڵنیا بوو، گوتی:

تۆ بەمنت گوت، چونکە عاشق نیم هەست بەڕەمزی نیگا ناکەم. تۆ خۆت چی؟ ئایا تۆ عاشقیت؟ سەرم داخست و گوتم:

نازانم. بەڵام وا هەست دەکەم عەشق جوانە وەك گوڵ، لەرۆشتندایە وەك ڕووبار، بەتینە وەك تیشکی خۆرو شیرینە وەك هەنگوین. ئەگەر رۆژێك عاشق بم، هەرگیز عاشقبوونم ناشارمەوە، بەڵکوو هاوار دەکەم تاکوو هەموو خەڵکی تێبگەن کە عاشقم. وای ئەگەر عاشق بووم!

ـ باشە چی دەکەیت؟ سەیرێکم کردو گوتم:

گیانم دەکەمە قوربانی! دانەویمەوە تاکوو پارچە شکاوەکانی گوڵدانەکە کۆکەمەوە، ئەویش یارمەتی دام. هێندە لەیەك نزیك بووینەوە کە دەنگی هەناسەی یەکتریمان دەبیست. بەدەنگێکی هێواش و لەسەر خۆ گوتی:

ئاگات لەخۆت بێت، شووشە نەچێت بەدەستتا. دەستەکانمان دەلەرزین و نیگاکانمان هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد. من بەنیگای ئەودا گەورەیی عەشقێکی شکۆدارم

دەخوێندەوە، وای بۆدەچووم کە ئێستا هاتۆتە قسە تاکوو دان بەعەشقی خۆیدا بنێت، بەڵام وەك ئاگادار بووبێت وا بوو، چونکە کارەکەی بەنیوەناچڵی بەجێهێشت و چووە سەرەوە. ئەو لە ئاشکراکردنی عەشق خۆی لادەدا. لەدڵی خۆمدا گوتم:

شکستی پێ دای. ئێستا مامۆستا دەزانێ کە خۆشت دەوێ و بەهەر جۆرێك بیەوێت هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکات.

"٨"

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کرد. سادە ئاگادار بوو گوتی:

هێشتا تاکوو شەو کاتمان بەدەستەوەیە. ئیتر شتێکی وای نەماوە بۆ گەڕانەوەی مامۆستا، هەر بەو جۆرەی کە گوتی، مامۆستا پاش ساتێکی کەم خۆی بەماڵدا کردو بەبینینی ئێمە زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوەکانی و گوتی:

ئەزیزان هێشتا هەر خەریکی گفتوگۆن؟ سادە بەرەو پیری چوو و گوتی:

من هەستم بەتێپەڕبوونی کات نەکردوەو هۆکارەکەشی ئەم دۆستە خۆشەویستەی ئێوەیە کە بەباشی تەحەمولی درێژدادڕییەکانی من دەکات! گوتم:

هەرگیز بەو شێوەیە نییەو من بەتەواوی کێشکراوی قسە خۆشەکانی ئێوە بووم. سادە بۆ بەدەمەوەچوونی هاوسەرەکەی منی بەتەنها بەجێهێشت. مامۆستا ڕووی لەمن کردو گوتی:

هاوسەرەکەم چۆن چۆنی دەبینی. ئایا بەڕاستی خۆشەویست نییە؟ گوتم:

بۆچی نا، ئەو نموونەی ئافرەتێکی تەواو و خۆشەویستەو هەم تۆش پیاوێکی بەختیاریت. گوتی:

بەڵێ بەختیارم، بەڵام ئەم بەختیارییەم بەئاسانی بەدەست نەهێناوە. گوتم:

بەڵام ئەو لەگەڵ تۆدا دەژیا،ئەمە بۆتۆ بەس بوو، ئەو کاتەی کە پەیوەندی سادەت بەرامبەر بەخۆت هەست پێکرد. پێکەنینێکی کردو گوتی:

را دەزانی هەستم نەکردبوو کە سادە منی خۆش دەوێت؟ من هەر لەڕۆژانی ئەوەڵەوە هەستم بەمەکردبوو، بەڵام گومانی ئەوەم نەدەکرد کە عەشقەکەی قووڵ و ڕاستەقینە بێت. من بەلێکۆڵینەوە لەمەڕ هەلومەرجی ژیانی خێزانی سادەو بەو قسانەی کە لەزمانی ئەنام دەرکێشابوو، هەر بەو پەرۆشیی و دڵسۆزییەی کە بۆ کارەکانی ناوماڵ نیشانی دەدا، لە چاودێرییە بێ سنوورەکانی کە بۆ تەندروستی من ئەنجامی دەدا، بەو ڕاستییە گەیشتبووم، بەڵام هەر بەو جۆرەی کە گوتم وام هەست دەکرد کیژێکی وەک سادە ناتوانێت لەگەڵ ڕەوشتی مندا بگونجێت و سەرەنجام ماندوو دەبێ و دەستبەرداری ئەو عەشق و کارانەی دەبێت و هەڵدێ، بەڵام ڕووداوی دڵتەزێن و ئەزموونە تاڵەکان پێچەوانەی ئەمانەیان سەلماند. ئەو بۆ وەفای عەشقی خۆی کێشەیەکی سەختی وەئەستۆ گرت. کەوای بۆدەچم کەم کەس ئەم توانایەی هەبێت. من نازانم سادە تا کوێی ژیانی خۆیی بۆ باس کردوویت، بەڵام حەز دەکەم تاکوو کۆتایی بەسەرهاتەکەی بەباشی گوێی لێ بگریت و پاشان بینووسی. سادە لەمنداڵییەوە ستەمدیدە بووە، تووشی لێدانێکی رۆحی وەهابیوو کە هەتا پاش باڵغ بوونیشی دەستی لەیەخەی بەرنەدا، سەردەمی منداڵی سەردەمێکە، مانەوەی شوێنەواری کارەساتێکی دڵتەزێن، پێم وانییە هەرگیز لە ویژدانی منداڵێکدا بسرێتەوەو لەو بڕوایەشدام کەوەک نەخشێکی هەمیشەیی لە ویژدانیدا هەڵدەکەنرێ. ئەگەرچی کێشەو گرفتی لاوان لەوانەیە کاریگەرییان لەسەردابێت، بەڵام ئەودیمەنەیان لادەمێنێتەوەوجارێکی تر سەر هەڵدەداتەوە. سادە زۆر هەوڵ دەدا کە ڕووداوی زەمین لەرزەکەو مەرگی دایک و باوکی فەرامۆش بکات، بەڵام لەهەر شوێنێکی دنیا زەمین لەرزە ڕوو بدات و ئەم ئاگادار بێت، لاشەی تێکشکاوی دایک و باوکی وەبیر دێتەوەو چەند کاتژمێرێك ئەژنۆی لەباوەش دەگرێ و بەپەرێشانییەوە چاو لەگۆشەیەک دەبڕێت وچەند ڕۆژێك درێژە دەکێشێت تاکوو دێتەوە سەر خۆی. ئەو ژنێکە کە هەمیشە لەژیانیدا لەگەڵ کارەساتدا ڕووبەڕووبۆتەوەو بەویستی خودا لەوکارەساتانەدا پارێزراو بووە، بەڵام بەداخەوە من نەمتوانیوە لە هیچ یەکێك لەوانەدا دەوری کارا ببینم.

مەبەستم ڕووداوگەلێکە کە لەدوای ئاشنایی ئێمە ڕوویان داوە. لێرەدا مامۆستا چووە خەیاڵەوە و چەند سانێک کشومات چاوی لەخاڵێک بڕیبوو. گوتم:

هێشتا سادە ئیشارەی بەو بەشەی بەسەر هاتەکەنەکردوە، بەڵام من سەرم سوڕ دەمێنێت کە تۆ چۆن چۆنی دەڵێیت نەتتوانیوە لەو ڕووداوانەدا هاوکاری بکەیت؟ لەگەڵ ئەوەشدا کە گوتت دەرکت بە پەیوەندی سادە کردبوو. گوتی:

زۆرێک لەڕووداوەکان هی پێشبینی کردن نین، دەنا ناویان نەدەنا ڕووداو. ئەگەر من لەهەلومەرجێکدا ئاسایی بوایەم هەستی خۆم بۆ سادە دەدرکاند. منیش ستەمدیدە بووم، بەڵام بەجۆرێکی تر. باوکم هونەرمەندێکی وێنەکێش بوو، بەرۆحێکی هەستیارو پاکەوە کە ناوبانگی گەیشتبوە دەرەوەی وڵات. ئەو بەهونەرەکەی خۆشەویستی دەکرد. شەوێک لەکۆڕێکی میوانداری یەکێک لەپیاوە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە کە بەشانازی ئەوەوە ڕێکخرابوو، هەموو هونەرمەندە پلە یەکەکانی تر لە ڕشتە جیاوازەکاندا لەوێ ئامادە بوون، لەگەڵ دایکمدا ئاشنا بوو. دایکم ئاوازخوانێکی دەنگخۆش بوو کە دەنگە زوڵاڵەکەی لەهەموو ماڵێکدا دەبیسترا. دەنگی بەتین و خرۆشی ئەو بەقەدەر دەستەکانی باوکم بەناوبانگ و خۆشەویست بوون. ئەو شەوە گۆرانییە تازەکەی بۆ شانازی باوکم گوت، لەهەمان کۆڕدا پێکەوە ئاشنا بوون تاکوو گەیشتە زەماوەند کردنیان، بەڵام زۆر بەداخەوە. تینی ئەو عەشقەیان زۆر زوو سارد بوویەوە، دایکم سروشتێکی تاڵ و ئانارامی هەبوو، بەپێچەوانەی باوکمەوە، کە پیاوێکی لەسەرخۆ و هێمن بوو. کە بۆ داهێنەری لەکارەکەیدا ئارەزووی لەژیانێکی بێدەنگ و ئارام دەکرد، بەڵام لەهەر گۆشەیەکی ماڵەکەماندا دەنگێک بەرز دەبوویەوە، چونکە هەردووکیان بەکارو هونەرەکەی خۆیانەوە پابەند بوون. بەو هۆیەوە چیتر ئامادەیی لێبووردنیان نەبوو. هەر بەو هۆیەوە زۆربەی کات گاڵە لەنێوانیاندا ڕووی دەدا، چونکە لەو کاتەدا من لەدایکببووم، ئیتر خەیاڵی جیابوونەوەیان لەمێشکیاندا وەدەرنابوو، بۆ دەربازبوون لەو بارە نالەبارە سەرئەنجام باوکم خۆی لەشوێنی کارە نەقاشییەکەیدا بەند کردو بەدەگمەن دەهاتە دەرەوە و بەزۆری پەشێو بوو. هەموو تابلۆکانی ئەو سەردەمەی باوکم نیشاندەری ئازاری دەروونی

و دڵشکانە. بەپێچەوانەی باوکمەوە، دایکم عاشقی سەفەرکردن بوو بۆ ئەنجامدانی کۆنسێرت لەشارێکەوە بۆ شارێکی ترو لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر سەفەری دەکرد. منیش زۆربەی کات تەنها بووم و بەو شتە یارییانەی کە ئەو لەسەفەرەکانیدا بۆی دەهێنامەوە خۆم سەرگەرم دەکرد. ئەوان هەردووکیان منیان خۆش دەویست و بۆ بەختیاری من هەوڵیاندەدا، بەڵام بەهۆی هەموو ئەو کێشە و ژیان وشێوازی پەیوەندییەیان، لەناخی دڵمدا هەستم بەتەنهایی دەکرد. لەسەرەتادا باوکم لەسەفەرە دوورودرێژەکانی دایکم ماندوو دەبوو، گلەیی و گازندەی دەکرد، بەڵام پاش ماوەیەك لەسەر ئەوحاڵە ڕاهات و هەریەکەیان هەوڵیان دەدا لەکاری یەکتریدا خۆیان هەڵنەقورتێنن، من لەگەڵ ئەوەشدا کەبچووك بووم، بەڵام تێگەیشتم کە باوکم لەناخەوە لەو سەفەرانەی دایکم ناڕازی نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دایکم ئاگاداری ئەم بابەتە نەبێت، وای نیشاندەدا کە لەسەفەرەکانی ئەو بەتەنگ هاتووە، چەند ساڵێك دوای ئەوە کە گەورەتر بووم دەرکم بەو ڕاستییە کرد کە شەرم دەکەم لەگوتنی. ئەودوانە بەڕووکەش بەختیارە، هەر یەکەیان بەدزی یەکترییەوە مەعشوقەی خۆیانیان پەیدا کردبوو و لەگەڵ ئەواندا دەژیان. باوکم مەعشوقەکەی لەنێو قوتابییەکانی خۆیدا هەڵبژاردبوو، دایکیشم لەگەڵ ئاهەنگسازەکەی خۆیدا پەیوەندی بەستبوو. مامۆستا جگەرەیەکی داگیرساندو گوتی:

ئەڵبەت دەبێ ئەوەش بڵێم کە لەنێوان هونەرمەندانی ئەو سەردەمەدا ئەمجۆرە ڕووداوانە شتێکی ئاسایی بوو، بەڵام بۆ من بەهیچ کلۆجێك قابیلی قبووڵ نەبووە و نییە، هەمان گرفت بە قەرەبووو نەکراوی چووە ڕۆحمەوە. بەڵێ، لەتەنهاییدا گەورە بووم و زۆرێك لەو پرسیارانەی کەلەمێشکی هەر منداڵێکدا دروست دەبێت، لای من بێ وەڵام مانەوە. من وامدەزانی پەیوەندی مرۆڤەکان تەنها تایبەتن بەڕازیکردنی جەستەی یەکترەوەو هەموو ئەو پەیوەندی و خۆشەویستییەی کە لەو نێوەدا دێتە گۆڕێ، سەرئەنجام لەو خاڵەدا کۆتایی دێت. لەپاشان منیش وەك سادە نەفرەتم دەکرد. بەڵام نەك لەهاوڕەگەزی خۆم. بەڵکو بەپێچەوانەوە نەفرەتم لەهەموو ژنێك دەکردو ئەوانم وەك

ئەگەر قارەمانەکەی سەردەمی منداڵی سادە بوونەوەرێکی فریودەرو دووڕوو دەناسی. قارەمانەکانی من مورتازەکانی* سۆپەرمان بوبێت و حەزی دەکرد وەك ئەو وابێت، هیندی بوون. پڕبەدڵ حەزم دەکرد وەك ئەوان خۆم ڕابهێنم و غەریزەی ئاژەڵی لە بوونمدا وەدەرنێم. حەزم دەکرد دڵم وەك تاشەبەرد ڕەق بێت و بەجۆرێك بۆ هیچ ژنێك لێنەدا و ئارەزووی نەکات. دە ساڵ تەمەنم بۆ ئەم کارە تەرخان کردو خۆم ڕاهێنا. بۆ هەموو شوێنێك سەفەرم کردو لای مامۆستایانی ناوداری ئەم ڕاهێنانە زانیاریم وەرگرت، چونکە سەرکەوتوو بووم، شانازیم بەخۆمەوە دەکرد تا ئەوە بوو سادە هاتە ناو ژیانمەوەو منی لەو قەڵا بەرزەی شانازییەدا هێنایە خوارەوەو بەئەرزی دادام. لەوکاتەدا هەستم کرد کە تەواو نیم. فێڵبازی و حازرجوابیەکانی ئەو، غەریزە سەرکوتکراوەکانمی هێنایە جۆش و تامەزرۆی کردم کە لەسفرەوە دەست پێ بکەمەوە. فێربوونەکانی من لەبەرامبەر چاوە بێباکەکانی سادەدا هەر وەك بڵقی سەرئاو لەناو چوون. ئەگەر سادە وەك باقی کچانی تر بوایە لەوانە بوو بمتوانیبا تا ئێستاش هەر گۆشەگیربم، بەڵام ئەو لەگەڵ هەموویاندا جیاواز بوو. من دامەزراویم لەبەرامبەر کچێکدا لەدەست دا کە هیچ خەسڵەتێکی ژنانەی تێدانەبوو، دڵە ڕەقەکەم لە ئاوانەی عەشقی کچێکدا بوو بەمێو کە باشتر لەکوڕان سەرپێیی لێدەداو بەفری تۆپەڵ دەکرد. سادە کتێبێکی سەیر بوو کەهەر ڕۆژەی شتێکی نوێم تێدا دەدۆزییەوە، هەر ئەو جوڵەو ڕەفتارانەی ئەو بوو کەفێربوونی دەساڵەمی دا بەدەم باوە! نازانم ڕووداوی پاڵپشت و گوڵدانەکەی بۆ باس کردووی یان نە؟ بەلەقاندنی سەرم بەڵێم نیشاندا و ئەو بەردەوام بوو:

من ئەگەر لەو ساتەداو لەو حاڵەدا چەند خولەکێك زیاتر بمامایەتەوە، دانم بەعەشق و خۆشەویستییەکەی خۆمدا دەنا. من عاشقی بووم، بەڵام عاشقی لاشەو جوانییەکەی نەبووم. نازانم لەمەبەستم حاڵی دەبی؟ ئەو شەوە تاکوو بەیانی چاوم بەیەکدا نەناو بیرم لەسەرەنجامی کارەکە دەکردەوە. من سادەم دەویست، بەڵام بەبێ ویستێکی ئاژەڵی!

---

* ئەو مرۆڤە سۆفی ئاسایانەی لەهیندستان دەژین وکاری نائاسایی و پاراسایکۆلۆژی دەکەن. وەرگێڕ

دەمویست ئەو بەسەرمدا هاوار بکات، بقیژێنێ، ڕەخنە بگرێت و چی بلێم فوتبۆلێن بکات و هەتا بۆ زۆرانبازی و بۆکسێنیش بانگهێشتم بکات، بەلام دەترسام کە ئەو منی بەو شێوە نەوێت و وازم لێ بێنێ. کاتێک ڕۆژ بوویەوە چاوەڕوانی ئەوە بووم کە بەتەلەفۆن بۆ نانی بەیانی ئاگادارم بکات، بەلام وای نەکرد. کەمێکی تر ئارامم گرت، پاشان بەیەکجاری دڵم داخورپاو بەخۆم گوت:

ناشێ وازی لێهێنابێت و ڕۆیشتبێت؟ لەو بیرکردنەوەیە گیانم هاتە لەرزین، ویستم هەستمەوەو سەیر بکەم ئایا کارێکی وای کردوە؟ بەلام دانم بەخۆمدا گرت تاکوو ئاگادار نەبێت! ئەگەر ئەو کارەی کردبێ نابێ بەلامەوە گرنگ بێت، ڕۆیشتوە با بڕوا! ئیتر ململانێ کۆتایی پێهات. مەگەر تۆ نەتدەویست کارێک بکەیت کەلە ماڵەکەتدا بڕوات؟ ئێستا ئەو لەپێش بەئەنجام گەیاندنی کارەکەی تۆدا ڕۆیشتووەو لەکۆڵت بۆتەوە. چەند خولەکێک درێژ بووم و چاوم لەسەقفەکە بڕی، بەلام لەناکاو لەجێگەکەم دەرپەڕیم و بەپرتاو بەرەو لای قادرمەکان چووم کە وەخت بوو لەقادرمەکاندا هەڵاوێم و سەرم وەعەرز بکەوێت. هەموو شوێنێک کش و مات بوو، نەموێرا دەرگای ژوورەکەی بکەمەوە. بەرەو لای چێشتخانەکە هەنگاوم ناو لەسەر بەفرەکە خلیسکام و دام بەزەویدا، تەنها کاتێك مێزی نانخواردنەکەم بەئامادەکراوی بینی، هەناسەیەکی ئاسوودەییم هەڵکێشاو دڵنیابووم کە جێی نەهێشتووم. بەبێ حاڵی لەسەر کورسییەکە دانیشتم و بەو ڕاستییە گەیشتم کە ناتوانم ئەو لەخۆم دوور بخەمەوە. بەبێ ئەو توانای ژیانم نەبوو، شوێن پێ بچکۆلەکەیم لەسەر بەفرەکەدا بینی. دانیشتم و ئەندازەییم گرت! بێئاگا دڵۆپ دڵۆپ فرمێسک بەسەر ڕوومەتمدا بەربوونەوە، ئەو بەشەم لەبەفرەکە هەڵگرت و لەنێوان دەستەکانمدا گوشیم و نامە سەر دڵم و بەدەنگی بەرز بەخۆمم گوت:

چۆن دەگونجێت هەم خۆشت بوێت و هەم لەدەستیشی هەڵبێیت؟ سەیرێکی چنگە بەفرەکەم کردو گوایە لەگەڵ سادەدا دەدوێم بەردەوام بووم:

ئایا ئامادەیت تا کۆتایی تەمەنت لەگەڵ پیاوێکدا بژیت کە هەرگیز دەستت لێنەدات؟ ئایا ئامادەیت وەک مەریەمی پیرۆز بەکچی بمێنیتەوە؟ پاشان بەرپەرچی خۆمم دایەوە

کە بەدڵنیاییەوە ئەو شتێکی بەمجۆرەی ناوێت، ئەو ئەگەر نامیهرەبانیت لێ ببینێت بەجێت دەهێڵێ و دەبێتە هاوسەری پیاوێك کەخۆشی بوێت و منداڵی لێی ببێت. بەفرەکەی ناو دەستم توایەوەو تك تك لەبەینی پەنجەکانمەوە بەر بوونەوە. بۆ ئەوەی خۆم لەچنگی بیری پەرتبووم دەرباز بکەم چوومە حەوشەکەوەو مرۆڤێکم لەبەفر دروست کرد، مرۆڤە بەفرینەکەی من لەشێوەی سادەدا بوو یان لەوانەیە من وام زانیبێت. بەهەر حاڵ کە کارەکەم تەواو بوو هەندێك بۆیەم هێنا و ڕەنگم کرد، پرچی، چاوو لێوەکانی، مرۆڤە بەفرینەکەی من ڕووت بوو، ڕووتییەکەیم بەلاوە باش نەبوو، شەرمەزار دەبووم، چوومە چێشتخانەکەوەو چەند پارچە پەڕۆیەکم هێناو پێچام بەدەوریدا. سادە درەنگی کردبوو، دڵم دەیویست هەرچی زووترە بگەڕێتەوەو سەیری مرۆڤە بەفرینەکە بکات. کاتێك بەنانی گەرمەوە لەدەرگاوە هاتە ژوور، خێرا هاتە حەوشەکەو لەبینینی من و مرۆڤە بەفرینەکە هەڵوەستەیەکی کردو پرسیم:

لات چۆنە؟ پەسەندی دەکەیت؟ لێی نزیك بوویەوەو بەجوانی لەروخساری ڕاما. پرسی:

ئەوە شێوەی کێیە، گوتم:

گومانت بۆ کێ دەچێ؟ شانێکی هەڵتەکاندو بەبێ دەربەستی گوتی:

نازانم، بەڵام شێوەی هەر کەسێك بێت، زۆر ناحەزو ناشیرینە. پێکەنیم و گوتم:

بەڵام ئەوە شێوەی تۆیە. چووبوە نێو چێشتخانەکەوە، نانەکانی لەسەر مێزەکە داناو بەگۆڕاوی بەرەم لام گەڕایەوەو گوتی:

چیت گوت؟ ئەوە شێوەی منە؟ مانای دەتەوێت بڵێیت من تائەو ڕادەیە ناشیرینم؟ بەتوڕەییەوە پەڕۆکانی لەپەیکەرە بەفرینەکە کردەوەو سەرنجێکی وردی ئەندامی مرۆڤە بەفرینەکەی داو گوتی:

خۆشحاڵم کەتۆ پەیکەرساز نیت، وەگەرنا ئاشکرا نەبوو پەیکەری منت چۆن چۆنی دروست دەکرد! گوتم:

هەر بەو شێوەیەی کە هەیت، بەگاڵتەپێکردنەوە بەردەوام بوو، لەدروستکردنی ئەمەدا ئاشکرایە، تورەم کردبوو. لەسەر کورسییەکە هەستامەوەو دانیشتم بۆ سەیرکردنی، بەسەرنجەوە لێم راماو پرسی:

بۆ نەخۆش نیت؟ هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو گوتم:

تەندروستیم گەلێك باشە، تەنها کەمێك برسیمە. گوتی:

ئێ! ئێستا تێگەیشتم کە بۆچی مرۆڤە بەفرینەکەتان لەهەموو شتێك دەچێت جگە لەمن! تۆ برسیەتەو برسێتیش... قسەکەم پێ بڕی و گوتم:

من ئێستاش باوەڕم وایە کە مرۆڤە بەفرینەکە شێوەی تۆیەو ئەوە پەیوەندی بەبرسێتیەوە نییە. لەقسەکەم ڕەنجا و خۆی خەریك کرد بەلەتکردنی نانەکانەوە. لەجووڵەیدا پەلەی دەکردو هەر ئەوە بووە هۆی ئەوەی کە لەکاتی ئاوی گەرمدا کە دەیکردە ناو پیاڵەوە، پەنجەی بسووتێنێت. هاواری لێ هەستا و لەبەر خۆیەوە گوتی:

من چەندە دەست و پێ سپیم. وەی خوایە گیان! دەستم سووتا. بەگاڵتەوە گوتم:

سەرەتا بڵێ وەی خوایە گیان دەستم سوتاو پاشان پێی زیاد بکە چەندە دەست و پێ سپیم. هاواری کرد:

لەجێی ئەو قسانە خوێدانەکەم پێبدە. گوتم:

بوەستە با دەرمانی سوتاویت بۆ بهێنم. دووبارە هاواری گەیشتە ئاسمان. هەستایەوەو تووڕەتر لەپێشوو خوێدانەکەی هەڵگرت و خوێی کرد بەسەر پەنجە سوورەوەبوەکەیدا. گوتم:

ئەمە چ جۆرە دەرمانێکە؟ لەجێی هێورکردنەوەی سووتاوییەکە خوێی تێدەکەیت؟

فووی لەپەنجەکانی کردو خوێ زیادەکانی پاك کردەوەو گوتی:

ئەمە ناکەن بەزاماریەوە، بەڵام بۆ سوتاوی ئاسایی باشترین دەوایە. گوتم:

هیوادارم هیچ کەسێك بەفەرمانی پزیشکی تۆ کار نەکات، چونکە ئاشکرا نییە چ پێشهاتێکی دەبێت! بەتوڕەییەوە خوێدانەکەی بەتوندی تێگرتم و منیش خۆم لاداو لەچێشتخانەکەوە ڕامکردە دەرەوە. دەمزانی تاکوو خەشی خۆی نەڕێژێ دەست

هەڵناگرێت. بەدوامداهات و لەمرۆڤە بەفرینەکە چنگێ بەفری چڕی و بەتوندی بەرەو ڕووم هاویشتی. هاوارم لێکرد بەفرەکە ڕەنگ کراوە! بەڵام ئەو بێ گوێ پێدان لەسەر کارەکەی خۆی بەردەوام بوو. کاتێك تووڕەبوونەکەی هێور بوویەوە، دەستی ئەو جلەکانی من سەیرێك بوون بۆ خۆیان. هەردووکمان لەڕواڵەتی یەکتری دەستمان بەپێکەنین کردو وازمان لەو شەڕە بەفرە هێنا. گوتم:

سەیرکە چیت لەجلەکانم کردوە؟ گوتی:

شایستەی ئەوە بوویت تاکوو بەخۆتدا بێیتەوەو چیتر نەمکەیتە گاڵتەجاڕی خۆت. من پیاوێك بووم، بەڵام لەبەرامبەر ئیرادەو خواستی ئەودا خۆم بەدەستەوەدابوو. بێئاگا ئەو کارانەی کە ئەو دڵی دەیەویست ئەنجامم دەدا، هەموو خۆبەدەستەوەدان و خۆبەلاوازنیشاندانێکم لەبەرامبەر ئەودا ئەوەی دەردەخست کە ئەو ململانێیەکەی بردۆتەوەو من بێهودە خۆم ماندوو دەکەم. دەمەوێت بڵێم ئەو کارانەی کە من دەمکردن تەنها لەعاشقێکی دۆڕاو وبەزیو چاوەڕوان دەکرا بێتە بوون. عاشقێك کە هەرچەند خۆشەویستەکەی خۆی خۆش بوێت، هێشتا ڕازی نابێت مەعشوقەکەی بیکاتە بووکڵەی منداڵان، من تا ئەو ڕادەیە عاشق بووبووم کە ئەو بەئاسانی دەیتوانی ویستی خۆی بەسەرمدا بسەپێنێ، تەنها کاتێك پەیم بەو ڕاستییە برد کە ئیتر درەنگ ببوو، بۆ ئەوەی هەستم بریندار نەبێت و ئەو تێنەگا تا چ ڕادەیەك کاری تێکردووم، بەجۆرێك خۆم دەردەخست! ئەویش لەشێوەی پیاوێکدا کە پێش ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەودا هەمبوو. پیاوێکی توندو سارد. کاتێك ئەو شەوە سادە گوتی:

تۆ عاشق نیت ئەگینا نیگاکانت ڕازی دەروونتیان ئاشکرا دەکرد خۆشحاڵ بووم. بەخۆم گوت:

تا ئێستا ئەو هەستی نەکردووە کە تا چ ڕادەیەك وردو خاشی کردووم. پاش ماوەیەك ئەو ئومێدەم گۆڕا بەنائومێدی. ڕۆژگارێك هاتە پێشەوە کە لەکارێك قەدەغەم دەکرد، بەڵام ئەو بەپێچەوانەی قسەکەی منەوە دەجووڵایەوە، ئەو کاتە بوو کەلە نێوانماندا پرتەو بۆڵە ڕوویداو پێکەوە چەند ڕۆژێکمان بە ڕقەوە بەسەربرد. ئەو بەردەوام ڕۆژانی

یەکشەممە بۆ مەراسیمی پاڕانەوە دەڕۆیشتە کڵێسەو منیش تاکوو دەگەڕایەوە خۆم بە نووسینەوە سەرقاڵ دەکرد، بەڵام هەر کە دەگەڕایەوە، ئیتر توانای نوسینم نەدەبوو، پێنوس و پەڕاوەکەم دەنایە لاوەو بۆ ئەوەی لەتەنیشتی دابم شتێکم دەکرد بەبەهانە. بۆ ئەوەی بچمە خوارەوە خۆم خەریک دەکرد. ئەو بێئاگا لەفشاری دەروونیم سەرقاڵی کاری خۆی بوو، هیوام بەخۆم دەدا کە بەزوویی بەلامەوە ئاسایی دەبێت، بەڵام چ هیوایەکی پووچ! من هێندە لەماڵدا بەبوونی ئەو عادەتم گرتبوو کە ڕۆژێکی یەکشەممە لەکاتێکدا سادە خۆی بۆ ڕۆیشتنی کڵێسە ئامادە دەکرد، ڕووم تێکردو گوتم:

دەتەوێت بڕۆیت؟ ئایا خواردنت بۆ نیوەڕۆ ئامادە کردووە؟ ئەم قسەیەم بووە هۆی سەرسوڕمانی ئەوو گوتی:

بۆچی ئەمڕۆ لەماڵدا دەمێنیتەوە؟ گوتم:

بەڵێ، گەلێک کارم هەیەو کە بەنیوەناچڵی ماونەتەوەو دەمەوێت تەواویان بکەم. گوتی:

کێشەیەک نییە. پاش نیوەڕۆ دەڕۆم. من هەموو ڕۆژێکی یەکشەممان سەرەتا دەچمە ماڵی باوکم و پاش نیوەڕۆ دەچم بۆ کڵێسە، بەڵام ئەمڕۆ دەتوانم ڕاستەوخۆ بڕۆم. گوتم:

لەوانەیە دوانیوەڕۆ میوانمان بێت. واباشترە ئەمڕۆ لەماڵ دەرنەچیت. بەنابەدڵی جانتاکەی نایە سەر مێزەکەو گوتی:

هەر جۆرێك ئارەزوو دەکەیت. منیش بۆ ئەوەی کۆتایی بەو قسەو باسانە بهێنم چوومە ژوورەکەی خۆم. هێشتا کاتژمێرێك تێنەپەڕیبوو دەنگی دەرگاکە هات، بەپرتاو هاتمە خوارەوەو بینیم خواردنی ئامادە کردووەو لەدەفتەرەکەدا نوسیویەتی "خواردنەکەتان ئامادەیەو من هەوڵ دەدەم تاگەیشتنی میوانەکان بگەڕێمەوە"و ڕۆیشتبوو، ئەوکارە سەربەخۆیانەی ئەو بوە هۆی توڕەیم و بەخۆم گوت: سەیرم کە من لەبەر خاتری ئەو لەماڵدا ماومەتەوە، بەڵام ئەو منی جێهێشت و ڕۆیی. وام هەست دەکرد شوێنمان لەگەڵ یەکتریدا گۆڕاوە، ئەو پیاوی ماڵەو منیش جێگەی ئەوم گرتۆتەوە. ئەوە بوو کەلەماڵ دەرچووم درەنگانێك گەڕامەوە. ئەو ڕۆژەش ئەو کارەم کرد، شەو دەرەنگانێك کاتێك

گەڕامەوە بینیم لەسەر قەنەفەکە خەوی لێکەوتووەو هەموو شتێکیشی بۆ میوانداری ئامادە کردووە، ورد ورد دەچوومە سەرەوە کە پرسی:

ئەی میوانەکان لەکوێن؟ من کە دەستەپاچە ببووم، ناچار بووم درۆ بکەم:

چونکە ترسی ئەوەم هەبوو تۆ درەنگ بکەویت، لەبەر ئەوە لەدەرەوە میواندارییم کردن. پرسی:

نانی ئێوارەت خواردوە؟ برسیم بوو، بەڵام گوتم:

بەڵێ، لەگەڵ دۆستەکانمدا نانم خواردوە. پاشان بەخێرایی شەو شادم کردو چوومە ژوورەکەی خۆم. لەبرساندا خەوم لێنەدەکەوت، سەرئەنجام نیوەشەو ئارامم لا نەمابوو، هێواش هێواش لەقادرمەکان هاتمە خوارەوەو خۆم بەچێشتخانەکەدا کرد. لەسەر غازەکە قابلەمەیەک چێشتم بینی بەپرتاو دەستم کرد بەخواردن. لەناکاو دەنگی پێی سادەم بەر گوێ کەوت کە بەهێواشی بەرەو چێشتخانەکە دەهات. پاروویەک لەگەروومدا گیرا! ئەو هاتە ژوورەوەو بەسادەییەکەوە گوتی:

مۆڵەت بدە بۆتی گەرم بکەمەوە، وەک ئەوەی دڵم تێک هەڵبێ، پاروەکەی ناو دەمم بەزۆر فڕێ داو گوتم:

نەخێر، پێویست ناکات. نازانم بۆچی برسیم بووە؟ لەکاتێکدا کە ئەمشەو لەهەموو شەوێك زیاترم خواردبوو. گوتی:

نانی دەرەوە بەتەواوی مرۆڤ تێر ناکات، هەر لەبەر ئەوەشە کە برسیت بوە، ئەگەر شتێکت پێویست نییە، با بڕۆم بنووم. گوتم:

نا، بڕۆ بحەسێرەوە، لەبەرئەوەی کە بوومە هۆی بێدارکردنەوەت داوای لێبوردن دەکەم. گوتی:

پێویست بەلێبوردن ناکات، منیش سەرقاڵی خوێندنەوە بووم. شەوت شاد.

وەڵامم دایەوەو ئەو چووە ژوورەکەی خۆی. ئیتر ئارەزووی نانخواردنم نەبوو، چونکە حەزم نەدەکرد لەکاتی نانخواردندا غافڵگیرم بکات. ئەو یاری پشیلەو مشکە زۆر وەپێش دەهات و زۆربەی کاتەکان من ریسوا دەبووم و ئەو دەستی دەخوێندمەوە.

گوتم کە ئەو لەگەڵ هاورەگەزەکانی خۆیدا جیاوازییەکی زۆری هەبوو. ئەو گەلێك هۆشیارو زیرەك بووو بەئاسانی دەیتوانی نهێنیەکانی ناخی دۆستانی خۆی لەجووڵەو قسەکردنیاندا هەست پێبکات. هەر بەو هۆیەوە هێشتاش سەرم لەساموئێل سوورمابوو کەچۆن چۆنی توانی فریوی بدات. گوتم:

ساموئێل؟ زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

لەبارەی ئەو کارەساتەوە باسادە خۆی بۆت باس بکات. من تەنها شتێك کە پەیوەندی بەخۆمەوە هەیە، بۆت ڕوون دەکەمەوە.

یەکشەممەیەکی تر، سادە خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕۆیشتن و منیش بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕام تاکوو لەڕۆیشتنەکەی پەشیمانی بکەمەوە، بەهانەی خواردن و میوان ئیتر کۆن ببوون، چونکە ئەو هەموو شتێکی ئامادە دەکرد، لەناکاو بیرێك بەمێشکمدا هات، لەکاتێکدا کە سەیری ئەوم دەکرد، پرسیم:

سادە ئەگەر پیاوێکی موسڵمان ڕۆژێك بێت بۆ داخوازیت ئامادەیت موسڵمان ببیت؟

بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

پرسیارێکی قورسەو من هێشتا بیرم لەمە نەکردۆتەوە. مەگەر نابێت کە دوای زەماوەند هەرکەسەو لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە؟ گوتم:

نەخێر، ناگونجێت، هاوسەری پیاوی موسڵمان بێگومان دەبێت موسڵمان بێت. کەمێك دۆش داماو پاشان گوتی:

پیاوەکە چی؟ ئایا ئەو ناکرێ ببێت بەمەسیحی؟ گوتم:

نەخێر، ئەوەش نەشیاوە. دانیشت و کەوتە بیرکردنەوە. لەپاش چەند ساتێك بێدەنگی سەری هەڵبڕی و گوتی:

ئاشکرایە کە لەخودای تاقانە زیاتر هیچ خودایەکی تر بوونی نییە، جا کە ئێستا خودای هەردووکمان یەك خودایەو هەموومان بۆ بەندایەتی کردن ڕوو لەیەك لا دەکەین، ئیتر چ جیاوازییەك لەنێوان موسڵمان و مەسیحیدا هەیە؟ من وا هەست دەکەم کەبەهەر جۆرێك بێت دەبێ گوێڕایەڵ و سوپاسگوزار بین. مەگەر جگە لەمە شتێکی تر هەیە؟ ئێمە

دەبێت هەوڵبدەین مرۆڤگەلێکی شیاوو خۆپارێز بین. ئەگەر ئایینی ئێوەش ئەمە بڵێ ئامادەم موسڵمان ببم. گوتم:

بەڵام ئەرکی ژنێکی موسڵمان لەبەرامبەر هاوسەرەکەیدا گەلێك سەختەو هیچ ژنێك ماف ئەوەی نییە لەژێر ئەوبارەدا دەرچێت. گوتی:

ئەگەرچی نازانم مەبەستت لەچ جۆرە ئەرکێکە، بەڵام ئەگەر موسڵمان بووم زۆر ئاسانە کە هەموو یاساو رێساکانی جێبەجێ بکەم. بەگاڵتەوە گوتم:

دەزانیت کە لەئایینی ئێمەدا ژن ماف ئەوەی نییە بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەکەی لەماڵ بچێتە دەرەوە؟ ئەگەر پیاو بیەوێت هاوسەرەکەی لەلایدا بمێنێتەوە، ژن رێگەی پێنادرێت لەماڵ بچێتە دەرەوە. وەك نموونەیەك وای دابنێ کە تۆ موسڵمان بوویت و منیش هاوسەری تۆم و ئێستا دەتەوێت لەماڵ دەرچی، بەڵام من نامەوێ بەتەنها بمێنمەوەو بەتەنهاش نان بخۆم. بەتۆ دەڵێم نابێت لەم ماڵە وەدەرکەوی! تۆ چی دەکەی؟ سادە لەبری وەڵام پرسی:

ئەگەر کارێکی گرنگ و پێویست و رۆحیشم هەبێت، ئەو کات چی؟ هێشتا هەر رێگەم پێنادرێ؟ گوتم:

نەخێر! بەهیچ مەرجێك بەبێ مۆڵەتی مێرد لەماڵ دەرچوون قەدەغەیە. بێگومان ئەم بابەتەش پەیوەندی بەرێککەوتنی ژن و مێردەکەوە هەیە کەلە پێشدا لەسەری رێکدەکەون. بەڵام بەگشتی ژن ئەم رێگەیەی پێنەدراوە. نیگایەکی درێژو قووڵی تێبڕیم و لەکاتێکدا کە خەندەیەك چرۆی زاری کردەوە، گوتی:

ئێستا بڵێ بزانم. مەبەستتان لەکردنەوەی ئەم باسەدا چی بوو؟ بۆچی بەنیازیت لەگەڵ کچێکی مەسیحیدا زەماوەند بکەیت؟ لەکاتێکدا هەوڵمدەدا خۆم ئارام و نەگۆڕ نیشان بدەم، گوتم:

نەخێر، مەبەستێکی تایبەتیم نەبوو تەنها دەمویست هەڵوێستتان لەم لایەنەوە بزانم، هەر ئەوە. بەپێکەنینەوە گوتی:

بەڵام من وای دەبینم کە مەبەستێکی تر هەیەو ئێوە حەز ناکەن بەتەنها لەماڵدا بمێننەوەو بەتەنهاش نان بخۆن! دەتتوانی ئەمە زۆر بەئاسایی و بەبێ پێشەکی دروست کردن بدرکێنی. گوتم:

واتە ئامادەیت لەبەر من دەست لەکڵێسە هەڵبگریت؟ گوتی:

خوداوەند لەهەموو جێگەیەکدا هەیە. من دەتوانم هەر لێرەشدا لەگەڵیدا ڕازونیاز بکەم. وێردی خۆم بخوێنم و لەیادی ئەودا بم. ئێستا کاکی موسڵمان بەخەیاڵی ئاسوودەوە لەکاری خۆت بەردەوام بە. تاکوو کابانی "تەرسا" چات بۆ بهێنێت! هەستامەوەو گوتم:

نەخێر! تۆ دانیشەو بحەسێرەوە. ئەم کارە بەمن بسپێرە، کاتێك پیاڵە چاکەم نایە بەردەمی، گوتی:

دەزانیت بیر لەچی دەکەمەوە؟ گوتم:

نە. نازانم. گوتی:

بەوەی کە دایکم جوولەکە بوو، بوو بەمەسیحی، من مەسیحیم و موسڵمان دەبم، بەڵام نازانم منداڵەکەم دەبێتە چی. گوتم:

ئەگەر ئەو موسڵمان بێت، بەموسڵمانیش دەمێنێتەوە، بەڵام وای بۆدەچم قسەکردن لەمبارەیەوە بەس بێت. ئێستا حەز دەکەیت فریشتەو عەتا بۆ ئێرە بانگهێشت بکەم؟

بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی لەم پێشنیارەم کرد. بەخۆمم گوت:

ئێستا کەسادە لەبەرمن لەماڵ ماوەتەوە، دەبێ لەگەڵ کەسانێکدا کەخۆشی دەوێن، هاودەمی بکات. من دەمبینی کە چۆن چۆنی سادە وەك پەروانەیەك بەدەوری فریشتەدا دەسووڕایەوە بۆ ئارامی و بەختیاری ئەو درێغی لەهیچ هەوڵێك نەدەکرد. لەبەر ئەوە باوەڕم کرد کە ئەو لەئایندەیەکی نزیکدا لەگەڵ فریشتە لەماڵێکدا ژیان بەسەر دەبەن: نازانم دەتوانی حاڵی ئەو ڕۆژەی من هەست پێ بکەیت یان نا؟! بوونی سادە لەماڵەکەمدا و ئەو ئولفەت و وابەستەییەی کە بۆ ئەو هەمبوو، هەر بەو جۆرە ئاشکراکردنی مەسەلەی زەماوەندو چاودێریکردنی فریشتە منیان گەیاندبوە بڕیاری کۆتایی. حەزم دەکرد سادە بخوازم، بەڵام ئەو ڕازی دەبێت کە کاری سەرنوێنی پێکەوە ئەنجام نەدەین و هەر

بەوشێوە چاوەڕوان بووم کە فریشتەش بچێتە ماڵ و مێردی خۆی، بەڵام ئەوانە بەومەرجەی کە سادە مەرجەکەم پەسند بکات. ترسم لەوە هەبوو کە قەبووڵی نەکات و بەتەنها جێم بهێڵێت. دوودڵ و نیگەران بووم. بڕیارمدا پرس وڕا بەعەتا بکەم. ئەو دۆستی من بوو. دەیتوانی هاوکاریم بکات. دووانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کاتێك فریشتەو سادە سەرقاڵی گفتوگۆکردن بوون، لەگەڵ عەتادا چووینە ژوورەکەی خۆمەوە. من پاش پێشەکییەکی زۆر لەقسەکردن کێشەی بنەڕەتیم ڕوون کردەوە. مات و بێدەنگ سەیری دەکردم. کاتێك قسەکانم دوایی هات، لەچاوەکانیدا خوێندمەوە کەسەر لەقسەکانم دەرناکات، چونکە تەنها بەگوتنی وای لێهات، کۆتایی پێهێناو بێدەنگ بوو. من چاوەڕوانی ڕێگەچارەیەکم دەکرد لەلایەن ئەوەوە. بەڵام ئەو پرسی:

ئێستا دەتەوێت چی بکەیت و چ کارێك لەدەستی من دێت؟ گوتم:

من هیوام وابوو تۆ ڕێگەیەکم نیشان بدەیت. ئەگەر تۆ لەجێگەی من بوایەی، چیت دەکرد؟ ئایا لێدەگەڕایت عەشقەکەت بەناکامی ئەسپەردە بێت، یان ڕێگەیەکی ترت دەگرتە بەر؟ ئایا پێت دەگوت کە ناتوانی لەگەڵیدا هاو خەوی بکەیت؟ گوتی:

مۆڵەتم بدە بیری لێبکەمەوە. تۆ چەند مانگێکە دانت بەخۆتدا گرتوە، چەند ڕۆژێکی تریش پەلە مەکە. من دەبێت هەموو لایەنێکی کارەکە هەڵبسەنگێنم وپاشان وەڵام بدەمەوە. گوتم:

زۆر باشە، بەڵام تکات لێدەکەم زووتر ئەم کارە بکەو من لەم دۆزەخە ڕزگارم کە، عەتا هەر بەوجۆرەی کە بەڵێنی دابوو چەند ڕۆژێك دواتر هات بۆ سەردانم و گووتی:

تۆ بەمنت گوت کە ئەگەر لەشوێنی تۆدا بوایەم، چیم دەکرد؟ وایە؟ زۆر باشە، من زۆرم بیر لێ کردەوەو دواجار بەو ئەنجامە گەیشتم، کە ئەگەر من لەو جێگایەدا بوایەم ڕاستییەکەم لەگەڵدا باس دەکرد، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە دان بەعەشقی خۆمدا بنێم، بۆچوونی ئەوم لەمبارەیەوە وەردەگرت، ئەگەر پەسندی کرد، ئەوکات خۆشەویستی و عەشقی خۆم بۆ ئاشکرا دەکرد، چونکە وای دەبینم بڕیاری کۆتایی دەبێت ئەو بیدات، کە ئایا دەتوانێت بەبێ پەیوەندی هاوخەوی لەلای پیاوێکدا بژی و هەموو تەمەنی خۆی

بنێتە پێناوییەوە؟ تۆ لەسەرەتادا نەدەبوو عەشقی خۆت ئاشکرا بکردایە، چونکە لەوانەیە ئەو لەژێر کاریگەریی هەستیدا بڕیار بدات و وەڵامی ڕەزایەتیت پێ بدات، بەڵام پاش ماوەیەک پەشیمان ودڵشکاو دەبێت، ئەو گەنجەو هەستی لەتوانای عەقڵی لەپێشترە. گوتم:

لەهەر بارێکدا بێت، جیاوازی نییە، من دەترسم کە لەپاش زەماوەند زۆر بەردەوام نەبێت و بۆ ئاخری بەتەنها جێمبهێڵێت. توورە بووو گوتی:

وەڵامی ئەو هی ژنێکەو خۆڕاگریشی سنووردارە! ئەگەر بەڕاستی خۆشت دەوێت بۆچی لای خۆتەوە بۆچوونەکەت ناگۆڕی وەک هەموو پیاوێك لەگەڵیدا زەماوەند ناکەیت؟ من دۆستی تۆم و ڕێگە بەخۆم دەدەم پێتبڵێم. مێهرزاد تۆ نەخۆشی و دەبێت لەژێر چاودێری پزیشکدا بیت! بەقسەی خۆت دە ساڵە ڕاهێنان لەسەر ئەوە دەکەیت کەلەبەرامبەر ڕەگەزی مێدا هەڵوێستێك نیشان نەدەیت و بینیت شکستت هێنا. ئەو کچە هەموو فێربوونەکانتی بەبادا، ئێستا چیتر لەسەر گومانەکانی ڕابردووت پێداگری مەکە، لەکاتێکدا بۆت ڕوون بوویەوە کە بەهەڵەدا چووی و کوێرانە هەنگاوت ناوە! وەرەو ئەمجارەیان خۆت بەجۆرێکی تر ڕێکبخەو ڕابردوو لەیاد بکە. ئێمە مرۆڤین و غەریزەکانمان سرووشتین. بۆچی دەتەوێت غەریزەو ئارەزو و چێژوەرگرتن لەخۆتدا سەرکووت بکەیت؟ ئەگەر ئەم شێوەیە ڕاست بوایە ئەولیاکانمان ئەو کارەیان دەکرد تاکوو ئێمەش لێیانەوە فێر بین. زەماوەندو لەدایك بوون وەك فەرمانێکی سروشتی و خودایی وایە کەدەبێت بەئەنجام بگەن، وەگەرنا مرۆڤایەتی هەر لەسەرەتاوە لەبەین دەچوو. ئەگەر تۆ سستییەك لەخۆتدا دەبینی، واباشترە لەپێش زەماوەندکردندا چارەسەری بکەیت. بەتوڕەییەوە نەڕاندم:

من بێتوانا نیم! بەڵام بۆچی لەمەبەستم تێناگەیت؟ من نامەوێت وەك ئاژەڵان تێکەڵاوی بکەم. نامەوێت هاوسەرێك هەڵبژێرم کە تەنها بۆ بەرزبوونەوەی نیازەکانی جەستەم بێت. گوتی:

لەپێش زەماوەنددا دەگونجێت مرۆڤ غەریزەی خۆی سەرکوت بکات، بەلام پاش ئەو کاتێك ژن و مێرد لەیەك نزیك دەبنەوە، بۆ دەربڕینی خۆشەویستی، هیچ بەربەستێك لەئارادا نامێنێت. پڕ بەدڵ ئارەزوو دەکەن دەست لەیەکتری بدەن و لەجەستەو بوونی یەکتری چێژ وەربگرن. هەر لەبەر ئەوەشە کە زەماوەند دەکەن. ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەم رایەدا نیت ئیدی بۆچی زەماوەند دەکەیت؟ کاتێك ناتەوێت دەستی لێبدەیت و ناتەوێت لەگەڵیدا بنویت. ئیتر چ پێویستییەك لەو زەماوەندەدا دەبینی؟ هەر بەو جۆرە بەردەوامی بەژیان بدە. گوتم:

من رازیم، بەلام ئەو چی؟ گوتی:

ماوریێ گیان تۆ مرۆڤێکی خۆویستی. تەنانەت بوونی سادە لەماڵدا رازیت دەکات و ئەرنەوەش بەسە بۆت! لەکاتێکدا ئەگەرسادەت بەراستی خۆش دەویست لەپێش ئەوەدا کە بیر لەخۆت بکەیتەوە، بیرت لەخۆشبەختی سادە دەکردەوەو دەستت لەو بیروڕا پڕپووچەت هەڵدەگرت. من ئێستا زیاتر بەحاڵی ئەو نیگەرانم وەك لەتۆ. ئەو نازانێ کە عەشق و گەنجێتی خۆی لەبەر خۆپەسندی تۆ لەبەین دەچێت! عەتا راستی دەگوت. بوونی سادە لەماڵدا بەتەواوی بۆ من بەس بوو. هەر لەبەرئەوە نەمویست دووچاری مەسەلەی تر ببم. لەو رۆژەوە لەسەیرکردنی سادەدا خۆم دەبوارد، چونکە نەمدەویست لەنیگامدا پەرێشانییەکەم هەست پێبکات. بڕیارمدا کەمتر لەماڵدا بمێنمەوە تا بەلکو بەسەرئەم هەستەمدا زاڵ ببم و ئەو قوتابییانەی کە بۆ فێرکردنی وانەی نەقاشی گرتبوونم، بیانوویەکی زۆر باش بوو کە تا درەنگانێك نەگەڕێمەوە ماڵ، بەلام بەئاشکرا دەمبینی کەسادە رۆژ بەڕۆژ زیاتر خەمبارو بێتاقەت تر دەبوو. سادە ئیتر ئەو کچە بزێوو پڕ جوولەیە نەبوو. یان کتێبی دەخوێندەوە یان گوێی لەو کاسێتانە دەگرت کە لەرێگەی فریشتەوە بەدەستی گەیشتبوون. لەو رۆژەوەی کە پێم گوتبوو نامەوێت بچیت بۆ کلێسە، لەتاکە سەرگەرمییەکەش بێبەش ببوو. شەوێك زۆر دڵم بەحاڵی سووتا. شەوی

جەژنی نەورۆز بوو. نەمزانی کە سادە بەشێوەی نەریتی ئێمە سفرەی "حەوت سین"ی ئامادە کردووە، کاتێك درەنگانێك بۆ ماڵ گەڕامەوە، سادەم بینی کە لەتەنیشت سفرەکەوە خەوی لێ کەوتووە. سفرەکەی بەهەموو کارزانییەکی خۆی ڕازاندبۆوە. لەناو ماڵدا هیچ دەنگێك بەر گوێ نەدەکەوت و کش ومات بوو. مانگی سوور لەخەرمانەی بلووریندا بەئارامی دەسووڕایەوە. لەبینینی ئەو دیمەنە فرمێسك لەچاوەکانمەوە قەتارەی بەست و خۆمم لە بەر ئەو هەموو ناسوپاسییە بەنەفرەت کرد، لەخۆمەوە لەباوەشم گرت، تاکوو بیبەمە ژوورەکەی خۆی. لەناکاو بەئاگا هات و لەکاتێکدا کە بەئاستەم چاوەکانی دەکردەوە گوتی:

سالی تازەت پیرۆز! لەڕشتنی فرمێسك خۆڕاگریم کردو ئەوم لەسەر تەختە خەوەکەی دانا، چەند چرکەیەك چاوم لەڕوخساری پاك و بێگەردی بڕی و لەوکاتەدا دەستم کرد بەگریان. بەیانی پێش ئەوەی سادە لەخەو بەئاگا بێت، لەماڵ چوومە دەرەوە. پڕبەدڵ حەزم دەکرد لەبەر ئەو خۆشەویستییەی کە بۆمی دەربڕیبوو دیارییەکی بۆ بکڕم. هێندە لەشەقامەکاندا ئەمسەرو ئەوسەرم کرد تاکوو دوکانەکان کرانەوە. بەتەواوی شەکەت و ماندوو ببووم. بەبۆنەی یەکەمین ڕۆژی ساڵی نوێوە زۆربەی دوکاندارەکان پشوویان بوو دوکانەکانیان داخستبوو. سەرەنجام دووکانێکی زەڕەنگەریم بینیەوەو ئەو گەردنبەندەی سادە سەرنجی ڕاکێشام کە لەڕووەکەیدا هیچ شتێك هەڵنەکەنرابوو. یەکسەر کڕیم و بەرەو ماڵ گەڕامەوە. سادە سەرقاڵی کۆکردنەوەی سفرەی حەوت سین بوو. گوتم:

تکا دەکەم، ئەگەر دەکرێ واز لەسفرەکە بهێنە با وەك خۆی بێت. نیگایەکی خەماوی تێ بڕیم و گوتی:

---

* ئێرانییەکان جەژنی نەورۆز سفرەیەك رادەخەن و حەوت شتی لەسەر دادەنێن کە بە پیتی "س" دەست پێدەکات و پێی دەگوترێ سفرەی حەوت سین. بۆ نموونە مامۆستا هێمنی شاعیر دەڵێت:

*سەقزو سەردەشت و سابلاغ و سنەی کرد غەرقی خوێن*

*سێی تری ویستن گوتی بۆ سفرەی حـــەوسینم دەوێ.*

وەرگێڕ.

بەلای تۆوە چ جیاوازییەکی هەیە؟ گوتم:

جیاوازی زۆرە، ئەم سفرە ناوەنجییە خانمێکی جوان رازاندویەتیەوەو من ئەمە بەخاڵێکی چاك دەبینم و دەخوازم تا کۆتایی ساڵ سەر لەبەری ژیانم لەگەڵ جوانییەکەی تۆدا بێت. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

سوپاسی پێهەڵدانەکەتان دەکەم، بەلام ئەی بۆ دوێ شەو ئەم قسەیەت نەکرد؟ پاکەتەکەم بەرەو ڕووی درێژ کردو گوتم:

بۆ دەرخستنی خۆشەویستی و ڕێزلێنان هیچ کاتێك دێر نییە. سەیرێکی کردم و دواجار لەپاکەتەکەی ڕوانی و پرسی:

ئەمە چییە؟ گوتم:

بیکەرەوە دەزانی. هی تۆیە. گەرچی لەنرخ و بەهادا دیارییەکی شایستە نییە، کە لەشەوی کریسمسدا بەتۆیان دا. بەلام وەك دەڵێن "دیاری شوان ئاڵەکۆکە". پاکەتەکەی کردەوەو بەبینینی گەردنبەندەکە پێکەنینێکی کردو گوتی:

زۆر سوپاس، بەلام بەچ بۆنەیەکەوە؟ گوتم:

بۆ ڕێزلێنان و داوای لێبوردن. گەردەنبەندەکەی بەرەو لام درێژ کردو گوتی:

تکایە بیگرە. تۆ کارێکت نەکردوە کەداوای لێبوردن بکەیت و لەبەر ئەو کارانەش کە من لەماڵدا دەیکەم ڕێزلێنان پێویست ناکات. گوتم:

وادەزانی پێدانی دیاری سووك کردنە؟ گوتی:

بۆ نازانی کە بەخشینی دیاریش بەم شێوەیە ئیهانەیە. بەگاڵتەوە گوتم:

را دەخوازی کە لەبەردەمتدا بەچۆکدا بێم و پاشان دیارییەکەت پێشکەش بکەم. تووڕە بوو و گوتی:

نەخێر، چاوەڕوانی ئەوە نیم لەبەر دەممدا بەچۆکدا بێیت، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوە بووم بڵێیت جەژنتان پیرۆز بێت یان هیوام وایە هیچ کاتێك لەیادم نەکەیت، تەنها ئەوە! نەك بڵێیت بۆ ڕێزلێنان. ئێوە بەپێچەوانەی قسەکانتانەوە هیچکاتێك دەرك بەهەستی ئافرەتان ناکەن. ئەوەی گوت و بەخەمبارییەوە پەنای بۆ ژوورەکەی برد. منیش تورە

ببووم و لەبەیانی زووەوە تا نزیکی نیوەڕۆ سووڕابوومەوەو دیاریم بۆ کڕیبوو. ئەویش وەك شتێکی بێنرخ ڕەتی کردەوەو دایەوە دەستم. لەو کارەی کە کردبووم و لەو گەوجێتیەی خۆم هێندە بێزار بووم کە گەردنبەندەکەم لەسەر فەرشەکە بلاو کردەوەو چوومە ژوورەکەی خۆم. کاتی بانگی نیوەڕۆ جلەکانم لەبەر کردو ویستم بەرەو ریستۆران بڕۆم کە گوتی:

من چی لەم هەموو خواردنانە بکەم؟ بەتوڕەییەوە قیژاندم:

بیڕێژەرە ناو زبڵدانەکەوە. لەسەری کۆڵاندا لەگەڵ فریشتە ڕووبەڕوو بوومەوە، پاش پیرۆزبایی ساڵی نوێ پرسی:

مامۆستا لەرۆژێکی وادا بۆ کوێ دەچیت؟ گوتم:

تۆ بڕۆ ماڵەوە من ئێستا دەگەڕێمەوە. لەسەر و روخساری شێواومدا تێگەیشت کە دەبێ شتێك ڕووی دابێت. پرسی:

لەگەڵ سادەدا دەم قرەت بوە؟ سەیرێکم کرد، لەوە ئاگادار بوو کە نامەوێ وەڵامی بدەمەوە. گوتی:

عارەبانەکەم تێکچووە، دەکرێ پاڵم پێوە بنێیت؟

نەمتوانی داخوازییەکەی ڕەت کەمەوە. لەبەر ئەوە تاکوو نزیك ماڵ یارمەتیم دا. گوتی:

ئێستە کە تا ئێرە منت هێناوە، ئەو پیاوەتیەش بکەو بمبەرە ژوورەوە. دەرگاکەم کردەوەو فریشتەو عارەبانەکەیم تاکوو هۆڵەکە برد. سادە خواردنی لەسەر مێزەکە ریزکردبوو. لەباتی نانخواردن لەتەنهاییدا دەگریا. کاتێك چاوی بەفریشتە کەوت، بەخێرایی فرمێسکەکانی سڕی و لەئامێزی گرت. فریشتە بەشێوەیەك نیگای سووتێنەری تێبڕیم کە تاکوو مۆخ و ئێسقانم گڕی تێبەر بوو. ئەو بەزمانێکی شاراوە تێی گەیاندم کەمن شایستەی عەشقی سادە نیم. نەمتوانی بەرگەی ئەو شانۆیە بگرم، ویستم یەکسەرە لەماڵ بچمە دەرەوە کە فریشتە گوتی:

مامۆستا ئێمە چاوەڕوانی تۆین و تاکوو تۆش ئامادە نەبیت دەم بۆ خواردن نابەین. دەمزانی کەلەسەر بڕیاری خۆیان دەبن. بۆیە لەچوونم بۆ ریستۆران پەشیمان بوومەوەو

هەندێ شیرینیم کڕی و گەڕامەوە. بۆچوونەکەم ڕاست بوو. بینیم چۆنم مێزەکە جێهێشتووە هەر بەوجۆرە ماوەتەوە و دەستی بۆ نەبراوە، شتەکانم بردە چێشتخانەکە. سادە لەدوامەوە هات و گوتی:

ئەگەر دەکرێ ڕووی تاڵت بڕەوێنیتەوە. باش نییە فریشتە ئاگاداری دەمەقاڵەکەمانبێت. ئەو بەگوێرەی خۆی خەم و خەفەتی هەیە، گوتم:

ئەو شارەزایی هەیە، لەبەرئەوە پێویستی بەخۆنواندن نییە. من زووتر لەسادە گەڕامەوە بۆ هۆڵەکەو لەبەرامبەر فریشتەدا دانیشتم. هەوڵم دا خۆم خۆشحاڵ نیشان بدەم، بەڵام لەوە زیرەکتر بوو کە فریو بخوات. گوتی:

مامۆستا چۆن دڵت دێت سادە بڕەنجێنیت؟ بێگومان نامەوێت لەکاروباری ئێوەدا خۆم هەڵبقورتێنم. تۆ مامۆستای منی، بەڵام وەك بچوکێك پێت دەڵێم کەسادە کچێکی باش و میهرەبانە. ئەو زۆر حەساسەو ڕەنجاندنی باش نییە. گوتم:

من هەرگیز مەبەستم ڕەنجاندنی ئەو نییەو هەر وەك تۆش گوتت هەستیاربوونی خۆی دەبێتە هۆی ڕەنجاندنی. من دەبوو دوێ شەو بۆ پیرۆزبایی ساڵی نوێ زوو بگەڕامایەتەوە. بەڵام لەکوێوە بزانم کە سادە پابەندە بەمەراسیمی ئێمەوەو هەموو شتێکی ئامادە کردوە؟ کاتێك گەڕامەوەماڵ و بینم کە بەدەستووری ئێمە سفرەی حەوت سینی ڕازاندۆتەوە، لەدێر هاتنەوەم پەشیمان بووم و بەیانی زوو بۆ ئەوەی کە داوای لێبووردنی لێبکەم، ڕۆیشتم بەهەزار حاڵ دیاریم بۆ کڕی و پێمگوت بۆ ڕێزلێنان و لێبووردن، بەڵام ئەو وای هەستکرد کە دیارییەکەم لەبەر ڕێزلێنانی کاری ناوماڵ پێبەخشیوەو هەریەو هۆیەوە ڕەنجا. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

باشەبۆچی دوواجار ڕاستییەکەیت پێنەگوت و ئەوت لەتێگەیشتنی هەڵەی خۆی ئاگادار نەکرد؟ گوتم:

بۆچی ئەو بواری گفتوگۆیدا؟ دیارییەکەی بۆهەڵدامەوەو چووە ژوورەکەی خۆی. من هەر لەبەر ئەوەی یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێ دەمەقاڵە نەکەم، ماڵم بەجێهێشت و گوتم ئەو

دەبێت لەوەئاگادار بێت کە دیاری نەگێڕێتەوە! ئەوماق ئەوەی نییە دیاری ڕەت بکاتەوە. بەدەنگی بەرز قاقایەکی کردو گوتی:

مامۆستا ئێوە دووکەسن، بەتەواوی وەك دوو هاوسەری لاو هەڵسوکەوت دەکەن کەهێشتا بەرۆحی یەکتری ئاشنا نەبوون! لەتێگەیشتنەکەی ئەو سەرم سووڕماو گوتم:

مەبەستت چییە؟ گوتی:

بمبەخشە، بەڵام ئەگەر کەسێکی دیکە لەجێی مندا بوایەو ئەم ڕووداوەی ببیستایە چۆنی لێکدەدایەوە. کاتێك دووکەس تائەوڕادەیە لەجووڵەو ڕەفتاری یەکتری ڕەخنە بگرن، بەڵگەی جگە لەیەکتر نەناسین شتێکی تر نییە. ئێوە هەردووکتان هەوڵدەدەن یەکتری چاکتر بناسن هەرئەوەش دەبێتە هۆی چەند ناکۆکییەك و من وا هەستدەکەم شتێکی سرووشتییە. ئەگەر ئێوە ئارەزووتان نەبوایە هەست بەیەکتری بکەن، ئەم ڕووبەڕووبوونەوانە پێش نەدەهات. مامۆستا مۆڵەتم بدە ڕاستگۆیانە بدوێم. من هەستدەکەم ئێوە یەکتریتان خۆشدەوێت، بەڵام ناتانەوێت بیدرکێنن. گوتم:

تۆکچێکی هەستیارو هونەرمەندیتو لەمەڕ ڕووداوەکان بەچاوێکی کراوەوە ورد دەبیتەوە، بەڵام لەمبارەوەیەوە بەتەواوی لەهەڵەدای. سادە لەماڵی مندا کاردەکاتو منیش بەناچاری خاوەنکاری ئەوم، هەرئەوەو بەس! دووبارە پێکەنیو گوتی:

ئایندە هەمووشتێك ئاشکرا دەکات. بەهاتنی سادە بابەتی گفتوگۆکەمان گۆڕی. ئەو ڕۆژە فریشتە گەلێك هەوڵیدا تاکوو ئاشتمان بکاتەوە، بەڵام هەریەکێك لەئێمە حەقمان بەخۆمان دەدا کەهەرگیز ئاشت نەبینەوە. کاتێك فریشتە دەیویست بەجێمان بهێڵێت، سادە بەبێ پێشەکی پرسی:

فریشتە حەزدەکەیت لەگەڵ مندا بژیت؟ فریشتە ماتومەلوول مایەوە. پاش چەند خولەکێك بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا. سادە لەبەرامبەریدا بەچۆکدا هاتو دەستەکانی ئەوی نایە ناو دەستی خۆیو بەدەنگێکی پڕلەسۆزەوە پرسیارەکەی دووبارە کردەوە:

حەز دەکەیت بۆ هەمیشە لەگەڵ مندا بژیت؟ فریشتە سەری شۆڕ کردەوەو بەمێواشی گوتی:

نازانم چی بڵێم، تۆ منت غافلگیر کرد. سادە گوتی:

پێویست ناکات هەر ئێستا وەڵامم بدەیتەوە. لەپێشدا بیری لێبکەرەوەو پاشان بۆچوونی خۆتم پێ بڵێ، بەڵام دەمەوێ بزانی ئەگەر ڕازی بیت گەورەترین ئارەزووی منت بەجێهێناوە! فرمێسک لەچاوەکانی فریشتەدا کۆبوونەوە. ڕووخساری سادەی ماچکردو گوتی:

زۆر سوپاس بۆتۆ. بەڵام من بەم حاڵەوە ناتوانم هاودەمێکی باش بم بۆت. سادە گوتی:

ئەو شتانە هیچ گرنگ نییە، من ئامادەم تادواهەناسە خزمەتت بکەم! تەنیا داوام ئەوەیە ڕازی بیت کە پێکەوە بژین. فریشتە هێندە فشاری بۆ هاتبوو کە تەنها ئامادەبوونی من لەوێدا ڕێگر بوو کەبدا لەپرمەی گریان، لەکاتێکدا کەمەولیدەدا دان بەخۆیدا بگرێت، گوتی:

مۆڵەتم بدە بیری لێبکەمەوە. سادە ماڵئاوایی لێکردو منیش فریشتەم لەماڵ بردە دەرەوە. هێشتا نەگەیشتبووینە سەر کۆڵانەکە، کەسادە بەهەناسەبڕکێ گەیشتە لامانو ڕووی لەمن کردو گوتی:

خۆم بەئۆتۆمبێل فریشتە دەگەیەنم. کاتێک ئەودوانە لەبەرچاوم ون بوون، دڵنیا بووم کە سادەم لەدەستچوو.

"١٠"

ئەو شەوە سادە نەگەڕایەوەو بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە کاتێك نیوەڕۆ گەڕامەوە، هەموو جێیەك ئارامو بێدەنگ بوو. لەناکاو دڵم داخورپا! دەرگای ژوورەکەیم کردەوەو لەوەی کەبینیم وەخت بوو شێت ببم. سادە ڕۆیشتبوو، هەموو کەلوپەلەکانی خۆیشی لەگەڵ خۆی بردبوو. وەك دێوانەکان بانگم لێهەستاو لەکون و قوژبنی ماڵەکەدا بۆی دەگەڕام. کاتێك توانیم دان بەخۆمدا بگرم، چاوم بەنووسراوەکەی ئەو کەوت. نوسیبووی:

*مامۆستا، هیوادارم لەوەی کە منیش وەك کارەکەرەکانی پێشوو جێت دەهێڵم بمبەخشیت. لەگەڵ تەواوی خۆشەویستییەك کە بۆ تۆم هەیەو لەگەڵ ئەو وابەستەییەی کە بەماڵەکەتانەوە هەمبوو، ناچار بووم جێتان بهێڵم. ئومێدەوارم کەسێك بدۆزیتەوە کە نرختان بزانێت. سوپاست دەکەم بۆئەوەی کە چەند مانگێك مۆڵەتت دام تا لەگەڵ بەڕێزتاندا بژیم و سوود لەمیهرەبانیتان وەربگرم.*

*ئەو کەسەی کە هەرگیز لەبیرت ناکات! سادە.*

نامەکەم نایە سەردڵم و دەستم بەگریان کرد. ئەو هێندە میهرەبان بوو کە گلەیی و گازندەیەکیشی نەکردبوو. چی بڵێم، کە پاش ڕۆیشتنی ئەو چ ناسۆرێکم چەشت و چۆن چۆنی دەژیام. هێندە بەسە بڵێم وەك مردوویەك وابووم، بەڵام دەجوڵامەوەو ڕێگەم

دەکرد، قسەم دەکرد، نانم دەخوارد، دەخەوتم، بەکورتی لەو ڕۆژەگارە تاڵەی تەمەنمدا تەنها بەڕووکەش زیندوو بووم. کام ژیان؟ مردن بەلامەوە باشتربوو لەزیندوویی بەبێ سادە. ماڵ بەنەبوونی ئەو کپ‌وخامۆش بوو وەك گۆڕستان. سەیری هەر لایەکم دەکرد، ئاسەواری ئەوم بەدیدەکرد. لەهەموو لایەك شوێن پێی ئەوم دەدی. لەهەموو کون‌وقوژبنێکیماڵەکەدا بۆنی ئەوم دەبیست‌و هەموو سایەو سێبەرێکم بەسایەو سێبەری ئەو دەبینی. وام بەخەیاڵدا دەهات کە ڕۆیشتنی سادە لەماڵەکەمدا جگە لەمۆتەکەیەك شتێکی تر نییە. دڵخۆشی خۆم بەوە دەدایەوە کە ئەو جارێکی تر دەگەڕێتەوەو لەکاتێکدا کەپێدەکەنێت دەیەوێ بپرسێت:

مامۆستا! ئەمڕۆ تەندروستیتان چۆنە؟ نەمدەویست باوەڕ بکەم کە ئەوم بۆهەمیشە لەدەستچووە. هەستامەوەو جارێکی تر ژوورەکان‌و ناومالم هەموو پشکنی. لەکاتێکدا کەنووسراوەکەی سادەم هەر بەدەستەوە بوو، بەلام باوەڕکردن بەوڕاستییە بۆمن گەلێك دژوار بوو. بەخۆمم گوت:

تۆ بەهەڵەدا چووی. ئەمە سادە نەینووسیوەوهەموو ئەمانە لەخەودا دەبینی. کاتێك بەئاگا هاتیتەوە، دەبینی سادە نەڕۆیشتوەو لەگەڵ تۆدا دەژی! ئەوشەوە نەچوومە سەر تەختە خەوەکەم‌و هەر بەو شێوەیەی کەدانیشتبووم چاوم لەدەرگای حەوشەکە بڕیبوو، لەهەموو چرکەیەکدا چاوەڕوان بووم ئەو دەرگاکە بکاتەوەو بێتە ژوورەوە. هەر ڕێبوارێك بەکۆڵانەکەدا ڕەت دەبوو ئەو هیوایەی لەدڵی مندا زیندوو دەکردەوە کە ئەوە خۆیەتی! بەخۆشحاڵییەوە لەشوێنی خۆم دەردەپەڕیم تاکوو پێشوازی لێبکەم. لەدڵی خۆمدا دەمگووت بینیت گەڕایەوە! ئێستا زەنگ لێدەدا و دێتە ژوورەوە، بەلام کاتێك دەنگێکم نەدەبیست بەنائومێدی دادەنیشتمەوەو جارێکی تر چاوەڕێ دەمامەوە. دڵنیابووم کەخۆشی دەوێم‌و ناتوانێت خەمی دووریم هەڵبگرێت، بۆخۆم دووپات دەکردەوە ئەو منی خۆش دەوێت. هەر بەو جۆرەی کەمن بەبێ ئەو ناتوانم بژیم. هەربۆیە دڵنیام دەگەڕێتەوە، بێگومان وەك ئەوجارەی کە بۆ یەك ڕۆژ ڕۆیشت و سێ ڕۆژی پێچوو. ئەمجارەش هەر ئەو کارە دەکات. بەڵێ، دڵنیام کەپاش سێ ڕۆژی دی دێتەوە. من تەنها

کت‌ومت وەك جاری پێشوو! بەڵام ئەمجارەیان دەبێت دەبێت سێ رۆژ لەچاوەڕوانیدابم. دەبێت ماڵەکە بۆکاتی بەباوەشی کراوەوە پێشوازی لێبکەمو دڵە ناسکەکەی نەشکێنم. هەر لەبەر ئەوە گەڕانەوەی ئامادە بکەم. دەبێت کاتێك گەڕایەوە، هەموو شتێك گۆڕابێت. بەڵام بوو کە دەستم بەماڵەکەدا هێناو هەموو کەل‌وپەلە زیادەکانم لەماڵ بردە دەرەوە، وەك بڵێی سێ رۆژەکە بووە هەفتەو مانگو بەردەوام من لەخەیاڵی ئەو سێ رۆژەدا بووم. ئەو سێ رۆژە هێشتا نەهاتووەو تێنەپەڕیوە! ئەو شتانەی کەلەناو ماڵدا ببووە هۆی بێزاری و ئازاردانی سادە، هەموویم گۆڕین. هیوای گەڕانەوەی هێزی وەبەردەهێنامەوە. ماڵەکەو کەل‌وپەلەکانی ناویم بەگوێرەی ئارەزووەکانی سادە ڕازاندەوە، چونکە لەوچەند مانگەدا بەسروشتی ئەو ئاشنا ببووم. چێشتخانەکەم بەو شێوەیەی کە ئەو خۆشی لێدەهات، ڕێکخست و پاشان ئەو شتانەم بۆ کڕی کە دەمزانی سادە حەزیان پێدەکاتو پەسندی دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو کارانەدا کە ئەنجامم دابوون، ئەو رۆژانە تێپەڕین و سادە هەرنەگەڕایەوە. ئەوکات مەئیوس‌ونائومێد خۆم لەگەڵ بیرەوەرییەکاندا سەرگەرم دەکرد، تەواوی ئەوساتە شیرینانەی کە لەگەڵ سادەدا بەسەرم بردبوون، لەپێش چاومدا گیانیان بە بەردا کرایەوەو زیندووبوونەوە، دەمهێنایەوە یادم کە چۆنچۆنی شەوێك لەکاتی هێنانی چادا پێی لەقەراغی دەرگای هۆڵەکە هەڵکەوتو وەخت بوو لەسەر سەر بدات بەزەویداو بەهەزار زەحمەت توانی خۆی و سینیە چاکە بگرێتەوە. دەمهێنایە بەرچاوم چۆنچۆنی ڕەخنەی لەدروستکردنی ماڵەکەدا دەگرتو کەموکورتیەکانی دەستنیشان دەکرد. بەخۆمم دەگوت ئێستا ئەگەر بێتەوە دەبینێت کەهەموو گرفتەکانی ماڵم چارەسەر کردووە، چەندە خۆشحاڵ دەبێت! چاوم بەهەر گۆشەیەکی ماڵەکە دەکەوت یادەوەری سادە زیندو دەبویەوە، لەگەڵیدا گفتوگۆم دەکرد و هەستم دەکرد وەڵام دەداتەوە. دەنگدانەوەی دەنگی ئەو هێشتاله نێو ماڵدا دەنگی دەدایەوەو قسەی لەگەڵدا دەکردم. دەمویست پەنجەرەی ژوورەکەی بەرەوبەهاری ڕزاوە بکەمەوە، کاتێك پرسیارم لەبۆ چوونەکەی کرد، وەڵامم وەرگرت کە دەیگوت:

سەرەتا گوڵدانەکان ببەرە حەوشەکەو پاشان پەنجەرەکە بکەرەوە، بەڵام ئاگاداربە لاسکی گوڵێك نەشکێنیتەوە! بەپارێزگارییەوە گوڵدانەکانم بەرەوحەوشەکەبردوو پاشان پەنجەرەکەم کردەوە. بەیانیانیش بەدەنگەخۆشەکەی ئەو لەخەو بێدار دەبومەوەو گوێم لێ بوو کە دەیگوت:

مامۆستا نانی بەیانی ئامادەیە، تاکو نانەکە سارد نەبۆتەوە هەستەو نانەکەت بخۆ، بەڵام تکایە جێگاکەت ڕێکوپێك بکە! من گوێم بە فەرمانەکانی دەدا، کاتێك بەپەلە خۆم دەگەیاندە خوارەوە، لەگەڵ ئەو ڕاستییە تاڵەدا ڕوبەڕوو دەبووم کەسادە بۆهەمیشە بەجێی هێشتووم و بەتەنها ماومەتەوە. ئەوپێشهاتە هێندە تاڵبوو کە لەدەستی ڕامەکردو چاوم لە ڕاستییەکان دەنوقاند. دنیای خەیاڵاوی خۆمم زۆر خۆشتر دەویست لەدنیای ڕاستەقینە. نانی بەیانیم ئامادە دەکردو باوەڕم بەخۆم دەهێنا کەسادە ئامادەی کردووە. دەرگای ژوورەکەیم دەکردەوە تاکو بۆنە خۆشەکەی ببیستم. لەگەڵ ئەودا دەدوام، پێدەکەنیمو لەبارەی ڕوداوەکانی ڕۆژانەوە بۆم دەڕێساو دەردە دڵم لەگەڵ دەکرد، هەستم دەکرد ئەو لەگەڵمندایەو بۆ هەموو شوێنێك بەدوامەوەیە. لەوانەیە باوەڕ نەکەیت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەمەبوو کەلە خەونەکانمدا دەستم لێدەداو دەمبینی کە وەك منداڵێك ئارام و لێوان لێو لەخۆشەویستی سەری دەنایە سەر سنگم تاکو دەست بە قژیدابهێنم. من تەواوی نهێنییەکانی ناخی خۆم کەنەمتوانی بوو ڕێكوڕاست بەسادەی بڵێم بەسادەی خەونەکانمم دەگوتو دانم بەعەشقی خۆمدا دەنا.لەگەڵ ئەو عەشقەی کە بۆ سادەم هەبوو، پلە بە پلە ترس و سامیش لە دڵمامدا جێی خۆیان کردەوە. ترس لەوەی سادەی خەونەکانیشم دەستم لێ هەڵبگرێت وبێئاگا بڕوات، لەشێتی نزیك دەبوومەوە، ئەوەبوو دەرگای ماڵە کەم داخست و لەماڵەوە گۆشەگیر بووم.دوورە پەرێزی و تەنهایم بە دڵ وەرگرت، نەمدەویست ئارامی وبێدەنگیمان ئاوێتەی شڵەژان و نائارامی ببێت. دەمویست سادەکەی خۆم بۆ خۆم بپارێزم و بەدووری بگرم لە زیانی دوشمنان. من لەگەڵ سادەکەمدا پرتەو بۆڵەیشم دەکردوو کاتی واهەبوو کە لەیەکتر نیگەران دەبوین! بۆنموونە، کاتێك وەڵامی بەتەلەفۆن دەدامەوە، بێزار دەبووم و

دەچوومە ژوورەکەی خۆم تا ڕووبەڕووبونەوە لەنێوانماندا ڕوونەدات، زۆربەی کاتەکان لەوێدا دەمامەوە و نەدەچوومە خوارەوە. بەڵام دوواجار پەشیمان دەبومەوە و دڵم بۆ دیدەنی تەنگ دەبوو، دەچووم بۆ لای و گەردنبەندەکەی سادەم وەك داوای لێبووردن دەکردە ملی، سادە لەکاتی بە جێهێشتنی ماڵەکەدا لەبیری کردبوو چرۆکە و بۆنێك کە بەردەوام کەڵکی لێوەر دەگرت، لەگەڵ خۆی ببیات. من ئەو بۆنەم بەهەموو ئەو شوێنانەوە دەکرد کەئەو بەسەریدا ڕۆشتبوو یان ئەو شتانەی کە ئەو دەستی لێدابوون! هەرلەبەر ئەوە هەنگاوم بۆ هەرلایەك دەنا بۆنی ئەوم دەبیست. هاوڕێیەکم لەڕووی تابلۆیەکەوە، لەسەر شێوەی سادە پەیکەرێکی دروستکردبوو کەوەك ڕاستی دەینواند. لەگەڵ هەمان نیگادا کەبە زاڵبوونەوە لەمنی دەڕوانی! پەیکەرەکەی ئەوم لە گۆشەیەکدا دانابوو کەبەرەو هەرلایەك دەچووم دەمتوانی ڕوخسارو لەشولارە جوانەکەی بەتەواوی ببینم "، من چارۆکەکەی سادەم دابەسەر شانی پەیکەرەکەداو بۆنەکەی سادەیشم پێوەکرد! لەشەوێکی بەهاردا کە مانگەشەو بەتەوی حەوشەکەی ڕووناك کردبوەوەوئەستێرە ئەژمێردراوەکانیش لەبەرینی ئاسماندا دەدرەوشانەوەو شنەی شەماڵ یاری بە شکۆفەی درەختی خورماڵوەکە دەکرد، بەسادەم گوت:

هەوا چەندە خۆشە! وەرەلامەوە و دانیشە و تۆش سەیری ئاسمان بکە.هەستم کرد ئەو وەك خەونێك هات و لەتەنیشتمەوە دانیشت، بەئارامی وشەرمەوە سەری نوساند بەشانمەوە و گوتی:

پڕبەدڵ حەزدەکەم کات لێرەدا ڕابوەستێ و من و تۆ بۆ هەمیشە بەمشێوەیە بمێنینەوە. حەز دەکەم هەمووکەسێك بزانێت کەمن و تۆ چەندە یەکترینمان خۆشدەوێ و ناتوانین یەك چرکە بەبێیەك بژین! مامۆستا پڕبەدڵ ئارەزوو دەکەم بۆ هەر شوێنێك چووی منیش لەگەڵ خۆت بەریت! پێم گوت:

من بەردەوام لەگەڵ تۆدام، هەتا شەوانیش کە برژنگەکانم لەچاوەڕوانیدا ماندوو دەبن و پێکدا دەنوسێن. ڕوی گرژکردوو گوتی:

بەڵام ئەمە بەس نییە، من دەمەوێت لەدەمارەکانی تۆدا وەک خوێن، لەجوڵەدابم! ئارەزوو دەکەم لەلێدانەکانی دڵت، لەبوونتدا لێبدەم، حەزدەکەم وەک واژە لە زارتەوە بێمە دەرەوە! ئارەزوومە خۆت بم نەک نیوەیەک لەبوونت، من دەبێت لەگەڵ تۆدا ببم بەیەک. من قسەکانی ئەوم پەسەندکردوو لەوساکەوە بووین بەیەک. دەستێک کەدڵم لەدەستی دەگرت و دەینوسی، تەنها من نەبووم، بەڵکو سادەش لەگەڵمدا دەینوسی. تەنها بیرو ئەندێشەی من لەسەر کاغەز نەدەنوسران، بەڵکو بۆچوون و ئەندێشەی سادەیش دەوری گرنگیان تێدا دەبینی. کاتێک هەندێک وشەی بەلاوە پەسەند نەدبوو خەتی بەژێردا دەهێنان و پێم پێدەکەنی و دەیگوت:

بەمشێوە بینوسە کەمن پێتدەڵێم! منیش هەربەو جۆرەی کەئەو دەیگوت دەمنوسی و کاتێک وێنەیەکی لە کتێبەکەدا بەلاوە پەسەند نەبوو دەیدڕاندوو دەیگوت:

چاوەکانت پاکیزەیی مرۆڤایەتییان تێدانییە. دەبێت بزانیت کە مرۆڤ گەلی پاک درووست بکەیت، کەوایە چاوەکانییان بەپاکی دروست بکە! و پاڵەوانانی کتێبەکەم بوونە خاوەنی جوانترین چاو. تەنها من عاشقی پەیکەرەکەی سادە نەبووم، بەڵکو ئەتایش پیایدا هەڵدەداو دەیگوت:

بەتەواوی وەک ئەوە وایە کە سادە بیەوێت سەیرمان بکات و بە دەممانەوە پێبکەنێت، ئەتا هەستی کردبوو کەپەیکەرەکەی سادە دەپەرستم و بەبوونی ئەو لەدنیای خەونەکانی خۆمدا، بەدوای ژیانێکی بەختەوەرانە دەکەوم. ئەو لەکاتێکدا کە هەوڵی دەدا جیهانی خەونەکانم تێک نەدات، منی لەگەڵ ڕاسییەکاندا ڕووبەڕوو دەکردەوە. پێی دەگوتم:

بوویت بە بتپەرست و ئەم کارەی تۆ کوفرە! من گوێبیستی قسەکانی دەبووم، بەڵام لەبیرو ئەندێشەی خۆمدا جێم نەدەکردنەوە. قسەکانی ئەو هەروەک بایەک بەلای گوێمدا ڕەت دەبوو، جارجار بەڕوخساری شێواویدا دەهاتمەوە سەرخۆم و لەوە ئاگادار دەبووم کە دەیەوێت بەسەرما بقیڕێنێت. ئەو دەستەکانیشی بەرەو ئاسمان هەڵدەبڕی و شتانێکی بێمانای دەگووت کە گوێچکەم حەوسەڵەی بیستنیانی نەبوو و لەکاتێکدا کەئەو قسە

بێمانایانەی دەکرد، هەڵدەستامەوە و لەبەرامبەر پەیکەرەکەی سادەدا دەوەستام و چاوم لەچاوەکانی دەبڕی و قسەم لەگەڵدا دەکرد. هەستم دەکرد کە سادەیش وەک من، لەمانای قسەکانی عەتا تێناگات و بەپەنامەکی پێی پێدەکەنێت. کاتێك عەتا بەتەنها جێی دەهێشتین، هەردووکمان بەدەنگی بەرز بەقسەوهەڵس و کەوتە منداڵانەکەی ئەو پێدەکەنین و لەوەی کە بەحاڵی خۆمانەوە لێمان گەڕاوەو ڕۆشتووە، خۆشحاڵ دەبووین!

من بەمشێوەیە ڕۆژم دەگەیاندەشەو تا ئەوەبووڕۆژێك تەلاری خەونەکانم ڕما و لەخەوی غەفڵەت ڕاچەنیم و ئەوە ڕۆژێك بوو کە عەتاگوتی سادە دوچاری چەرمەسەری بووە و پێویستی بە یارمەتی هەیە. سەیرمکرد کەئیتر چاوەکانی پەیکەرەکەم پێناکەنن، بەڵکو لەقوڵاییەکانیاندا چاوەڕوانی و نیگەرانی شەپۆل دەدا، پەیکەرەکە دەیەویست بزانێت ئایا هاوکاری دەکەم و دەستی هاوکاری بۆ درێژ دەکەم یان نە. دەمبینی کە ئیتر دەنگی سادە ئەو دەنگدانەوەیەی جارانی نییە و شێواوی تێیدا شەپۆل دەدات، بەڵێنم پێدا کە بەتەواوی توانامەوە یارمەتی بدەم و تەنها چاوەڕوانی ئەوەم کە لێو هەڵبێنێتەوە و قسەیەك بکات، بەڵام ئەوحیسابی بۆمن نەکردوو لەچاوەڕوانییەکی تاقەت پڕوکێندا دەیهێشتمەوە. مامۆستا ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا و جگەرەیەکی داگیرساند. بۆ چەند ساتێك چووە خەیاڵەوە. ئەوەی کە مامۆستا بۆی ڕوونکردمەوە منی بۆ ئەو بیرکردنەوەیەبرد کەئەو چ دەورانێکی سەختی بەسەر بردووە. ئەو بەڕاستی عاشقی سادەکەی خۆی بوو، عەشقێك کەئەوی تانزیکی شێتبوون برد،ئایا پیاوێك دەتوانێت تائەو ڕادەیە جڵەوی خۆی لەدەست بدات، عەشق و پەیوەندی ئەودووانە لەچاخی نوێدا ڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراوبوو، چۆن دەگونجا عەشقێك لەسەردەمێکی ئاوادا شکۆفە بکات؟ سەردەمێك کەئاسن حوکمی مرۆڤایەتی دەکات! کاتێك مامۆستا منی لەبیرکردنەوەدا بینی پرسی:

بیر لەچی دەکەیتەوە؟ ئایا باوەڕناکەیت من تائەو ڕادەیە سادەم خۆشویستبێت؟

گوتم:

تۆ نۆرچاك بیری خەڵكی دەخوێنیتەوە! ویستم بیر لەوە بكەمەوە زەمانێك كە عەشق و هەوەس لەگەڵ یەكتردا كۆبوونەوە! ناسینی عەشقی ڕاستەقینە چەندە ئەستەمە. لەسەردەمی ئێمەدا خۆشویستن و لەخۆبوردن دەڕوات تالەگەڵ ئەفسانەدا تێكەڵ دەبێت و وەك عەشقی ئێوە كە دووبارە ژیانی پێبەخشینەوە. نیگاكانی ڕاستەو ڕاست لەچاوەكانم بڕی و گوتی:

ئەفسانەی ئێمە، نەخێر! ئەفسانەی ئەو ڕاستە، چونكە من هیچكارێكم بۆئەو نەكرد، بەڵام ئەو لەبەر خاتری عەشق، لەخۆی بوردو تاوانێكی سەختی وەئەستۆگرت. هەرچی كرا سادەكردی و من تەنها تەماشاكەر بووم، تەماشاكەرێك كەگەلێك دێرهەستی كرد دەتوانێت ببێتە ئەكتەرو پێ بنێتە سەكۆی شانۆوە. من نەمتوانی لەكاتی پێویستیدا بۆ ڕزگار كردنی عەشقەكەم لەدەستی دوژمن، هەنگاو بنێم. كاتێك ئەوم بەدەست هێنایەوە كە ئیتر وێران ببوو. ڕۆح و جەستەی ماندوو ببوو. ئەو بەتەنهایی لەدەریای عەشق و لەخۆبوردووییدا سەرگەردان مابۆوەو هیچ بەلەمێك بۆ ڕزگاركردنی لەجوڵەدا نەبوو. لەكەنارێكی هێمن دەگەڕا تا لەوێدا هەوار هەڵبدات و بەدوای ئەو دەستە گەرمانەدا وێڵ بوو كە لەوگێژاوە ڕزگاری بكەن و لەشەپۆلە مەنگەكانی دەریاوە بەرەو كەنار ڕێنمایی بكەن: بەڵام من ئەو چركەساتانە لەلای نەبووم تاكوو دەستی بگرم. من لێی بێ ئاگا بووم و سادەی من بەتەنهایی باجی عەشقی خۆی دەدایەوە. من كە ئەوم لەگیانم خۆشتر دەویست لەكاتی نەهامەتیدا یارمەتیم نەدابوو. عەشقی من لەبەرامبەر شكۆی عەشقی ئەودا، هیچ نرخێكی نەبوو! هیچ! لەگەڵ هاتنی سادەدا، مامۆستا قسەكانی بڕی. سادە، ئێمەی بۆ خواردنی نانی ئێوارە بانگهێشت كرد.

داوام لەسادە کرد تەشریف بێنێت بۆ کەرەج و ببێتە میوانم، بەڕوویەکی خۆشەوە قەبوڵی کرد. مامۆستا ئەوی هێنا بۆ ماڵی ئێمە و خۆیشی ڕۆیشت بۆ کتێبخانە. کاتێك سادە کەپرە بچووکەکەی ئێمەی بینی، بەشادومانی و شەوقەوە گوتی:

چەند جوانە ! ! دەکرێت هەر لەوێدا دانیشین؟ گوتم:

هەر چۆن ئارەزوو دەکەیت، لەژێر کەپرەکەدا دانیشت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

بەه.. بەه.. بۆنی چەند خۆشە! چ هەوایەکی سازگارە. چەندە بێ دەنگ و ئارامە. من عاشقی ئەم دیمەنەم. گوتم:

لەمەودوا دەبێت زوو زوو سەردانم بکەیت تاکوو لەم هەوا و دیمەنە ئارامە کەڵك وەربگری. پێکەنینێکی کردو گوتی:

دەترسم ئەوکات لێم بێزار بیت و ببمە هۆی نائارامی ماڵەکەت. گوتم:

مانای بەبڕوای تۆ توانای میواندارییم نییە؟ دەستی گرتم و گوتی:

مەبەستێکی ئاوام نەبوو. گوتم:

دەزانم، گاڵتەم لەگەڵ کردی. تاکوو تۆ پشوویەك دەدەی دەچم "چا"ت بۆ دەهێنم، کاتێك بەسینیە "چا"کەوە گەڕامەوە، سەرقاڵی بۆنکردنی گوڵەکان بوو. گوتی:

دەزانیت کاتێك چووی بۆ هێنانی چاکە بیرم لەچی دەکردەوە؟ گوتم:

بیرت لەچی دەکردەوە؟ گوتی:

لەوەی کە تۆ لەنیوەی بەسەرهاتی من ئاشنای بوویت، لەکاتێکدا کە من هێشتا نازانم تۆ چەند منداڵت هەیە؟ بە پێکەنینەوە گوتم:

ئەگەر دەتەوێت بزانیت دەبێت بەڵێنم پێ بدەیت کە بەسەرهاتەکەم بەتەواوی بۆ باس بکەیت. دەستی بەرز کردەوەو گوتی:

سوێند دەخۆم! پاشان پێکەنینێکی کرد. پێم گوت:

دوومنداڵم هەیە، یەکیان کوڕە و ئەوی کەشیان کچ، پرسی:

تەنها دوو منداڵ؟ گوتم:

کەمە؟ سەیرێکی دەوروبەری کرد و گوتی:

هەر کەسە و لەبارەی ژمارەی منداڵەوە بۆچونێکی هەیە، بەڵام من چوار منداڵ پەلدەبژێرم. دوو کچ و دوو کوڕ، چونکە خۆم تاقانە بووم، حەز دەکەم منداڵەکانم خوشك و برایان هەبێت. بەگاڵتەوە گوتم:

هەر لەبەر ئەوەیە کە تا ئێستا منداڵت نییە؟ لەمەبەستم حاڵی بوو و گوتی:

ڕاستە کە ئێمە چەند ساڵێکە زەماوەندمان کردوە، بەڵام هێشتا گرفتی دەروونی کۆڵی لێ نەداوین تاکوو بتوانین منداڵمان ببێت. ئێمە بڕوامان وایە کە منداڵەکانمان دەبێت لە کەشێکی ئارامدا گەشە بکەن‌و بتوانین ئارامی ڕۆحی و فیکریی بۆ فەراهەم بکەین، بەڵام لەکاتێکدا کە من و مامۆستا هێشتا نەمانتوانیوە پەژارەکانی رابردوو لەخۆمان دوور بخەینەوە، چۆن چۆنی دەتوانین کەشێکی لەبار بۆ منداڵەکانمان دروست بکەین! گوتم:

بەڵام ئێوە هەردووکتان کەسانێکی تەندروست و ئاسایین. من گرفتێکی دەروونی لەئێوەدا نابینم. گوتی:

بۆچوونی تۆ تا ڕادەیەك ڕاستە، چونکە تازە ئێمە پێکەوە ئاشنا بووین و تۆ بەگوێرەی پێویست بە ڕۆحیاتی ئێمە ئاشنا نەبوویت، لەکاتێکدا کە هەست دەکەم تا ئەو شوێنەی ژیانمانم بۆ باسکردوویت. تۆ دەبێت تا ڕادەیەك شارەزاییت لەڕۆحیاتی ئێمە بەدەست هێنابێت. گوتم:

بەڵێ هەر بەو جۆرەیە بەڵام... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

ئەگەر گوێبیستی پاشماوەی بەسەرهاتەکەم بیت هەقمان پێ دەدەیت کەبۆچی هێشتا منداڵێکمان نییە. گوتم:

حەز دەکەیت ئێستا بۆم باس بکەیت، یان پاش نانخواردنی نیوەڕۆ؟ گوتی:

ئێستا باشترە، چونکە لێرەدا و لەم دیمەنەدا هەستێکی وام لادروست بووە کە ئارەزوو دەکەم لەگەڵ کەسێکدا لەبارەی خۆمەوە بدوێم. ڕەنگە کەمێک بەجۆش‌وخرۆشبم، بەڵام وا هەست دەکەم ئەو ڕاستیانەی کە بۆت باس دەکەم کاریگەریت لەسەر دانەنێت. چونکە ئەوانە ڕابردون و تێپەڕیون. گوتم:

هەر چۆنێک خۆت بەباشی دەزانیت. چاکەی شێواند و گوتی:

من مامۆستام بەجێهێشت، چونکە وای بۆ دەچووم ئەو بەبێ من ژیانی باشتر دەبێت. ئەو بەڵگانەی کە مامۆستا بۆ قبووڵ نەکردنی فریشتە دەیهێنایەوە ئەقڵ دەیگرت، ئەو ژیرانە لەو بابەتەی دەڕوانی و منیش هەستی. کاتێک بەو ئەنجامە گەیشتم کە مامۆستا ڕاست دەڵێت، بەجێمهێشت. بەڵام نامەوێت وا گومان بکەیت کە عەشقی ئەوم لەبیر کرد. هەرگیز شتێکی وا نەبوو! ڕەنگە لەو کاتەدا هەستێکی ترم لەبەجێهێشتنی ئەودا هەبووبێت، پەیم بەوە بردبوو کە مامۆستا خوی بەمنەوە گرتوەو ئارەزوو دەکات هەر کاتێک بەرەو ماڵ دەبێتەوە من لەوێدا ببینێت، وامدەزانی ئەگەر ماوەیەک بەتەنها بمێنێتەوە لەتەنهاییدا بەتەنگ دێت و بەدوامدا دەنێرێت، ئەوکات ناچارە بۆ چاودێریی من بیرێکی بنەڕەتیی بکاتەوە. لەمەبەستم تێدەگەیت؟ گوتم:

بەڵێ تۆ چاوەڕوانیٚ دەربڕینی عەشق بووی لای مامۆستاوە. زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

بەڵێ، چونکە، ئیتر ئامادە نەبووم وەک ڕابردوو پەیوەندی خۆم لەگەڵ ئەودا پەرە پێ بدەم. هەفتەیەک دانم بەخۆمدا گرت و چاوەڕوانی بووم، بەڵام هیچ هەواڵێک نەبوو، نەپەیامێک، نە تەلەفۆنێک، هەتا داوایشی لەعەتا نەکردبوو بێت بەدوامدا.

لەڕادەبەدەر غەمگین و پەشێو بووم تا ئەوە بوو فریشتە تەلەفۆنی کرد و گوتی:

بڕیاری خۆی داوە و ئامادەیە لەگەڵ مندا بژی. نیگەرانیەکانم بەدەستی فەرامۆشی سپارد و ماڵەکەم بۆ پێشوازی فریشتە ئامادە کرد. بەسەرهاتی فریشتەم بۆ دایک و باوکم باسکردبوو ڕازی بوونی ئەوانم وەرگرتبوو. دایکم خۆشحاڵ بوو بەوەی کە من پاش بیست ویەک ساڵ سەرەنجام هاوەڵێکی کچم هەڵبژاردبوو کە دەیتوانی هەم دۆستم بێت و هەم خوشک. ماڵەکەم بەجۆرێك ڕازاندەوە کە فریشتە بە خۆشی و ئارامی ژیانی تێدا بکات.

بەهاتنی ئەو ئاڵوگۆڕێکی گەورە لەماڵەکەماندا بەدی هات. ئەو لەگەڵ خۆیدا میهرو خۆشەویستی و هێنا و گۆڕێکی تری بە ژیانمان بەخشی. کاتێك نیگارکێشی دەکرد، بەئارامی لەتەنیشتیدا دادەنیشتم و تەماشام دەکرد. ئەو بەسێ پەنجە نیگارکێشییەکی وای دەکرد وەك بڵێی بەهەموو جەستەی کار دەکات. ئەو وەرزی بەهارەمان بەخۆشی پێکەوە بەسەر برد.

لەسەرەتای هاویندا سامۆئیل گەڕایەوە بۆ ئێران. بەکورتی و پوختی بڵێم کە بەرنامەکانی ڕابردوو ڕێك و ڕاست دوبارە بویەوە، زیادە خەرجییەکانی و دەست بڵاوەیی ئەو سنوورێکیان نەبوو، بەجۆرێك کە فریشتەی حەپەساندبوو. گرتم کە هەڵسوکەوت و تایبەتمەندی سامۆئیل بەجۆرێك بوو کە خەڵکی بەزوویی دەخستە ژێر کاریگەری خۆیەوە و فریشتەش لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیەدا نەبوو. کاتێك سامۆئیل بۆی روون بوویەوە من تا چ ئاستێك فریشتەم خۆش دەوێت و ئامادە نیم ساتێك لێی دوور بکەومەوە بڕیاریدا لەڕێگای خۆشەویستییەوە لەگەڵ ئەودا، من لەخۆی نزیك بکاتەوە. ئەو دیارییە بەنرخانەی کە بۆ فریشتەی دەکڕین جێگەی خۆشحاڵی هەردووکمان بوو. من لەوەی کە دەمبینی فریشتە لەسەر کورسییەك دانیشتوە کە پێشکەوتووترین کورسی کەمئەندامان بوو لەخۆشیدا هەر ئەوە بوو باڵم نەدەگرت. ژوورێك پڕ لەپێویستییەکانی نیگارکێشی بۆ فەراهەم کردبوو. فریشتە جار جار دەستی دەگرتم و دەیگووت:

سادە ناتوانم باوەڕ بکەم کە هەموو ئەمانە ڕاستین و لەخەونمدا نین. سامۆئیل چەندە لێوانلێوە لەخۆشەویستی! من تاکوو ژیانم مابێت خۆم بەقەرزداری خۆشەویستییەکانی

ئەو دەزانم. پاشان وەك منداڵێك كە كەرەستەی یاریكردنی تازەی گیركەوتبێت، دەستی بەیارییەكانی سامۆئیلدا دەهێنا و بەدەوروبەری خۆیدا ڕیزی دەكردن. من دەمزانی كە مەبەستی سامۆئیل لەم كارانەیدا چییە، بەڵام نەمدەویست جیهانە بەختیارییەكەی فریشتە بشێوێنم و پەردە لەسەر مەبەستە شاراوەكانی سامۆئیل هەڵدەمەوە. ڕۆژێك من و فریشتە لەحەوشە دانیشتبووین، ئەو سەرقاڵی وێنەكێشان و منیش كتێبم دەخوێندەوە كە سامۆئیل هاتە ژوورەوە ڕێكوڕاست چووە لای فریشتەوە و لەتابلۆكەی دەڕوانی. وێنەی كۆشكێكی گەورە لەنێو دارو درەختە چڕەكان و پڕ لەگوڵ و گیا. سامۆئیل پرسی:

فریشتە ئەم كۆشكەت لەكوێ بینیوە؟ فریشتە هەر بەو جۆرەی كە قەڵەمەكەی بەدەستەوە بوو، سەری خۆی دەست نیشان كرد و گوتی:

لێرەدا. سامۆئیل لەقاقای پێكەنینی دا و گوتی:

مانای ئەم وێنەیەت ئەندێشەیەكە و تاكو ئێستا كۆشكێكی وات نەبینیوە؟ دەستم لەخوێندەوە هەڵگرت و گوتم:

سامۆئیل واز لەفریشتە بهێنە و لێگەڕێ كاری خۆی بكات. سامۆئیل گوتی:

بەڵام من لەو پرسیاركردنەمدا مەبەستێكم هەبوو، دەمویست بۆچوونی ئێوەش بزانم.

فریشتە پرسی:

چ مەبەستێك؟ گوتی:

ئەگەر من كۆشكێكی لەو جۆرە بەهەموو تایبەتمەندییەكانیەوە بۆ ئێوە پەیدا بكەم چی دەڵێن. بۆ ئەوەی كارەكەی بەسووكی سەیر بكەم، گوتم:

ئەوە گرنگ نییە. سەرانسەری باكوور پڕییەتی لەو جۆرە كۆشكانە. گوتی:

بەڵام من مەبەستم لەتارانە. نەك باكوور! شانەكانم بەبێ دەربەستی هەڵتەكاند و بەردەوام بووم:

لەباكووری تارانیشدا لەو جۆرە كۆشكانە كەم نین. گوتی:

قسەكەی تۆ ڕاستە، بەڵام ئەو كۆشكەی كە فریشتە وێنەی كێشاوە، لەگەڵ هەموو ئەو كۆشكانەدا جیاوازی هەیە، وەرە پێشەوەو خۆت لەنزیكەوە بیبینە، هەق بەو بوو.

کۆشکەکەی فریشتە خەونێکی جوان بوو و لەسەر گردۆلکەیەک و لەنزیک تاڤگەیەکی بچووکدا بوو. ئەو تاڤگەیە لەوێنەی قەڵبەزەدا تا خوارەوە هاتبوو، دەوری قەڵبەزەکە پڕ بوو لەگوڵی ڕەنگاو ڕەنگ و جوان. کۆشکەکە بەشێوەیەک بوو کە لەکاتی خۆرئاوابووندا خۆر وەک یاقووتێک دەدرەوشایەوە. کاتێک فریشتە هەستی کرد تابلۆکەی سەرنجی من و سامۆئیلی ڕاکێشاوە، خۆشحاڵ بوو. پاش چەند خولەکێک کە گوێی لەقسەکانی ئێمە گرتبوو، گوتی:

سامۆئیلی بەڕێز ئایا هەر بەڕاستی تابلۆکەم لاتان پەسندە؟ سامۆئیل سەیرێکی فریشتەی کردو پاشان لەتابلۆکە ورد بوویەوە و گوتی:

ئەمە شتێکی بەنرخە و دڵنیام ڕۆژێک دێت وەک شاکارێکی نیگارکێشیی مەزن دێتە ئەژماردن. فریشتە قەڵەمەکەی دانا و گوتی:

کەوایە من ئەمە وەک دیارییەک دەدەم بە تۆ، سامۆئیل سەیرێکی منی کرد و گوتی:

فریشتە لوتفت هەیە، لەکاتێکدا کە من شایانی ئەو هەموو خۆشەویستییە نیم. فریشتە نەیهێشت ئەو زیاتر بەردەوام بێت و گوتی:

ئەو قسانە مەکە من زیاتر لەمانە قەرزداری تۆم و خۆشەویستییەکانی تۆ بەم دیارییە بچووکە قەرەبوو ناکرێتەوە! ئەگەر ئەم تابلۆیەم لێ وەربگریت، هەم منت دڵخۆش کردوە و هەم دڵنیاش دەبم کە کارەکەم شایستەی ئەو هەموو پیاهەڵدانە بووە. سامۆئیل سوپاسی کرد و گوتی:

بریا سادەش وەک تۆ بوایە و نرخی خۆشەویستی بزانیبا. ویستم زار هەڵبێنمەوە کە فریشتە گوتی:

سادە زۆر زیاتر لەمن نرخی خۆشەویستیەکانی تۆ دەزانێت. بەڵام ئەو کچێکی خۆڕاگرەو بەئاسانی لێو بۆ سوپاس هەڵناهێنێتەوە. ئێمە هەردووکمان سوپاسی هەستی بەرزت دەکەین. سامۆئیل نیگایەکی پرسیارئامێزی لەمن کردو پرسی:

ئایا بەو جۆرەیە؟ گوتم:

ئەگەر سۆزو خۆشەویستی لەڕووی نیازپاکییەوە بێت، پێویست ناکات بەشان و باڵی کەسدا هەڵبدەیت، خۆ ئەگەر لەڕووی ... قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

دەتەوێت بڵێیت کە من لەڕووی خۆنواندنەوە خۆشەویستیتان بۆ دەردەبڕم؟ گوتم:

تا ئێستا شتێکی وات نەکردوە؟ سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی:

بەداخەوە کە بۆچوونێکی ئاوات بەرامبەرم هەیە. فریشتە هاتە ناو قسەکانمانەوە و گوتی:

تکایە ئەم باسە ببڕنەوە! هەر بەو شێوەیەی کە گوتم من و سادە هەر دووکمان بەهای خۆشەویستی تۆ دەزانین. سامۆئیل بەبێزاری و تووڕەییەوە بەجێی هێشتین. فریشتە ماوەیەك بەبێدەنگی چاوی لەتابلۆکە بڕی و دواجار پرسی:

بۆچی بەو جۆرە ڕەفتاری لەگەڵ دەکەیت؟ ئایا دەتەوێت سامۆئیلیش وەك مامۆستا لەدەست بدەیت؟ گوتم:

بۆ بەدەستهێنانی مامۆستا ئامادە بووم هەموو کارێك بکەم، بەڵام هیچ کاتێك سامۆئیلم نەویستوە و ناشمەوێت. وا بیردەکاتەوە بەو کارانەی دەتوانێ خۆشەویستی ئێمە بکڕێت، بەڵام نازانێ کە عەشق و خۆشەویستی کاڵای کڕین و فرۆشتن نین. گوتی:

بەڵام تۆ ڕێزی خۆشەویستی مامۆستات نەگرت دەنا دەستبەرداری نەدەبوویت و بەجێت نەدەهێشت. تووڕە بووم بەجۆرێك کە بێئاگا هاوارم کرد:

مامۆستا چ خۆشەویستییەکی بەرامبەرم هەبوو کە نرخم نەزانیبێ. ئەو تەنانەت بچووکترین میهرەبانی و خۆشەویستیشی بەمن نەدا. ئەوە من بووم کە سەر لەبەری ڕۆژو شەوم بۆ ئەو تەرخان کردبوو، گاڵتەجاڕانەیە کە ئەم قسەیە لەزاری تۆوە ببیسترێت، چونکە تۆ لەهەموو کەسێك زیاتر دەزانیت کە من چەندە خۆشەویستیم بۆ مامۆستا دەردەبڕی، لەبەرامبەردا ئەو چ کاردانەوەیەکی هەبوو؟ هیچ! بەگاڵتەپێکردنەوە پێکەنینێکی کردو گوتی:

بەقسەی خۆت ئەگەر خۆشەویستیت بۆ مامۆستا لەڕووی نیازپاکییەوە بووە، کەواتە چ پێویستیەکت بەوە هەبوو کە مامۆستا بەشان و باڵتدا هەڵبدات؟ بەڵام ئەگەر لەڕووی ڕیا.... هاوارم کرد:

من هیچ کاتێك خۆشەویستم لەڕووی ریاوە نەبووە، خۆشم دەویست و ئێستاش وەك گیانی خۆم خۆشم دەوێت. تاکە هیوام بوو کە لەئاست ئەو هەموو خۆشەویستییەمدا کەمێك پێی بزانیبایە. تەنها ئەوە و بەس! دەستی گرتم و گوتی:

تۆ لەکوێ دەزانی کە پێی نەزانیوە؟ ڕووداوای ڕۆژی جەژن بهێنەرەوە یادت. ئەگەر مامۆستا تۆی خۆش نەویستبا، یەکەم ڕۆژی جەژن ئەو هەموو شەقامانەی نەدەپشکنی بۆ ئەوەی دیارییت بۆ بکڕێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە تۆ لەیەکەم ڕۆژی ساڵی نوێدا لەماڵدا بەتەنها مابوویتەوە، ئەو دەیویست داوای لێبوردن بکات و قەدرزانی خۆی نیشان بدات، بەڵام تۆ چیت لەگەڵ کرد؟ دیارییەکەت پێدایەوەو ئیهانەت پێکرد. لەوەی کە دەمبیست وەخت بوو لەپێستی خۆم دەرچم. گوتم:

بەڵام دیارییەکەی مامۆستا لەبەر ئەوەی بوو کە من لەماڵەکەیدا کارم دەکرد و ...

نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم، گوتی:

هەڵەکەی تۆ ئا لێرە دایە. مامۆستا نەیدەزانی کە تۆ لەسەر دەستووری ئێمە سفرەی "حەوت سین" دەڕازێنیتەوە و خواردنی خۆماڵی ئێمە دروست دەکەین، هەر لەبەر ئەوەش بوو شەو درەنگ گەڕایەوە ماڵ، بەڵام کاتێك سفرەی حەوسین و خواردنەکەی بینی لەهەموو شتێك تێگەیشت و بۆ داوای لێبوردن ئەو دیارییەی ئامادە کرد، بەڵام ئەو ئسانە چیتر سوودێکی نییە. من پێت دەڵێم ڕێزی خۆشەویستی بزانە هەر چەندە کەمیش بێت و نرخی بۆ دابنێ. سەیرێکم کردو هەر لەو کاتەدا فرمێسکەکانم لەسەر گۆنامدا بەربوویەوە. پرسیم:

فریشتە بەڕاستیتە؟ هەر بەڕاستی مامۆستا وەك داوای لێبوردن ئەو دیارییەی کڕیبوو؛ سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی:

بەڵێ، ئەو ڕۆژەی کە بۆ پیرۆزبایی جەژن هاتم بۆ ماڵی مامۆستا، ئەوم لەسەری کۆڵانەکەدا بینی و لەسەرو ڕوخساری شێواوی دا هەستم کرد کە لەنێوانی ئێوەدا کێشەیەک ڕووی داوە هەر لەبەر ئەوەی تێکچوونی عارەبانەکەم کردە بیانوو تاکوو بیگەڕێنمەوە بۆ ماڵ. کاتێك تۆم بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە لەپشتی مێزەکەوە بینی دڵنیابووم دەمقرەتان بووە.' تۆ هەوڵتدا فرمێسکەکان بشاریتەوە بەڵام چاوە سوورەکانت هەموو شتێکی ئاشکرا دەکرد. کاتێك تۆ لەچێشتخانەکەدا بووی من هۆی نیگەرانی تۆم لەمامۆستا پرسی و ئەو بۆی گێڕامەوە. هەموو ئەو شتانەی کە ئەو ڕۆژە لەدەمی مامۆستاوە بیستم، ئەوەم بۆ ڕوون بوویەوە. گوتم:

ئەی بۆچی پێشتر نەتگوت و لەهەڵەکەم ئاگادارت نەکردمەوە. گوتی:

لەبەر ئەوەی تۆ مامۆستات جێهێشتبوو، من لەو ماوەیەدا قسەیەکم لەبارەی ئەوەوە لێ نەبیستیت هەتا ئەو کاتەی عەتاش سەردانی دەکردین هەواڵی مامۆستات لەویش نەدەپرسی و ئێستا دەڵێیت کە ئامادە بوویت بۆ بەدەستهێنانی ئەو هەموو کارێك بکەیت؟ تۆ ئەوت هەبوو، بەڵام بەئاسانی لەدەستتدا. گوێ بگرە با پێت بڵێم کە کاتێك هاتم بۆ ماڵی ئێوە لەچۆنیەتی ژیانی تۆ ئاشنا بووم. من بەخۆم گوت:

لێبوردنی لەجیاوازی ئاین. جیاوازی چینایەتی کەبەسەر ئێوەدا زاڵە، مۆڵەت نادات لەکەناری یەکتریدا ژیانێکی ئاسودە و بەختەوەرتان هەبێت و هەر لەبەر ئەوە کارەکەی تۆم پەسەند کرد، ئەگەر دەبینی من لەگەڵ تۆدا دەژیم لەبەر ئەوەیە کە من ماڵێك و شوێنێکی حەوانەوەم نییە، جیاوازی نییە لەماڵێکی بچووك و بێ بایەخدا بژیم، یان لەکۆشکێکی فراوان و بەشکۆدا. چونکە هیچکامیان پەیوەست نییە بەمنەوە، بەڵام بۆ تۆ و مامۆستا جیاوازی هەیە. تۆ هی ئەو چینەیت، چینێك کە کەسێکی وەك سامۆئیلی تێدا دەژی کە ئامادەن بۆ دڵخۆشیان هەموو کارێك بکەن، لەکاتێکدا کە مامۆستا و ئەو چینەی کە ئەوی تێدا دەژی بەو جۆرە نین. تۆ ماڵەکەیت بینیوە و لەچۆنیەتی ژیانی تێگەیشتویت. گەرچی لەسەرەتادا بەلاتەوە گرنگ نەبوو کە ئەو لەکوێ و چۆن چۆنی ژیان بەسەر دەبات، بەڵام هەرچەند لەو ڕۆژانە تێدەپەڕی، تۆ زیاتر پەیت بەناخی

مامۆستا و ژیانیشی بردو پەشێو بوویت. ئەگەر بڵێیت وا نییە باوەڕ ناکەم. من و عەتا هەردووکمان بەباشی دەمانبینی کە تۆ ڕۆژ بەڕۆژ پەشێوترو ژاکاوتر دەبووی. دابڕان لەو هەموو ناز و نیعمەتە و خۆگونجاندن لەگەڵ ژیانێکی ئاساییدا ئاسان نییە. خۆت گوتت کە دایك و باوکت وایان هەست دەکرد زیاتر لەچەند ڕۆژێك خۆت ناگریت و بەجێی دێڵیت. تۆ دەتویست بیسەلمێنی کە توانای خۆڕاگریت هەیەو وایشت کرد، هەر وەك چەند ڕۆژێکت کرد بەمانگ، بەڵام دواجار ماندوو بوویت و وازت لێهێنا، گوێ بگرە با بێ پەردە پێتبڵێم کە ئەگەر تۆ لەوێدا بمایەیتەوە و زەماوەندت لەگەڵ مامۆستاش بکردایە، سەرئەنجام بەرەو شکست دەچوویت، چونکە هیچ کاتێك عاشقانێکی ئاوا و زەماوەندێکی لەو جۆرەش سەرکەوتوو نەبوە. ئەگەر بۆچوونی منت دەوێت دەڵێم کە باشترین کەس بۆ تۆ سامۆئیلە. گوتم:

بەڵام ئەگەر بتزانیبا سامۆئیل خیانەت بەهاوسەرەکەی دەکار لەهەموو کون و نوژێنێکی دنیادا مەعشوقەی هەن، داوات لەمن نەدەکرد هەڵیبژێرم. چاوەکانی بچووك کردەوەو بەناباوەڕییەوە پرسی:

بۆچی سامۆئیل ژنی هەیە؟ گوتم:

بەڵێ، بەقەدەر مووەکانی سەری مەعشوقەیشی هەن. ئەو دەیەوێت من بەلیستی ئەوان زیاد بکات و ئەگەر ئەو دڵفراوانی و دەستکراوەییەی دەبینی تەنها لەبەر فریودانی منە و بەس. ئەو چەند ساڵە دەیەوێت من بۆ خۆی رابکێشێت، بەڵام سەرکەوتوو نابێت. سەیرکە بەزوبان تۆی فریو داوە کە داوا لەمن دەکەی ئەو هەڵبژێرمو لەگەڵی میهرەبانبم. گوتی:

من بەو شتانەم نەزانیوە، وەگەر نا .... گوتم:

جیاوازیی چییە بزانی، یان نەزانی. دایك و باوکم دەزانن، بەڵام ئەو بابەتە هێندە بەلایانەوە بێبایەخە کە وا هەست دەکەن تەنها ڕێگەی کامەرانی و خۆشبەختی من ئەوەیە کە سامۆئیل لەبەر چاو بگرم، لەکاتێکدا کە سامۆئیل خۆی هیچی نییە. هەموو سەروەتەکەی ئەو هی باوکی و خەزوورێتی. ئەگەر ڕۆژێك ئەو دوو کەسە چاودێری نەکەن

سامۆئیل لەبرساندا دەمرێت، تۆ لەبارەی جیاوازی چینایەتی من و مامۆستاوە قسەت کرد لەکاتێکدا کە لەپێش هاتنەوەی سامۆئیلدا ئێمە نزیکەی لەئاستێکدا بووین. هەرچییەك لێرەدا دەبینی هی سامۆئیلە. تۆ وادەزانی عەشقم بەرامبەر مامۆستا ئارەزوویەکی تیژڕەو و کاتی بووە؟ ئەگەر وەهای بۆ چووبیت هێشتا منت نەناسیوە، من تۆ و مامۆستا بەهیچ دوڕ و گەوهەرێك ناگۆڕمەوە. من ئێوەم خۆش دەوێت، چونکە بەلامەوە ئازیزن.

کاتێك من و فریشتە لەگەرمەی قسەکردندا بووین، نەماندەزانی سامۆئیل لەپشتی پەنجەرەکەوە گوێی لێگرتووین. من بەفریشتەم گوت:

هەر ئەوندە بوارێکم بۆ هەڵبکەوێت دەچم بۆ سەردانی مامۆستا و داوای لێبوردنی لێدەکەم. ئای فریشتە! من و تۆ وابەستەی ئەوماڵەین و ئێرە شوێنی ئێمە نییە! تۆ لەتەنیشت مامۆستادا هونەرەکەت تەواو دەکەیت و منیش ژیانم بەدەست دێنم. چەندە خۆشبەختم کاتێك لەتەنیشت ئەودا بم. فریشتە گوتی:

بەیانی زوو ئەو کارە بکە و ئەگەر ئارەزوو بکەیت منیش لەگەڵت دێم.

بۆ بەیانی، من و فریشتە خۆمان ئامادە کردبوو کە بچین بۆ سەردانی مامۆستا. سامۆئیل کە دڵخۆش و کامەران دەهاتە بەرچاو، کاتێک ئێمەی بینی خەریکین دەچینە دەرەوە پرسی:

خانوونەکان نیازی شت کڕینتان هەیە؟ فریشتە گوتی:

دەمانەوێت شت بکڕین و سەردانی دۆستێکیشمان بکەین. سامۆئیل لەپشتی مێزەکە هەستایەوەو گوتی:

من دەتانگەیەنم، من و فریشتە سەیرێکی یەکترمان کرد، هەردووکمان دەمانزانی کە ئەو پیاوێکی ناپەسەند و ئینکارەو ڕاکردن لەدەستی ئەستەمە. هەر لەبەر ئەوە گوتم:

ئەگەر زۆر دوور نەبێت، قەبووڵی دەکەین. ئەو گەلێک بەمێواشی بەجۆرێک کە من و فریشتە ئاگادار نەبین، چپاندی بەگوێی دایکمدا و دایکیشم بەزەردەخەنەیەکەوە سەری ڕاوەشاند. کاتێک سواری ئۆتۆمبیلەکە بووین، گوتی:

زۆر لەکاتتان ناگرم. لەدەرەوەی شارە، بەڵام شایانی ئەوەیە بیبینن. جارێکی تر سەیرێکی یەکترمان کردو فریشتە گوتی:

تۆ گوتت زۆر لەکاتمان ناگریت. ئیتر چۆن .... گوتی:

ڕاستە، بەڵام من وا هەست دەکەم کە بینینی ئەو شوێنە بەلاتانەوە لەشت کڕین بەنرختر دەبێت. ئێوە لەپاش بینینی ئەوێ کاتێکی باشتان لەپێشدا دەمێنێ کە سەردانی دۆستەکەتان بکەن. ئیتر پرسیارێکمان نەکردو بەبێدەنگی لەشەقامەکان ورد

دەبووینەوە. کاتێك لەشار چووینە دەرەوە، ساموئیل بێدەنگییەکەی شکاندو ڕووی کردە فریشتە و گوتی:

بریا کەرەستەکانی نیگارکێشیت لەگەڵ خۆت بهێنایە و چەند تابلۆیەکی ڕاستەقین نەك خەیاڵیت دەکێشا. فریشتە گوتی:

من هەموو ئەم دیمەنانە لەزەینمدا دەپارێزم و لەماڵەوە وێنەیان دەکێشم. ساموئیل زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی کردو گوتی:

ئەوە نیوەی ڕاستی و نیوەی خەیاڵ دەبێت. لەکاتێکدا ئەگەر لەخودی شوێنەکەی نیگارکێشی بکەیت، بەتەواوی سروشتێکی زیندوو دەبێت. فریشتە قسەکەی ئەوی پەسند کردو جارێکی تر بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشاین. ئەمجارەیان ساموئیل ڕووی قسەی لەمن کردو گوتی:

ئایا من دۆستەکەی ئێوە دەناسم؟ چونکە نەمویست ئەو بزانێ کە ئێمە بۆ سەردانی مامۆستا دەڕۆین. گوتم:

نەخێر، بەداخەوە نایناسیت. گوتی:

بێگومان ناشتەوێ پێمی بناسێنیت؟ گوتم:

دۆستەکانی من بۆ ئەوە گونجاو نین بەتۆی بناسێنم. گوتی:

بۆچی؟ ئایا ئەوان لەمن بەدەسەڵاترن، یا من لەوان بەرزترم؟ گوتم:

هیچ کامتان. تەنها جیاوازیتان لەگەڵ ئەواندا یان ئەوان لەگەڵ ئێوەدا ئەوەیە کە زمانی یەکتری نازانن. بەگاڵتەپێکردنەوە گوتی:

مەبەستتان ئەوەیە کە ئەوان لەئەستێرەیەکی ترەوە هاتوون کە لەزمانی ئێمە نێناگەن؟ چونکە نەمدەویست ئەم باسە بەردەوام بێت، لەوێدا بێدەنگ بووم و ئەویش هیچی تری نەگوت و بەخێرایی ئۆتۆمبێلەکەی لێخوڕی. پاشان ڕووم کردە فریشتە و گوتم:

هەست بەبرسییەتی دەکەم، ئەگەر دەمزانی رێگەکەمان هێندە دووروودرێژە، خواردنێکم لەگەڵ خۆم دەهێنا. مەبەستم ئەوە بوو کە سامۆئێل لەنزیك یەکێك لە رستورانەکانەوە بوەستێت. بەڵام ئەو گوتی:

ناو جێگایەی ئێمەی بۆدەچین هەموو جۆرە خواردنێکی لێیە و هێندەمان نەماوە بیگەینێ. هەر ئێستا دەگەینە ئەوێ، ماوەیەکی تر رۆیشتین ئینجا لەجادە قیرەکە لایدا و چووە سەر جادەیەکی خۆڵ و بەردەوامی بەرۆیشتن دا. بۆ ئەوەی کە تەپ و تۆز بێزارمان نەکات، جامەکانمان داخست. تەپ و تۆز هێندە زۆر بوو کە رێگەی لێدەگرتم بەرامبەرم بەباشی ببینم، بەڵام خۆشبەختانە لەجادە خۆڵەکە زۆر بەردەوام نەبووین و ئۆتۆمبێلەکەی راگرت. بەلێدانی چەند هۆڕنێکی یەك لەدوای یەك دەرگای باخێك کرایەوەو ئێمە جارێکی تر کەوتینەوە رێ. ئۆتۆمبیلەکە بەهۆی زیخی جادەکانی ناو باخەکەوە بەسستی دەڕۆیشت و من و فریشتە دەمانتوانی لەدیمەنی ڕازاوەی باخەکە بڕوانین. لەهەر دوو لای جادەکەوە درەختە سەربڵندەکان بەشنەی با خوار دەبوونەوەو وەك ئەوەی بەخێرهاتنمان بکەن. لەکۆتایی جادەکەدا باماندایەوە بۆ شوێنێکی بێ درەخت و پان و بەرین کە تەپۆڵکەکان رێگەکەیان ڕازاندبوویەوە. پاش ئەوەی جارێکی تر درەختە بەرزەکان لەپێش چاومان دەرکەوتنەوە. چڕی درەختەکان بواری رێکردنی ئۆتۆمبێلەکەی نەدا. سامۆئێل ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت و ئێمەش دابەزین. کەمێك لەناو درەختەکاندا بەپێیان رێگەمان کرد کە لەناکاو چاومان بەکۆشکێکی گەورە و ڕازاوە کەوت، کە وەك زێڕ دەدرەوشایەوە. بێئاگا وەستاین و تەماشامان دەکرد. شێوەی کۆشکەکە بەتەواوی لەو وێنەیە دەچوو کە فریشتە کێشابووی. لەلای چەپی کۆشکەکەدا تاڤگەیەکی لێبوو کە ئاوەکەی پلە پلە دەهاتە خوارو دواجار بەجۆگەیەکدا دەڕۆیشت. کاتێك خۆمان گەیاندە دەرگای کۆشك لەوە ئاگادار بووین کە لەسەر گردۆڵکەیەك بونیاد نراوە. پیاوێکی چوارشانە دەرگاکەی لێکردینەوەو بەپێکەنینێکی مانادارەوە بەخێرهاتنی کردین. ناو کۆشکەکە زۆر جوان و شاهانە رازێنرابوویەوە. لەنێوان ئەو پیاوەو سامۆئێلدا کەمێك قسە کرا کە من و فریشتە لێی تێنەگەیشتین. ڕازاوەیی کۆشکەکە و بیناسازییە

لەڕادەبەدەرەکەی هێندە ئێمەی تامەزرۆ کرد کە هەموو بەشەکانی ببینین. ساموئیل لەکاتێکدا کە لەخۆشیدا دەستەکانی لەیەك دەخشاند گوتی:

خاتونەکان بەخێر بێن! هەر بەوجۆرەی کە بەڵێنم دابوو ئێوەم بۆ جێگەیەك هێنا کە شایستەی بینینە. وا نییە؟ گوتم:

بەڕاستی جوانە و دەبێت بڵێم کە تاکوو ئێستا کۆشکێکی لەمجۆرەم نەبینیوە. پاشان بەخۆشحاڵییەوە پەنجەرەکەم کردەوەو هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا. شادی ساموئێل لەگەڵ بینینی دڵخۆشی مندا چەند بەرانبەر بوویەوە. هاتە لامەوەو پرسی:

ئایا ئێرەت بەلاوە خۆشە؟ گوتم:

گەلێك ڕازاوەو دڵڕفێنە. هەم جوانەو هەم ئارام. فریشتە عارەبانەکەی بەرەو لای ئێمە جولاند و پرسی:

ئەم کۆشکە تایبەتە بەکێ؟ گوتم:

بێگومان هی سەرمایەدارێکە. ساموئێل پێکەنینێکی کردو گوتی:

فریشتە ئەم کۆشکە جوانە، یان ئەو کۆشکەی کە تۆ وێنەت کێشابوو؟ فریشتەش پێکەنی و گوتی:

چەند جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکدا هەیە. جوانی کۆشکەکەی تۆ لەوەدایە کە ڕاستییە، بەڵام ئەوەی من خەیاڵە. بەوردی سەیری هەموو بەشەکانی کۆشکمان کرد. هەر بەشێکی بەشێوەیەکی رێك و پێك ڕازابوویەوە. ژووری نوستنەکان بەپەردەی پەمەیی و سپیێك بەهەمان ڕەنگەوە خەملێنرابوو. ئەو شتەی بەلامەوە سەرنج ڕاکێش بوو کە شێوەی هەموو ژوورەکان وەك یەك بوون، تەنانەت چوارچێوەی تابلۆکان لەگەڵ ڕەنگی قەنەفەکاندا دەهاتەوە. تا کاتژمێرێك لەنیوەڕۆش تێپەڕی، هێندە لەگەڵ تەماشای کۆشکەکەدا تێکەڵ ببووین کە هەم من و هەم فریشتەش بەرنامەکەی خۆمان بەتەواوی لەبیر کردبوو. کاتێك گەڕاینەوە بۆ ژووری میواندارییەکەی ساموئێل، لەبینینی مێزی نانخواردن کە شاهانە ڕازابوویەوە، سەرمان سوڕما. پەردەکان دادرابوونەوە و ڕووناکی مۆمەکانی سەر مێزەکە ئەوێیان ڕۆشن کردبوەوە، بۆنی خۆشی گوڵەکان کەشێکی

شاعیرانەیان دروست کردبوو و منی لەحاڵی خەو و بێداریدا نوقم کردبوو. سامۆئیل ئاگاداری گۆڕانی حاڵم بوو بەئارامی بەگوێمدا چپاندی:

خۆشەویستەکەم تا دەتوانیت چێژ وەربگرە! ئەو قسەیەی منی تەکاندا و لەو حاڵەتەی خەونوچکەیەدا بەئاگای هێنامەوە. ڕووم کردە سامۆئیل و پرسیم:

ئایا جگە لەم سێ کەسە کە لێرەداین، کەسانێکی تر بانگهێشت کراون بۆ میوانداریی؟

گوتی:

نەخێر، تەنها میوانانی ئەم کۆشکە ئێمەین. فریشتە گوتی:

کەواتە بۆچی ئەم هەموو نان و چێشتە دروست کراوە؟ ئەم هەموو خواردنە دەتوانێ بەئاسانی ... سامۆئیل نەیهێشت فریشتە قسەکەی تەواو بکات و گوتی:

ئەم مێزەو ئەم خواردنانە بەبۆنەیەکی تایبەتییەوە ڕێکخراون. من و فریشتە نیگاکانمان لەسەر یەك ئەبڵەق بوون. سامۆئیل بەشێوەی توانج و گاڵتەپێکردنەوە بەردەوام بوو:

ئەمە خواردنی زەماوەندە! قسەکانی سامۆئیل من و فریشتەی لەپێشان زیاتر حەپەساند. فریشتە پرسی:

خواردنی زەماوەندی چ کەسێ؟ سامۆئیل نیگایەکی فێڵبازانەی لەمن کردو گوتی:

با نانەکە بخۆین پێتان دەڵێم، ئێستا تکایە نانەکەتان بخۆن. قسەکەی سامۆئیل منی خستە گومانەوەو بوە هۆی ئەوەی کە چێژ لەخواردنەکە نەبینم و تەنها بۆ شکاندنی برسیەتی نان بخۆم. دەمویست پاش کۆتایی نانخواردنەکە بێدەنگ بم، بەڵام نەمتوانی و گوتم:

ئایا زەماوەندی ئەو پیاوەیە کە دەرگاکەی بۆ کردینەوە؟ بەگاڵتەپێکردنەوە گوتی:

مەبەستت موختارە؟ نا ئەزیزم. تۆ بەهەڵە تێگەیشتوویت. سامۆئیل لەپشت مێزەکە هەستایەوەو لەتەنیشت فریشتەوە دانیشت و گوتی:

بریا پێویستیەکانت لەگەڵ خۆت بهێنایە و ئەم ساتە مێژوویبە لەبیرنەکراوەت تۆمار بکردبا. فریشتە گوتی:

من مێشکێکی باشم هەیە. بەڵێن دەدەم کاتێک گەڕامەوە رێك و ڕاست وەك ئەوەی بینیومە وێنەی بکێشم. ئەویشی بۆ گاڵتە پێ زیاد کرد:

ئایا تۆ بەڵێن دەدەیت تابلۆکەم لەم ژوورەدا هەڵبواسی؟ سامۆئیل قاقایەکی کردو گوتی:

پەیمان بێت! ئێستا کە بەنیازی کارێکی وا بکەیت کەواتە دەبێ ئەم دیمەنەت بۆ تەواوتر بکەم و ئەگەر ئەمشەو لێرە بمێنیتەوە، ئەوە بەچاوی خۆت دەیبینی. گوتم:

بەڵام بەداخەوە ناکرێ لێرەدا بمێنینەوە. پاشان ڕووم کردە فریشتەو گوتم:

بڕیارەکەمانت لەبیر چوو؟ فریشتە ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

ئاااااای... بەڵێ، حەق بەتۆیە. پاشان ڕووی لەسامۆئیل کردو گوتی:

پەیمان بێت بۆ رۆژێکی تر. هەروەك دەزانیت ئێمە دەبێت بڕۆین بۆ سەردانی دۆستێکمان. سامۆئیل بەلەقاندنی سەری قسەکەی پەسند کرد. هەر سێکمان ژووری نانخواردنمان جێهێشت و بەرەو هۆڵی میوان گەڕاینەوە. سامۆئیل بەجۆرێك لەسەر قەنەفەکە هەستایەوە، هەر وەك بڵێی مەبەستی نییە لەکۆشك بچێتە دەرەوە. ئەو پیاوە بەسینییەك چاوە خۆی بەژووردا کردو یەکی چایەکی لەپێش دانایین. کاتێك لەهۆڵەکە دەچووە دەرەوە سامۆئیل ڕووی تێکردو گوتی:

موختار! سەیرێکی ئۆتۆمبیلەکە بکە و ئامادەی بکە. پیاوەکە دەست بەسینگەوە چەمایەوەو چووە دەرەوە. پاش خواردنەوەی چایەکەی سامۆئیل ڕووی کردە فریشتە و گوتی:

تاکوو ئۆتۆمبیلەکە ئامادە دەبێت دەتوانی کەمێك پشوو بدەیت. فریشتە گوتی:

ئارەزوو دەکەم دانیشم و سەیری دیمەنی ئێرە بکەم و لەمێشکمدا هەڵیگرم. چیتر باوەڕناکەم تاکو ژیانم مابێت پێبنێمە شوێنێکی واجوان و ڕزاوەوە. بەڕاستی دیمەنی ئێرە جوانو دڵڕفێنە. بریا لەپایزدا بهاتینایە بۆئێرەو من لەبەرامبەر ئەو ئاگردانەدا دابنیشتمایە و سەیری گڕەکەیم بکردبا. دەبێت ئێرە لە پاییزاندا گەلێك دلگیر بێت.

گەڵا زەردەکان، دەنگی شلپە شلپی تاڤگە، سووتانی دارەکانی نێو ئاگردان، وەرینی
وای! دەبێت چەند جوان بێت. سامۆئێل زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی:

ئەگەر بەڕاستی حەز دەکەیت ئەم دیمەنانە ببینیت، دەتوانم ئێرە وا بگونجێنم کە لەپاییزدا بێیت بۆ ئێرەو هەر چۆنێك ئارەزوو بکەیت لەم دیمەنە دڵڕفێنە چێژ وەربگریت.

فریشتە بەخۆشحاڵییەوە دەستەکانی لەیەك سویێن و پرسی:

بەڕاستی ئەو کارە دەکەیت؟ گوتی:

بەڵێ، من جارێکی تر پرسیم:

ئێستا بەئێمە ناڵێیت ئەو خواردنەی کە خواردمان تایبەت بوو بەچ زەماوەندێك؟

فریشتە گوتی:

چۆن بوو نەتزانی؟ ئەو خواردنە تایبەت بوو بەزەماوەندکردنی کاك موختارەوە!

سامۆئێل ناوچاوانی تێکدا و گوتی:

تۆش بەهەڵەدا چوویت. ئەوە خواردنی زەماوەندی من بوو کە تۆشی گیانتان کرد!

بیرم کردەوە هەر بەڕاستی سامۆئێل نانی زەماوەندی بەئێمە داوە. هەر بۆیە بەگاڵتەوە گوتم:

بەڵام ئەوە دروست نییە کە تۆ پاش دوو ساڵ نانی زەماوەند بەئێمە بدەیت. بەڵام بەم کارە ناتوانی فێڵمان لێبکەیت. وا باش بوو بۆ شەوی زەماوەند بانگهێشتت بکردباین.

چەند جارێك بەنیشانەی ئەوەی کە بێدەنگ بم دەستی ڕاوەشاند و گوتی:

بۆچی خۆت لەگێلی دەدەی؟ من دەمەوێ لەگەڵ تۆدا زەماوەند بکەم و فریشتەش میوانی ئەم زەماوەندەیە! حەپەسابووم و زارم لەحەپەساندا کرابۆوە، فریشتە بەناباوەڕی چاوی لەسەر سامۆئێل ئەبڵەق ببوو. سامۆئێل گوتی:

من وام نیازە ئەمشەو لەگەڵ سادەدا زەماوەند بکەم، هەر بەو هۆیەوە ئێوەم هێناوە بۆ ئێرە. فریشتە گوتی:

دەست لەگاڵتەکردن هەڵبگرە و ئەم ڕۆژە خۆشەمان بەگوتنی ئەم قسە بێهودانەت مەشێوێنە. تورە بوو و بەگۆڕاوی بەرەو ڕووی فریشتە وەرسوڕا و گوتی:

کام قسەیەم بێهودە بوو. گوتم:

سامۆئیل تۆ ئێمەت هێنا بۆ ئێرە کە ئەم قسە پووچانەمان دەرخوارد بدەیت؟

قاقایەکی کرد و گوتی:

پووچ! بێهودە. بۆچی ئێوە ناتانەوێت دانی پێدا بنێن کە قسەکانم نە پووچە و نە بێهودە. من بەڕاستی دەمەوێت لەگەڵ تۆدا زەماوەند بکەم و پاشان تۆ دەتوانیت لەگەڵ هاوڕێیەکەتدا بەئاسوودەیی لێرەدا بژیت. لەلایەکی تریشەوە دەبێت بڵێم کە دایك و باوکت لەمبارەیەوە بێئاگا نین و هەر بۆیە جێگای نیگەرانی نییە. ئاهێك لەدەروونمدا هەستا، گوتم:

تۆ درۆ دەکەیت ئەوان هەرگیز بەم کارە ڕازی نابن و بۆ زانیارییت دەبیّ بڵێم کە ئەگەر ئەوانیش ڕازی بن من هەرگیز ڕازی نابم. زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی کردو گوتی:

هێندە لێرەدا دەمێنیتەوە تا ڕازی دەبیت. گوتم:

هەرگیز ڕازی نابم! تەنانەت ئەگەر چەندین ساڵیش لێرەدا بەندم بکەیت هێشتا هەر ڕێگە بەم زەلیلییە نادەم. ویستم لەژوورەکە بچمە دەرەوە کە دەرگاکە داخرا و دەنگی قوفڵ کردنیم بەر گوێ کەوت. بەرەو دەرگایەکی دیکە چووم، هەر بەو جۆرە بوو. لەپاش کەمێك کۆشك لەشێوەی بەندیخانەیەکدا خۆی دەنواند و من و فریشتە لەو بەندیخانەیەدا ماینەوە. ترس و سام هەموو بوونمانی داگیر کرد، ڕەنگی روخساری فریشتە پەڕی و سپی هەڵگەڕا. دەستەکانی دەلەرزین و بۆ ئەوەی کە بەر بەلەرزینیان بگرێت، دەسکی کورسییەکەی بەتوندی گوشی و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە ڕووی کردە سامۆئیل و گوتی:

تۆ پیاوێکی خاوەن کەسایەتیت. ئەم کارە لەتۆ ناوەشێتەوە. تۆ پێشتر زەماوەندت کردوەو هەروەك من بیستومە هاوسەرەکەیشت گەلێك دەوڵەمەندەو وەك بیستویشمە مەعشوقەگەلێکی زۆریشت هەن. بۆچی دەتەوێت یاری بەچارەنووسی سادە بکەیت؟ مەعشوقەیەك کەمتر یان زیاتر بۆ تۆ چ جیاوازییەکی هەیە؟ داوات لێدەکەم چاو لەسادە بپۆشە و بمانبەرەوە بۆ ماڵ. پێکەنی و گوتی:

بتانبەمەوە بۆ ئەوەی بەخۆم و بەگەوجێتیەکەم پێبکەنن؟ وادەزانیت نازانم دەچن بۆ سەردانی چ دۆستێکتان؟ وا هەست دەکەیت من نازانم سادە عاشق و دلداری مامۆستایە. بۆچی خانم گیان! من هەموو شتێك بەباشی دەزانم. سادە یان دەبێت بۆ من بێت و یان بۆ هیچ کەس! ئەمە دوایین قسەی منە! ئێستا خۆی سەرپشکە. گوتم:

تۆ ئیرەیی بەمامۆستا دەبەیت. ئیرەییەك کە لەسەراپای بوونتدا ریشەی داکوتاوە. تۆ منت دەوێ، چونکە لەبەرامبەرتدا وەستاومەتەوە. کاتێك نەتوانی بەکاڵای رەنگاورەنگ فریوم بدەیت، دەستت بۆ ئەم کارە برد، بەلام دلنیا بە من هەرگیز خۆم بەدەستەوە نادەم. رەنگی ئاسایی خۆی لەدەست دابوو. روخساری رەش داگیرسابوو، لەچاوەکانیەوە بلێسەی ئاگر دەردەپەرین. بەرەو لام هات و شانی راوەشاندم و گوتی:

من تۆ بەدەست دێنم و دەشبینی. من بەهەر رێگایەك بوە پەشیمانت دەکەمەوە. کارێك مەکە ناچاربم بەتوندی لەگەڵتدا بجولێمەوە. دەست لەو کەللە رەقیەت هەلبگرە. من دەتوانم بەهەموو ئارەزوویەکی خۆتت بگەیەنم. تاکوو هەموو تەمەنت لەخۆشیدا بەسەر بەری. بۆچی دەتەوێت شەرابی کامەرانیت قلّپ کەیتەوە؟ گوتم:

من ئەو بەختیارییەم ناوێ. من تۆم خۆش ناوێت. تێگەیشتی؟ تۆ رۆژێك وتت کە عەشق دەکرێ بەپارە بکرِدرێت، بەلام لەبارەی منەوە بەهەڵەدا چوویت. من ئامادە نیم دڵ و گیانم بەپیاوێك بفرۆشم کە خۆشم ناوێت، هەر لەو کاتەدا لەگەڵ گوتنی ئەو رستانەدا بیرم لەراکردن دەکردەوە. ئەگەر فریشتەم لەگەڵدا نەبوایە، لەوانەبوو بمتوانیبا رێگای هەلاتن بۆ خۆم ببینمەوە، فریشتە بەو حاڵە جەستەییەوە هەموو رێگایەکی هەلاتنی لێ بەستبووم.

لەدڵی خۆمدا گوتم، ئەگەر بتوانم فریشتە ڕزگار بکەم، لەوانەیە ئەو بتوانێت یارمەتیم بۆ بنێرێت. کاتێك بێدەنگی باڵی بەسەرماندا کێشابوو، ڕووم کردە سامۆئیل و گوتم:

مۆڵەتی فریشتە بدە با لێرەدا بڕوات. تۆ منت دەوێ کەواتە کارت بەوەوە نەبێت.

فریشتە قسەکەی پێ بڕیم و گوتی:

من تۆ لەگەڵ ئەم دێوەزمەدا بەتەنها جێناهێڵم. هەر پێشهاتێك دێتە پێش، من دەمەوێ لەو کاتەدا لەگەڵت بم. سامۆئیل قسەکەی فریشتەی پەسند کردو بەگاڵتە پێکردنەوە گوتی:

حەق بەفریشتەیە! باش نییە کە مرۆڤ لەشەوی بووکێنیدا چاکترین دۆستی لەگەڵدا نەبێت. وا دەزانی گەوجم کە بهێڵم فریشتە بڕوات؟ گوتم:

تۆ خۆت دەڵێیت دایك و باوکم بەمە ڕازین. کەواتە بۆچی دەترسیت فریشتە لامان بڕوات؟ گوتی:

من ترسم لەهیچ کەس نییە، بەڵام حەز ناکەم عاشقە دڵ بریندارەکەت پێ بنێتە ئێرە، هەر چەند کە بەلامەوە خراپ نییە روخساری ببینم. لەشەوانی کریسمسدا هێندە کەمەندکێشی روخساری تۆ ببوو کە کەسەکانی تری فەرامۆش کردبوو وەك ئەوەی لەجیهانێکی تر بڕوانێ. کاتێك تۆ بەو جل و ملوانکە نایابەوە هاتیتە نێو میوانەکان، هێندەی نەمابوو لەپێستی خۆی دەرچێ. دڵم بەحاڵی ئەو پیاوە بێچارەیە دەسووتێ. ئەو

هێنده‌ی پاره نه‌بوو که به‌بۆنه‌ی ئه‌و شه‌وه‌وه دیارییه‌کت پێشکه‌ش بکات. فریشته گوتی:

مامۆستا عه‌شقی به‌دیاری دا به‌ساده و ئه‌وه‌ش گرانبه‌هاترین دیارییه. سامۆئیل به‌توره‌ییه‌وه سه‌یرێکی کردو گوتی:

تۆش لایه‌نگری مامۆستایت؟ به‌و هه‌موو خۆشه‌ویستییه‌وه که به‌رامبه‌رت نواندم، هێشتا مامۆستا به شایسته‌تر ده‌زانیت؟ فریشته گوتی:

چاکه‌ت له‌گه‌ڵ مندا کرد بۆ ئه‌وه‌ی له‌دڵی ساده‌دا رێگایه‌ک بکه‌یته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر به‌پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌وه بێت و ئه‌گه‌ر به‌ڕاستی به‌رامبه‌ر به‌من چاکه‌ت کردوه، دیسان رێگه نادەم تاکوو به‌و هۆیه‌وه ده‌ست بۆ ساده به‌ری! سامۆئیل به‌توره‌ییه‌وه عاره‌بانه‌که‌ی توره‌هه‌ڵدا. من توانای خۆم له‌ده‌ستدا و هه‌ڵمه‌تم بۆ بردو به‌بۆکس و نینۆک به‌ئاره‌زووی خۆم کوتام. له‌ده‌نگی هاواری ئه‌و موختار هاته ژووره‌وه‌و به‌یه‌ک ده‌ست منی له‌سامۆئیل جیا کرده‌وه‌و خستمی به‌سه‌ر قه‌نه‌فه‌که‌دا. فریشته به‌ئه‌سته‌م توانی هه‌ستێته‌وه و له‌سه‌ر کورسییه‌که دانیشێ. سامۆئیل ڕووی کرده موختار و گوتی:

فریشته ببه ده‌ره‌وه! حه‌ز ناکه‌م ببینم. موختار فریشته‌ی کرده باوه‌ش و له‌گه‌ڵ خۆیدا بردییه ده‌ره‌وه. هه‌وڵ و کۆششی من بۆ ڕزگارکردنی فریشته بێ ئه‌نجام بوو. به‌چاوی پڕ له‌گریانه‌وه ده‌پاڕامه‌وه، به‌ڵام بێ سوود بوو. به‌بردنه ده‌ره‌وه‌ی فریشته، ده‌نگووت ڕۆح و گیانیان له لاشه‌م جودا کردۆته‌وه. له‌خۆمه‌وه چنگم له‌دارو دیوار ده‌دا و داوای ڕزگاریم ده‌کرد. سامۆئیل دانیشت و سه‌ری نایه ناو هه‌ر دوو ده‌ستیه‌وه. نازانم چه‌نده هاوارم کرد که هه‌ستایه‌وه و به‌ڕق و قینه‌وه هاواری کرد:

ئیتر بیبڕه‌وه! توانای بیستنی گریانه‌کانتم نییه. گوتم:

من فریشته‌م ده‌وێ. ئه‌و نابێت ئازار ببینێت. تکا ده‌که‌م ئه‌و بگه‌ڕێننه‌وه. سه‌یر که له‌پێشتدا به‌چۆکدا هاتووم داوات لێده‌که‌م کارت به‌فریشته‌وه نه‌بێت، فرمێسک و لاڵانه‌وه‌کانم به‌زه‌ییان خسته دڵییه‌وه و ده‌رگاکه‌ی کرده‌وه‌و فه‌رمانی به‌موختار دا که

فریشتە بهێنێتەوە بۆ لام. بەجەستەو ڕوخساری شێواوی فریشتە زیاتر گریام. جل و قژی شێواوی تێکەڵاو ببوون. لەئامێزم گرت و گوتم:

فریشتە نیگەرانم. دەستی بەقژمدا هێنا و گوتی:

حاڵی من باشە و ئازارم نەبینیوە، بەڵام داوات لێدەکەم هەر بەڵایەك کە بەسەرم هاتووە بە هێند وەرمەگرە و خۆت بەدەست ئەو پیاوەوە نەدەیت، چونکە ئەو لەبەر بەچۆکداهاتنی تۆ دەیەوێت کەڵك لەمن وەربگرێت، سامۆئیل گوێی لەقسەکانمان بوو و گوتی:

هێدی هێدی خەریکە گریانم دێ. فیداکاری بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێیەك وەك فیلمی هیندی! تەنیا شریتی مۆسیقاکەی کەمە. ئەویش ڕێك دەخەم. تەسجیلەکەی کردەوەو لەگەڵ ئاوازێکی هیندیدا گوتی:

ئێستا تەواوە. تەنیا ڕزگارکەرەکەتان ماوە کە لەدەرەوە بێت و ڕزگارتان بکات! ئایا ڕزگارکەری ئێوە چەکدارە یان بەبۆکس و شەق شەڕ دەکات؟ ئەمەی گوت و قاقا دەستی بەپێکەنین کرد. موختار هاتە ژوورەوە و گوتی:

قوربان خواردن ئامادەیە. سامۆئیل ئیشارەی بۆ فریشتە کردو گوتی:

تۆ ئەو ببە و خۆیشم سادە دێنم. باڵیان گرتین و بردیانین بۆ هۆڵی نانخواردن و لەسەر کورسی دایانیشاندین. من و فریشتە توانای هیچ کارێکمان نەبوو. ڕووم کردە سامۆئیل و گوتم:

ئێستا کە ئیشارەت بۆ فیلمی هیندی کرد، وا باشترە ئەوەش بهێنیتە پێش چاوت کە هیچ کات زاڵم سەرکەوتوو نابێ و هەمیشە مرۆڤە باشەکان سەردەکەون. هێندە پێکەنی کە چاوی ئاوی کرد و گوتی:

بەڵێ... بەڵێ... حەق بەتۆیە، بەڵام من فیلمی "وسترن"ی ئەمریکاییم بەلاوە باشترە. لەفیلمەکانی "وسترن"دا هەمیشە تیرهاوێژی وریا سەردەکەوێ و لاوازەکانیش تێکدەشکێن. من ئەو تیرهاوێژانەم و دەشزانم سەرکەوتن بۆ منە! ئەو بەهەموو خوێنساردییەکەوە دانیشت و دەستی بەخواردن کرد، بەڵام من و فریشتە گێژو حەپەسار

دانیشتبووین و بیرمان لەسەرەنجامی کارەکەمان دەکردەوە. کاتێک نانی تەواوەتی خوارد، بانگی موختاری کرد و گوتی:

پاش ئەوەی کە مێزەکەت خاوێن کردەوە، جلەکان بهێنە. موختار سەری بۆ ڕێزگرتن شۆڕ کردەوەو سەرقاڵی کۆکردنەوەی قاپەکان بوو. پاشان چووە دەرەوەو لەدوای چەند خولەکێک بەجانتایەکەوە گەڕایەوەو خستیە سەر قەنەفەکەو ڕۆیشت. سامۆئیل گوتی:

هەستە ئەو جلانە لەبەرکە! بەمات و مەلوولی سەیرێکم کرد. ئەو چوو بۆ لای فریشتە و هەر بەو جۆرە کە ڕووی لە منەوە بوو، گوتی:

یان ئەو جلانە لەبەر دەکەیت، یان ئەوەیە هاوڕێیەکەت... بەپرتاو هەستامەوەو گوتم:

کارت بەوەوە نەبێت. لەبەری دەکەم، جانتاکەم کردەوەو جلێکی سپی بووکێنیم تێدا بینی. گوتی:

لەبەری کە! گوتم:

بەڵام ... لەمەبەستم حاڵی بوو. بەپێکەنینەوە گوتی:

ئای چەند کچێکی پاکیزەو خاوێنی! شەرم دەکەیت بەبەرچاوی منەوە جلەکانت بگۆڕی! مانای هیچ کاتێک مامۆستا چاوی بەجەستەی تۆ نەکەوتوە؟ ناتەوێت وەڵامم بدەیتەوە؟ چی زووترە جلەکان لەبەر کە! ئەوەی گوت و ڕووی لێ وەرگێڕام. من لەو دەرفەتە کەڵکم وەرگرت و لەپەنجەرەکەوە چوومە دەرەوەو چوومە سەر نزیکترین درەخت کە لەبەرامبەرمەوە بوو، بەڵام بەدەنگی پێکەنینەکەی لەدڵەوە لەرزیم. سامۆئیل بەدەنگی بەرز گوتی:

گەوج مەبە و بگەڕێرەوە، ئەگەر وا نەکەیت، هاوڕێیەکەت ئەو کارە لەئەستۆ دەگرێ و لەجێگەی من موختار دەبێت بەزاوا! گیانم کەوتە لەرزین، لەبیری ئەوەدا کە ئەو پیاوە لاقەی فریشتە بکات، هێندەی نەمابوو بێهۆش ببم. لەدرەختەکە هاتمە خوارەوەو لەهەمان پەنجەرەوە چوومە ژوورەوە. جگەرەیەکی داگیرساند و گوتی:

دەمزانی کچێکی گەوج نیت و کاری نەفامانە ناکەیت. ئێستا لێم بگرە و لەبەری کە! جلە سپییەکانی بۆ هەڵدام و منیش بەناچاری بەبەرچاوی ئەوەوە پۆشیم. گوتی:

پرچت شانە بکە! هەروەك ئەو وتی وامکرد. هاتە لامەوەو قۆڵی گرتم و گوتی:

ئێستا ئێمە بەپێیان تاکوو پەردە دەڕۆین و هاوڕێیەکەشت لەگەڵتدا دەبێت. فریشتە نیوەگیان ببوو کە بەئەستەم بەرگری لەسەرخۆچوونی خۆی دەکرد. من دەمزانی کە ئەو توانای ئەو هەموو ناهەمواریيەی نییە. تێگەیشتم کە هەموو شتێك بۆ من کۆتایی هاتوە. ڕووم کردە سامۆئیل و گوتم:

ئازاری فریشتە مەدە. ئەو تاوانێکی نییە. لێگەڕێ پشوو بدات و بەڵێن بدە موختار کاری بەسەرییەوە نەبێ. گوتی:

لەبەرامبەردا چی؟ گوتم:

هەرچییەك تۆ بڵێی ئەنجامی دەدەم. پێکەنی و گوتی:

ئێستا کچێکی تێگەیشتوویت.

لەبەیانییەوە دەتتوانی بەمجۆرە بی و ئەو هەموو ئەزیەتەی من و خۆشت نەدەیت.

فریشتە بەرقەوە گوتی:

سادە شێت مەبە! تکا دەکەم خۆت بەدەستەوە مەدە. ئەگەر خۆت بەدەستەوە بدەیت، خۆم دەکوژم. باوەڕ بکە ڕێك ئەو کارە دەکەم! کەواتە ئەگەر منت خۆش دەوێت و ئەگەر ژیانی منت بەلاوە بەنرخە، خۆت بەدەستەوە مەدە. من ئەگەر بەدەستی ئەوان بکوژرێم باشترە لەوەی کە ئەو پیاوە چەپەڵە بەخواستە شوومەکەی خۆی بگات. ڕووم کردە سامۆئیل و گوتم:

بیستت چی گوت؟ ئایا تۆ ئامادەیت بۆ ڕازیکردنی ئارەزووی خۆت دوو کەس بەکوشت بدەیت؟ وەرەوە سەر خۆت و گوێ بۆ هاواری ویژدانت بگرە. تۆ پیاوێکی باشی و بۆ خۆشت خاوەنی پلە و پایەیت. بەدەست بەسەراگرتنی من چیت پێ دەبڕێ جگە لەوەی کە دەبێتە بکوژی دوو مرۆڤ؟ سەیر کە چۆنچۆنی لەبەردەمتدا بەچۆکدا هاتووم و دەپاڕێمەوە؟ لەمە زیاتر چیت دەوێ؟ گوتی:

هەر ئەوەیە کە گوتم. من سێ ساڵە گشت سووکایەتی پێکردنەکانی تۆم بەگیانم کڕیوەو دانم بەخۆمدا گرت، بەڵام ئیتر نۆبەی منە. تۆ دەبێت باجی سەرسەختییەکانی خۆت بدەیت. گوتم:

ئایا ئەوەی کە من بەرامبەرت بەچۆکدا هاتووم و لێت دەپاڕێمەوە بەس نییە؟ گوتی:

نەخێر بەس نییە! من دەتوانم کارم بەسەر تەوە نەبێت و هەردوکتان ڕاست و دروست بیەمەوە ماڵی خۆتان، بەڵام لەبەرامبەردا دەمەوێت ببیتە کارەکەرم! هەر بەو جۆرەی کە بۆ مامۆستا ئازیزەکەت کار دەکەیت، بەلای منەوە گرنگ نییە هەمان ئەو کارانە ئەنجام بدەیت. حەز دەکەم هەر کاتێك کە دێمەوە بۆ ئێران تۆ خزمەتم بکەیت و میواندارێم لێ بکەیت. عەیبی چییە کە مرۆڤ خزمەتی دوو کەس بکات؟ ئای ببوورە، فریشتەم لەبیر کرد، چ گرفتێکە کە مرۆڤێك بتوانێت بەکەڵکی سێ کەس بێت؟ ئەگەر ئەم کارە پەسەند بکەیت منیش کارێکم بەکارتەوە نییە. ئێمە وەك دوو دەستگیرانی هەتا هەتایی ناو دەردەکەین! فریشتە گوتی:

بەڵام ئەمە داواکارییەکی نابەجێیە. بەڵکو سادە ویستی زەماوەند بکات. ئەو کاتە چی؟ سامۆئیل پێکەنینێکی کرد و گوتی:

لەوەدا سادە خۆی سەرپشکە کە لەگەڵ مندا زەماوەند بکات یان بەکچی بمێنێتەوە و تەنها کارەکەرم بێت. ئەو لەهەموو حاڵەتەکاندا هەر هی خۆم دەبێت. ئێستا ئارەزووی خۆیەتی، فریشتە گوتی:

بەڵام تەمەنی جوانی لەپێناو تۆدا لەبەین دەچێت. پێکەنینێکی گاڵتەئامێزی کردو گوتی:

بۆ سادە چ جیاوازییەکی هەیە، لەماڵی مامۆستاشدا تەمەنی جوانی لەبەین دەچێت، بەڵام من لەبەرامبەردا ژیانی دابین دەکەم و هەرچییەك ئەو بیەوێت بۆی فەراهەم دەکەم. ئیتر ئارەزووی خۆیەتی. زۆرێك ئامادەن لەبەرامبەر ئەو پێشنیارەدا تەنانەت خۆشیان بەدەستەوە بدەن بەڵام .... من چومە ناو قسەکانیەوە و گوتم:

مەرجەكەت قەبولّ دەكەم، بەلاّم ڕاستگۆیانە پێت دەڵێم كە ناتوانم.. قسەكەی پێ بڕیم و گوتی:

دەزانم دەتەوێ چی بڵێیت. من پێشبینی دەكەم كە ڕۆژێك وەك ئەمڕۆ لەبەرامبەرمدا بەچۆكدا بێی و داوام لێ بكەیت زەماوەندت لەگەڵ بكەم، بەلاّم ئیتر ئەو ڕۆژە تۆم ناوێ.

فریشتە گوتی:

پێشبینیەكی بێ شەرمانەیە! ئایا تۆ هێندە خۆت بەنەفس بەرز نابینیت كە چاو لەكیژێك بپۆشیت؟ بەگاڵتە پێكردنەوە گوتی:

من چاوم لەسادە پۆشیوە تەنها شتێك دەمێنێتەوە، ئەگەر ئەو نایەوێت بۆ من بێت كەواتە نابێت بۆ هیچ كەسێكی تریش بێت. گوتم:

من قەبوڵم كرد ئێستا بمانبەرەوە بۆ ماڵ. گوتی:

ئەم كارە دەكەم و بۆ پشت ڕاستكردنەوەی قسەكەشم سەرەتا هەنگاو بۆ دابینكردنی ژیانی تۆ دەنێم. من ئەم كۆشكەم بۆ تۆ كڕیبوو، تاپۆكەش لەسەر خێزانەكەی تۆیە. تۆ دەتوانی لێرە كەڵك وەربگری، بەلاّم هەرگیز مافی فرۆشتنیت نییە. هەرچییەك لێرەدا دەیبینی تایبەتە بەتۆ. هەتا دەتوانی میوانداری دۆست و خۆشەویستەكانت لێرەدا بكەیت و ئاسودە بیت. هەموو كەسێك جگە لەمامۆستا. پاشان دەستەكانی لەملم كردو بەردەوام بوو:

بزانە من چ دەستگیرانێكی ڕاستگۆم! هەر بەو جۆرەی كە خۆم لەژیاندا چێژ دەبینم ئەو مۆڵەتەش بەتۆ دەدەم كە دڵخۆش بیت و خۆش ڕابوێریت. تەنها مۆڵەتی زەماوەندت نییە! من قسەم لەگەڵ دایكت كردوە و داوام لێكرد كە لەبچووكترین هەڵسوكەوتت ئاگادارم بكاتەوە، بزانم خەریكی چیت. ئێستا خۆت بۆ گەڕانەوە ئامادە بكە. هەر بەو شێوەیەی كە سامۆئیل گوتبووی تاپۆی كۆشكەكەی كردبوو بەناوی دایكمەوە. باوەڕ دەكەیت كە دایكم سیخوڕی دەكرد و بچووكترین هەڵسوكەوتمی لەبەر چاو دەگرت و پاشان هەواڵی بەسامۆئیل دەدا؟ ئەو كارەی كە ئەو دەیكرد بەخەیاڵی خۆی بۆ چاودێری ئابڕووی كچەكەی بوو. دەیویست چاودێری بكات تا كاتێك كە زاوا دێت و بەڕووسوری

دەیدانە دەستی و پێی بڵێ دەستگیرانەکەت بێ لەکە و دەست لێنەدراوە! ڕووداوی ناو کۆشکم بە وردی بۆباسکرد، بەڵام لەباتی ئەوەی بێتەوە سەرخۆ و لەوە ئاگادار بێت کە سامۆئیل ئەو زاوایە نییە کە ئەو بۆی چووە، قسەکانمی بەجۆرێکی کە لێك دایەوەو گوتی:

لەڕاستیدا سامۆئیل پیاوێکی بەڕەوشتە کە دەستی لێ نەداوی. گوتم:

بەڵام دایکە گیان ئەگەر تکا و پاڕانەوەکانی من و فریشتە نەبوایە، ئەم کارە شەیتانییەی ئەنجام دەدا. بەڵام ئەو بەخوێنساردییەوە گوتی:

نە، ئەو هیچ کاتێك دەستی بۆ ئەو کارە نەدەبرد، چونکە بە منی گوتبوو کە دەیەوێت تەنها تۆ بترسێنێت و نیشانتی بدات کە ئەگەر ئارەزووی لێ بێ دەتوانێت بەدەستت بێنێت. بەڵام بەنیازە تۆ بەدڵ ئەو قەبوڵ بکەیت و ببیت بەهاوسەری. تۆ وادەزانی ئەگەر من بمزانیبا کە ئەو، ئەو کارە دەکات دەمهێشت ئێوە لەگەڵ خۆیدا ببات؟ ئەو نیازی لاقەکردنی تۆی نەبوو دڵنیا بە! ئەو قسە و باسانەم بەبێهودە دەزانی و چیتر لەو بارەوە قسەم نەکرد. هەتا ئەگەر قسەکانی دایکم ڕاستیش بووبن ئەو مەبەستی لاقەکردنی نەبووبێت، بەڵام سەرکەوتوو بوو لە کارەکەیدا کە بەدرێژایی تەمەن من ئەسیری خۆی بکات. من وەك باڵندەیەکی بەندکراو لەقەفەسێکی ئاڵتونیدا باڵم دەگرت و ڕێگای دەربازبوونم نەدەبینییەوە. چەند جارێك ویستم هەڵبێم پەنا بەمامۆستا ببەم، بەڵام لەترسی ئەوەی کە نەبادا سامۆئیل زیانی پێبگەیەنێت، پەشیمان دەبوومەوەو بۆ ڕێگای ڕزگاری دیکە دەگەڕام. تەنها من نەبووم کە گیانم لەمەترسیدا بوو. فریشتەش گیانی لەمەترسیدا بوو. ئەگەر من ڕامبکردایە فریشتە لەژێر دەستی ئەودا بەند دەبوو. بەهۆی فریشتەوە دەیتوانی منیش بەند بکات. ڕۆژێك عەتا هات بۆ سەردانمان. من و فریشتە هێندە مەلوول و ڕەنگ پەڕیو بووین کە عەتا چاوی پێمان کەوت، پرسی:

دەڵێی ناساغن؟ دەمتوانی چی بڵێم؟ بەئامادەبوونی دایکم، کە بەوریایی چاودێریی دەکردین، توانای قسەکردنمان لەدەست دابوو. هەوڵمدا ڕووپۆشی ئارامی بەڕوومدا بدەم و گوتم:

ڕاستیەکەی حاڵی هەردوکمان باشە و هیچ نەخۆشییەکمان نییە. چۆن بوو یادت کردین و هاتیت بۆ سەردانمان؟ هەڵسوکەوت و جوڵەی ناهاوسەنگم ئەوی خستە گومانەوەو دەرکی کرد کە کارەساتێك ڕوویداوە، بەڵام نەمانتوانی ڕوونی بکەینەوە. بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕام تاکوو ئاگاداری بکەم و داوای لێبکەم فریشتە لەگەڵ خۆی ببات. بەبیانووی خزمەتکردنی چوومە چێشتخانەکەوەو بەپەلە لەسەر پارچە کاغەزێك نوسیم "فریشتە گیانی لەمەترسیدایە و لەگەڵ خۆتدا بیبیە." و کاغەزەکەم چەند جارێك نوشتاندەوەو بچووکم کردەوە و خستمە بن ژێرپیاڵەکەوەو گەڕامەوە بۆ ژوورەکە. پیاڵەکەم دایە دەستی و هەر لەوکاتەدا بەچاو ئیشارەیەکم کردو تێم گەیاند کە شتێك لەبن ژێرپیاڵەکە دایە. بەهەر دوو دەستی گرتی و سوپاسی کرد، بەڵام پیاڵەکەی لەسەر مێزەکە دانەناو لەکاتێکدا هەوڵی دەدا خۆی تێك نەدات، گوتی:

چەندە ماندوو بووم! ئەم پیاڵە چایە بەتەواوەتی لەجێی خۆیدا بوو. پارچە کاغەزەکەی لەدەستیدا گوشی و گوتی:

بمبەخشن، پاشان هەستایەوەو بەرەو ئاودەستەکە چوو. دایکم گوتی:

وا هەست دەکەم ئەمڕۆ عەتا حاڵی باش نەبێت. ڕەنگ پەڕیو دێتە بەرچاو. گوتم:

لەڕاستیدا ئەویش هەمان بۆچوونی لەبارەی ئێمەوە هەیە. من واهەست دەکەم لەبەر ڕوناکی ئەم گڵۆپانەیە. کاتێك عەتا گەڕایەوە، پیاڵە چاکەی خواردەوەو ڕووی کردە فریشتە و گوتی:

ئاگاداری پێشانگایەك بۆ کاری وێنەکێشە لاوەکان دەکرێتەوە؟ فریشتە بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

نەمزانیوە. چونکە بڵاوکراوەکان شتێکیان لەمبارەوە نەنوسیوە. عەتا جەختی لەسەر کردو گوتی:

بەڵێ، هێشتا بەڕەسمی ڕانەگەیەنراوە. من و مامۆستا چاوەڕوانین تۆش لەم پێشانگایەدا بەشداری بکەیت. ئەگەر ئەمڕۆ کاتت هەبێت، پێکەوە دەچین. فریشتە گوتی:

ئەگەر سادەش بێت قسەیەکم نییە. بەخۆشحاڵییەوە لەچەپڵەم دا و گوتم:

بێگومان دێم، بەڵام دایکم خۆی تێهەڵقورتاندو گوتی:

بەڵام سادە تۆ نابێ بڕۆیت چونکە دەزانی... لەترسی ئەوەی نەبادا فریشتە نەخشەکەم تێك بدات گوتم:

بەڵێ، ڕاست دەکەی، پاشان ڕووم کردە فریشتە و گوتم:

فریشتە گیان تۆ بڕۆ، منیش ئەگەر هەلم بۆ هەڵکەوت دێم و لەپێشانگایەکەدا دەتبینم. دەیویست لێو هەڵبێنێتەوە کە عەتا پێش دەستی کرد و گوتی:

کەواتە زووتر خۆت ئامادە بکە بابڕۆین. تا عەتا دایکمی بەقسە سەرگەرم کرد، فریشتەم بردە ژوورەکەی خۆمان و بەپەلە مەبەستی خۆمم تێگەیاند و داوام لێکرد چەند ڕۆژێك میوانی عەتا بێت تاکوو من بتوانم ڕێگەیەکی شیاو ببینمەوە. مات و پەشێو بوو، گوتی:

دەترسم دەست بۆ کارێك بەری کە کێشە بۆ خۆت دروست بکەی. گوتم:

نە، دڵنیابە. کارێکی وا ناکەم کە پەشیمان ببمەوە، ئێستا بڕۆ و تاکوو ئاگادارت نەکەمەوە هەر لەوێدا بمێنەرەوە، ئەوەش بزانە کە تەنها ئەمشەو دەتوانی پەیوەندیم پێوە بکەیت نەك ڕۆژانی تر! من هەوڵ دەدەم خۆم پەیوەندیت پێوە بکەم. تێگەیشتی؟ دەستی گرتم و گوتی:

بەڵام سادە من زۆر دەترسم. گوتم:

مەترسە! من ئەگەر بزانم شوێنەکەت باشە، بەخەیاڵی ئاسوودەوە نەخشەکەم دەست پێدەکەم، بەڵام ئەگەر تۆ لە لامدا بیت، ئازاد نیم. لەمەبەستم تێدەگەیت؟ بەڕاوەشاندنی سەری قسەکەمی پەسند کردو لەو کاتەدا کە ئەو خەریکی گۆڕینی جلەکانی بوو، بەپەلە چەند دەست جل و کەلوپەلی پێویستیم خستە ناو جانتای کەرەستەی نیگارکێشیەکەیەوە و گوتم:

کاتێك لێرە دەچیتە دەرەوە، لەسەر خۆ بەو دان بەخۆتدا بگرە. دایکم گەلێك بەدەرکە. نامەوێ بۆنی ئەم کێشەیە بکات. گوتی:

هەوڵدەدەم. گوتم:

بەچیە عەتا تێگەیەنە هیچ کارێك نەکات، تێگەیشتی؟ ئەگەر ئەو بیەوێت کارێك بکات، هەموو ڕەنجی من بەئاوا دەدات. تۆ لەزمانی منەوە داوای لێبکە ئارام بێ و دەست بۆ هیچ کارێك نەبا. ئێستا برۆ دەرەوە. فریشتە عارەبانەکەی جوڵاند و لەژوورەکە چووە دەرەوە. من چەند سائێك ئارامم گرت و چەند هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا تاکوو حاڵم ئاسایی بێتەوە. کاتێك تێکەڵاوی ئەوان بووم، گەڕابوومەوە حاڵەتی سرووشتی خۆم. لەکاتی جیابوونەوەم لێیان لەگەڵ گوتنی بەهیوای دیدار، دەرگای ماڵەکەم داخست. شادییەکی تەواوم لەناخمدا هەست پێدەکرد. من فریشتەم لەم زیندانە ئاڵتوونییەدا ڕزگار کردبوو. ئەو ئیتر دەیتوانی بەئازادی بای باڵی خۆی بدات. شەو بوو کە تەلەفۆنی کرد. هێندە خۆشحاڵ بووم وەك بڵێی ساڵانێکە گوێ بیستی دەنگی نەبووم. فریشتە گوتی:

عەتا لەهەموو شتێك ئاگادارەو قەبوڵیشی کردوە کە هیچ کارێك نەکات، بەڵام بۆ تۆ نیگەرانە و دەیەوێت بزانێ کە تۆ چ نەخشەیەکت لەسەر دایە. دایکیشم دانیشتبوو و گوێی بۆ قسەکانمان گرتبوو. پێکەنینێکی دەستکردم کردو گوتم:

هەر ئاوا! کەواتە دەتەوێت سەفەر بکەیت، کەمێك پەلە مەکە. ڕووم کردە دایکم و گوتم:

فریشتە لەپێشانگادا هەندێك لەدۆستەکانی بینیوەو ئەوان داوایان لێکردوە کە ببێتە میوانیان و وادیارە نیازی سەفەری هەیە. فریشتە دەیەوێت بپرسێت کە ئایا ئێوە ئەو ڕێگایەی پێدەدەن یان نا؟ دایکم بەڕووخۆشییەوە پەسەندی کرد. خەیاڵی چی لەسەر دابوو کە پێی وابوو بەبێ فریشتە باشتر دەتوانێت چاودێریم بکات. بەفریشتەم گوت:

فریشتە دایکم ڕازییە کە ببیتە میوانی دۆستەکانت و لەگەڵیاندا سەفەر بکەیت، بەڵام دەخوازین بەباشی چاودێری خۆت بکەیت و ئاگات لەخۆت بێت! تێگەیشتی؟ فریشتە گوتی:

لەمەبەستت تێدەگەم. هیوادارم تۆش ئاگات لەخۆت بێت و خۆت بپارێزیت.

"١٤"

لەپاش ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنییە، بیرکردنەوە لەفریشتە پەلکێشی کردم و لەخۆم پرسی:

هەنگاوی دوایی کامەیەو دەبێ چی بکات؟ دایکم لەبینینی من کە نوقمی دەریای خەیاڵ ببووم، پرسی:

بۆ فریشتە دڵتەنگی؟ زەردەخەنەیەکم کردو گوتم:

بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن بتوانم ئازاری دووری بکێشم. گوتی:

تا تۆ بیری لێدەکەیتەوە، ئەو چەندرۆژە کۆتایی دێ و دەگەڕێتەوە. ئارەزووت دەکرد لەجێگای ئەو بوایەیت؟ گوتم:

لەو رۆژەوەی کە ئێوە منتان کردە دەستگیرانی سامۆئیل، خەونی ئازادیم لەناو چووەو وەك بەندکراوێك وام کە کۆت و زنجیریان لەدەستو پێی ئاڵاندووە ! گوتی:

ئەگەر تۆ دایك بوایەی تێدەگەیشتی کە هەموو ئەم کارانە لەبەر تۆ کراوە. سامۆئیل پیاوێکی هەستیارو وردبینە. نامەوێت وا هەست بکات کە ئێمە بەباشی چاودێری دەستگیرانەکەی ناکەین. نازانیت کاتێك تەلەفۆن دەکات چۆن هەواڵت دەپرسێت. دەیەوێت لەبچوکترین هەڵسوکەوتت ئاگادار بێت، کە تۆ چ کەسێکت بینیوەو لەگەڵ کێدا گفتوگۆت کردوە. بۆ کوێ چوویت و ... چی بڵێم. پوختەی قسە دەیەوێت هەموو شتێك لەبارەی تۆوە بزانێت. گوتم:

ئێوە منتان پێ فرۆشتوە ! تورە بوو و گوتی:

هەرگیز! ئێمە کچی خۆمان نافرۆشین. لەتەنیشتیەوە دانیشتم و گوتم:

بەڵام دایکە، باوەڕ بکە کارێکی واتان کردوە. ئێوە ئەو کچەی کە بۆ گەورەکردن و پەروەردەکردنی زەحمەتێکی زۆرتان کێشا، سەرەنجام بەسامانەکەی سامۆئیلتان فرۆشت، من هەرگیز لەم کارەتان نابوردم. زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەی کردو گوتی:

ئێمە ئەگەر ڕازی بوایەین ببیتە هاوسەری ئەو مامۆستا ڕووتەڵەیە، کە هەناسەیەکی تێدا نییە تاڵەگەڵ ناڵەدا مامەڵە بکات، ئەوکاتە باوك و دایکێکی دڵسۆز بووین و تۆمان بەختەوەر کردبوو، بەڵام ئێستا بووینەتە خراپترین مرۆڤی سەر زەوی، وایە؟ گوتم:

من دەزانم کە تۆ و باوکم خۆشبەختی منتان دەوێ هەر لەبەر ئەوەش منتان پێگەیاند و گەورەتان کردم. بەڵام سوێند بەخوا ئەم کارەی ئێوە بوە هۆی نابوودکردنم. ئێوە دەتانەوێت هەموو تەمەنم بەدەستگیرانی، یان دڵخوازی کەسێك بمێنمەوە کە خۆشم ناوێت؟ لەکاتێکدا کە ئێوە لەخۆم باشتر ئەمە دەزانن، کە تا کاتێك هاوسەرەکەی زیندوو بێت ئەو ناتوانێت هاوسەرێکی تر هەڵبژێرێت! کەواتە بۆچی دەتانەوێت من چارەڕەش بکەن؟ گوتی:

بەڵام ئەوان وایان نیازە لێك جودا ببنەوەو ئیتر بەربەستێك بۆ زەماوەندی ئێوە لەئارادا نامێنێت. گوتم:

سامۆئیل ئەمەی گوت؟ تۆ دەزانی ئەگەر سامۆئیل هاوسەرەکەی تەڵاق بدات، نیوەی زیاتری سامانەکەی لەدەست دەچێ. سامانێك کە هی خەزوریەتی. دایکە ئایا بیرتان لەوە نەکردۆتەوە کە بۆچی سامۆئیل زەماوەندی لەگەڵ ئەو کچەدا کرد؟ کەسانی سەرمایەدار هەمیشە بەدوای کەسانێکەوەن کە سامانەکەیان زیاتر بکات، نەك ئەوەی کە لەناوی ببات. من چیم هەیە کە سامۆئیل بیەوێت لەبەر ئەوە چاو لەو هەموو سامانە بپۆشێت؟ جگە لەمەش، نیوەی سامانی خۆی بەو هۆیەوە لەدەست بدات! دایکە، ئێوە هێندەش بیرتەسك نەبوون، سامۆئیل تەنها مەعشوقەی دەوێ و بەس! ڕاوەستاوی و یەك هەڵوێستی من لەبەرامبەر ویستە ئاژەڵییەکانی ئەودا وای لێکردوە کە بەهەر نرخێك بووە بەدەستم بێنێ. ئایا دەزانی ئەگەر سەرکەوتوو بێت، چیم بەرامبەر دەکات؟ دواجار وەك

کونەکاغەزێکی بێ کەڵک فڕێم دەدات. دڵنیابە ئەو کارە دەکات! من زۆرتر لەوەی خەم بۆ خۆم بخۆم، دڵم بەحاڵی ئێوە دەسووتێ، کە لەو دونیا چ وەڵامێکی دایك و باوکم دەدەنەوە؟ چییان پێدەڵێن؟ ئایا دەتوانی بڵێیت کە جگەرگۆشە ئازیزەکەی ئەوانتان بەدەستی خۆتان لەبەین برد؟ چاکم لەیادە کە تۆ و باوکم چەندین ساڵ لەبەر ئەو میوانداریییەی ئەوان لەخۆتان خۆش نەدەبوون، مەگەر ئێوە نەتاندەگووت کە ئەگەر دایك و باوکمتان بانگهێشت نەکردایە ئەوان زیندوو و تەندروست دەمانەوە؟ باوك و دایکم لەکارەساتێکی سرووشتیدا گیانیان لەدەستدا، بەڵام ئێوە بەدەستی خۆتان یادگارییەکەی ئەوان دەفەوتێنن. قسەکانم فرمێسکی لەچاوانی هێناو گوتی:

ئایا تۆ بەڕاستی وا بیر دەکەیتەوە کە ئێمە مەبەستی لەناوبردنی تۆمان هەیە؟ گوتم:

بەڵێ، وای بۆ دەچم و ئەگەر جارێکی تر بتەوێت لەم کارە بەردەوام بێت، ناچار دەبم خۆکوژی بکەم، بەڵام لەپێشدا پێتان بڵێم ئەگەر ڕۆژێ هەنگاوێکی وامنا ئەوە تۆو باوکم بەرپرسیاری مەرگی منن. ئەوانەم گوت و پەنام بۆ ژوورەکەم برد. گوێم لەدەنگی گریانی بوو، بەڵام خۆم تێنەگەیاند. کاتێك باوکم هاتەوە، ئەو هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردەوە و ئەو قسەیەی کە ئەوان بکوژی منن، چەند جارێك دوبارەی کردەوە. کاتێك هەردووکیان هاتن بۆ ژوورەکەم، من ئەوانەی بەدایکم گوتبوو دوبارە بەباوکیشم گوتەوە. ئەوان بۆ ماوەیەك لەیەکتر ڕامان و کەوتنە بیرکردنەوە. دواجار باوکم بێدەنگی شکاندو گوتی:

ئێمە وامان دەزانی کە خۆشبەختی تۆمان دەستەبەر کردوە، بەڵام وادیارە بەهەڵەدا چووبین. گوتم:

خۆشبەختی من بەسەروەت و سامانی سامۆئیل دەستەبەر نابێت. باوەڕ بەمە بکەن. باوکم گوتی:

ئێستا دەبێت چی لەسامۆئیل بکەین؟ دایکم گوتی:

تـــاپۆی کۆشـــکەکەی بـــۆ دەنێرینـــەوە و دەڵـــێین کـــە ســـادە دەســـتگیرانیەکەی هەڵوەشاندۆتەوە. گوتم:

بەو ئاسانییەش نییە. ئەو بەڵێنی لێ وەرگرتووم کە ئەگەر پەیمان بەو بەڵێنەوە نەکەم، ئەوا گیانی خۆم و فریشتەش لەمەترسیدا دەبێت. باوکم پەسەندی کرد و گوتی:

بەڵێ ئەو کارەی لەدەست دێت، چونکە ئەو کەسانێکی وا دەناسێت لەبەر پارە ئامادەن دەست بۆ هەموو کارێکی دزێو بەرن. گوتم:

دەبێت رێگایەك بدۆزینەوە کە ژیرانە بێت. من بۆخۆم نیگەران نیم، بەڵام دەترسێم زیان بەفریشتە بگەیەنێت و لەرێگای ئەوەوە تۆڵە لەمن بکاتەوە، باوکم چەند جارێك سەری راوەشاندو گوتی:

بەڵێ، بەڵێ، گیانی ئەو کچە بێچارەیەش لەمەترسیدایە. بریا هەرگیز ئەوت نەهێنایەتە ئێرە. ئامێکم هەڵکێشا و گوتم:

بریا پێی سامۆئیل هەرگیز نەهاتایەتە ئێرە. دایکم جەختی لەسەر قسەکە کردەوەو گوتی:

کار لەکار ترازاوە و دەبێت بەوردی بیری لێ بکەینەوە. گوتم:

من دەبێت بۆ ماوەیەك لەئێوە دوور بکەومەوە. دەڕۆم بۆ شوێنێك کە سامۆئیل نەتوانێت بمدۆزێتەوە. کاتێك لەدۆزینەوەم نائومێد بوو، بێ هیوا دەبێ و دەستم لێ هەڵدەگرێت. باوکم پرسی:

بەڵام دەتەوێت بۆ کوێ بچیت؟ لەهەر شوێنێکدا بیت دەتدۆزێتەوە! مەگەر نازانیت ئەو کەسانێکی دەستڕۆشتوی زۆری لەبەر دەستدایە؟ دایکم گوتی:

وا باشترە بڕۆیت بۆ ماڵی مامۆستا، باوکم نارەزایەتی نیشاندا و گوتی:

نەخێر، سامۆئیل بۆ بینینەوەی سادە، یەکەم جێگا دەچێتە ماڵی مامۆستا. نە ماڵی مامۆستا و نە ماڵی عەتا هیچ کامیان شوێنی دڵنیایی نین! بۆ ماوەیەك هەموومان کەوتینە بیرکردنەوە. باوکم بێدەنگی شکاند و گوتی:

من هاوەڵێکم هەیە کە لەیەکێك لەگوندەکانی باکووردا دەژی. وا باشترە سادە چەند مانگێك لای ئەوان بمێنێتەوە، پاشان بزانین چی روو دەدات. پاشان ڕووی کردە دایکم و گوتی:

تۆیش هەر کاتێك ساموئیل تەلەفۆنی کرد، هیچ شتێك لەبارەی سەفەری سادەوە مەدرکێنێ، وای نیشان بدە وەك بڵێی ئەو هێشتا لەم ماڵە دایە و لەگەڵ ئێمەدا دەژی.

پرسی:

ئەگەر ویستی لەگەڵ سادەدا بدوێ چی پێ بڵێم؟ باوکم تووڕە بوو و گوتی:

درۆیەکی بۆ بتاشە. بڵێ خەوتوە، خۆی دەشوات، چۆتە دەرەوە بۆ شت کڕین. چی بڵێم. خۆت شتێك ببینەرەوە! گوتم:

باوکە من ڕۆژانە تەلەفۆنتان لەگەڵدا دەکەم و ئێوەش لەڕوداوی هەر پێشهاتێك ئاگادارم بکەنەوە. ئەوان قەبوڵیان کردو دایکم بۆ هێنانی چا ئێمەی بەتەنها جێهێشت. لای باوکم دانیشتم و پێم گوت:

باوکە گیان حەز دەکەم بەتایبەتی لەگەڵ تۆدا بدوێم، بەجۆرێك کە دایکم ئاگادار نەبێت. باوکم هەستایەوەو سەیرێکی هۆڵەکەی کردو کاتێك دڵنیا بوو دایکمی لێ نییە گوتی:

زوو بە تا نەگەڕاوەتەوە. گوتم:

دایکم گەلێك چاك و میهرەبانە، بەڵام زوو کاری تێدەکرێت. دەترسم ساموئیل بتوانێت لەژێر زمانی دایکمی دەربکێشێت کە من لەکوێدا دەژیم. ئەگەر ڕات لەسەر بێت ناچم بۆ باکوور و هەر لەتاراندا دەمێنمەوە، بەڵام بەدایکم نەڵێیت. بائەو هەروا بزانێت کە بەرەو باکوور چووم. پرسی:

زۆر باشە، دەتەوێت بەرەو کوێ بچیت؟ گوتم:

جێگایەك کە هیچ کەسێك بەخەیاڵیشیدا نایەت. پرسی:

چ شوێنێك؟ گوتم:

کۆشکەکەی ساموئیل!

- بەڵام ئەوێ شارە زەردەواڵەیە؟

- نە باوکە گیان، جێگایەکی تر نییە لەوێ دڵنیاتر بێت. ئەو هەر بەخەیاڵیشیدا نایەت من لەوێدا خۆم حەشار دابێت. ئەو هەموو شوێنێك دەگەڕێت، جگە لەکۆشك.

ـ زۆر باشە، دەتەوێت چۆن بچیتە ناوەوە؟ تۆ کە... ئا بیرم هاتەوە! ئێمە قەواڵە و کلیلی کۆشکمان هەیە. گوتم:

تەنها ئەوانە بەسە. یەکێك بۆم جۆر بکات. کاتێك سامۆئیل هات. کلیل و قەواڵەکەی بداتەوە. دڵنیا بە هێندە بیری لەلای دۆزینەوەی من دەبێت کە فرۆشتنی کۆشکەکەی لەبیردا نامێنێت. ئەو تا ئەو کاتەی کە نائومێد دەبێ و دەڕوات، من لەوێدا دەمێنم. پرسی:

ئەگەر تۆی لەوێدا بینی، چی پێ دەڵێیت؟ پێکەنیم و گوتم:

ئەو کۆشکە تایبەتە بەمن، چ وەڵامێك لەوە باشترە کە بۆ ئاسودەیی ئەوێم هەڵبژاردوە! باوکم دەستی بەپێکەنین کردو گوتی:

چ دیمەنێك دەبێت! دەتوانم بیهێنمە پێش چاوم. بەڵام فریشتە چی؟ ئایا ئەویش لەگەڵ خۆتدا دەبەیت؟ گوتم:

وا هەست دەکەم ئەگەر فریشتە لەگەڵ مندا بێت، هیچ ئازارێك نابینێ. بەڵێ ئەویش دەبەم. هەرچەند وای بۆدەچم ئەگەر ئەوم لەگەڵدا نەبێت ئاسان تر کارم بۆ دەکرێت، بەڵام ئەگەر بەو حاڵەوە لەگەڵ خۆمدا بێت، باشترە. باوکم گوتی:

کۆشك تەلەفۆنی هەیە؟ گوتم:

بەڵێ، بەڵام ژمارەکەی نازانم. گوتی:

لەپاش یەکەمین پەیوەندی، تۆ ژمارەکەی بەمن دەڵێی و منیش هەر کاتێك بەچاکم زانی تەلەفۆنت بۆ دەکەم. نهێنی من و تۆ ئەوە بێت هەر کاتێك تەلەفۆنم بۆ کردی، سەرەتا سێ جار زەنگ لێدەدەم و دایدەخەمەوە. پاشان دەیکەمەوە. بەوەدا بزانە منم. گوتم:

بەو شێوەیە باشترە. پرسی:

بەئۆتۆمبیلەکەی خۆت دەچی؟ گوتم:

نە، وا باشترە تۆ من و فریشتە بگەیەنیت و خۆت بگەڕێیتەوە. ئایا ئەوێ خواردنی لێیە؟ گوتم:

بۆ چەند ڕۆژێك لەگەڵ خۆمدا خواردن دەبەم. ئەگەر لێمان بڕا ئاگادارت دەكەمەوە، بەڵام وابزانم هەموو شتێكی لێیە. تەنها خوا بكات ئەو پیاوە سمێڵ فشە لەوێ نەبێت! دایكم بەسینیە چاكەوە هاتە ژوورەوە و باوكم لەناو قسەكانیدا گوتی:

سادە نازانم چ كەسێك چاودێری كۆشك دەكات؟ تا سامۆئیل دەگەڕێتەوە ئێمەش كلیلەكەی بدەینەوە. ئەو كۆشكە چاودێریكەری دەوێ. دایكم گوتی:

وا باشترە جارجار خۆت سەری لێ بدەی و هەروەك سامۆئیل دەیگوت:

كۆشك پڕیە لەشتومەك و نابێ متمانە بەكەس بكەین. پرسیم:

سامۆئیل نەیگوت كە ئایا موختار ئێستاش لەوێیە یان نە؟ دایكم گوتی:

نەخێر، لەو بارەیەوە هیچی نەگوت، تەنها گوتی:

كۆشك تایبەتە بەسادەو هی ئەوە. قەواڵە و كلیلەكانی پێدام و هیچی تری نەگوت.

گوتم:

لەوانەیە ئێستاش موختار لەوێ بێت. باوكە ئەگەر چوویت و موختار لەوێ بوو، لێی گەڕێ هەر لەوێ بێت. سامۆئیل زۆر متمانەی پێی هەیە، دایكم هاتە ناو قسەكەوەو گوتی:

لەكاتێكدا ئێمە كۆشكەكەمان ناوێت، هەرچی بەسەر بێت بە ئێمەچی؟ باوكم قسەكەی پەسەند كردو گوتی:

سادە وا باشترە خۆت ئامادە بكەیت تاكوو پێكەوە هەندێ شت بكڕین. نامەوێت بەدەستی بەتاڵ بتنێرم بۆ باكوور. ئەگەر بڕیارە چەند مانگێك لەوێ بمێنیتەوە، وا باشترە توێشو لەگەڵ خۆتدا بەریت، دایكیشم پەسەندی كردوو من و باوكم بۆ شت كڕین لەماڵ دەرچووین. باوكم پرسی:

چۆن فریشتە ئاگادار دەكەیت و چۆن لەگەڵ خۆت دەیبەیت كە دایكت ئاگادار نەبێت؟

گوتم:

بەپێچەوانەوە دەبێت ئەو بزانێت کە فریشتە لەگەڵ مندایە! چونکە ئەگەر من بڕۆم و فریشتە سەردانی ئێرە نەکات وەشك دەکەوێ، دەمەوێت بەو بڵێم کە فریشتەش لەگەڵ خۆمدا دەبەم، بەلام ئەگەر فریشتە لەگەڵت نەهات؟

ـ نە، ئەو دێت، من بۆ هەر شوێنێك بڕۆم، ئەو لەگەڵم دێت. لەتاراندا پارێزراو نییە، بەلام لەکۆشکەکەی سامۆئیلدا شوێنەکەی ئەمینە. من دەمەوێت ئارەزووەکەی سامۆئیل بەجێ بهێنم. ئەو حەزی دەکرد من و فریشتە پێکەوە لەوێدا بژین و بەو کارە، ئێمە ئارەزووی ئەومان هێناوەتە دی! چووین بۆ سوپەر مارکێتێك و لەکاتێکدا باوکم سەرقاڵی شت کڕین بوو، تەلەفۆنم بۆ فریشتە کردو لەو ڕووداوە ئاگادارم کردو پرسیم:

ئایا لەگەڵمدا دێیت؟ گوتی:

دێم لەگەڵتدا بۆ ئەوپەڕی دنیا. گوتم:

کەواتە ئامادە بەو منیش پێویستییەکانت لەماڵەوە بۆ کۆ دەکەمەوە. پرسی:

کێشە نییە ئەگەر بۆ ماڵئاوایی بێم بۆ سەردانی دایك و باوکت؟ گوتم:

نەخێر گرفتێك نییە. ئەگەر بتوانیت ئەمشەو بێیت، چونکە بەیانی زوو بەڕێ دەکەوین. گوتی:

عەتا لەماڵ نییە، تەنها من و دایکی و خوشکەکەی لەماڵەوەین. هەر کات هاتەوە پێی دەڵێم بمهێنێت بۆ لات. تەلەفۆنەکەم داخست و بۆ هەڵگرتنی شتومەکەکان یارمەتی باوکم دا. کات درەنگ بوو کە عەتا فریشتەی هێنا بۆ ماڵی ئێمە. پێمگوت کە ئێمە نیازی باکوورمان هەیەو دەچین بۆ لای یەکێك لەهاوەڵانی باوکم و ماوەیەك لەوێدا دەژین. هەر ئەوەشم بەفریشتە گوتبوو. کاتێك بەیانی باوکم ئێمەی سوار کرد، فریشتە پرسی:

بەئۆتۆمبیلەکەی باوکت دەڕۆین؟ گوتم:

بەڵێ. خۆشحاڵ بوو و گوتی:

بەو جۆرە باشترە. هەست بەئارامی دەکەم. لەنێوان ڕێگادا زۆر پێکەنین، بەلام کاتێك گەشتینە جێگایەك کە دەبوو بەرەو جادەی خۆڵ لابدەین، فریشتە بەسەرسوڕمانەوە پرسی:

سادە بۆ کوێ دەچین؟ پێکەنینێکم کرد و گوتم:

باکوور، ئەڵبەت باکووری تاران دەڵێم! گوتی:

ئەگەر ئەم جادەیە ناچێت بۆ کۆشکەکەی سامۆئیل؟ گوتم:

بۆچی. مەگەر ئەوێ باکوور نییە؟ دەستی گرتم و چەند جارێك ڕایوەشاند و گوتی:

دەزانیت دەتەوێ چی بکەیت؟ باوکم گوتی:

لەسەرخۆ بە فریشتە. من بۆت ڕوون دەکەمەوە کە بۆچی لەباتی ڕۆشتن بۆ باکوور بەرەو کۆشکەکەی سامۆئیل دەچین. کاتێك باوکم هەموو شتێکی ئاشکرا کرد، فریشتە بەدوودڵییەوە گوتی:

من لەسەرکەوتنمان دڵنیا نیم. ئەگەر سامۆئیل بیەوێت بۆ پشوودان و باشتر بیرکردنەوە بێتە ئێرە ئەو کاتە چی بکەین؟ بەبڕوای من، ئێمە بەدەستی خۆمان، خۆمان دەخەینە داوەوە. پاشان ڕووی کردە باوکم و گوتی:

جەنابی ئاندرە! تۆ لەبارەی بۆچوونەکەی منەوە، دەربارەی سامۆئیل چی دەڵێیت؟

باوکم گوتی:

نیگەران مەبە. ئێمە بەو دەڵێین کە ... کەمێك بێدەنگ بوو و پاشان گوتی:

سادە لەڕاستیدا ئێمە بیرمان لەوە نەکردەوە کە ئەگەر سامۆئیل هاتەوە بۆ ئێران و پرسیاری تۆی کرد، چی پێ بڵێین؟ گوتم:

پێی بڵێین کە فریشتە و سادە ڕۆژێك پێشتر ئێمەیان بەجێهێشت و نازانین بۆ کوێ چوون. هەر کاتێك کە هات پێی بڵێین ڕۆژێك پێشتر ئێوەمان جێهێشتوە. ئەگەر ئەوە بڵێین ناپرسێت بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە. بەڵام لەبارەی هۆکاری ڕۆیشتنەکەمانەوە دەتوانن پێی بڵێین کە من خەیاڵی زەماوەندم هەبووە و ئەویش لەگەڵ کەسێکدا کە ئێوە نایناسن و یان دەتوانن پێی بڵێین بەهۆی ئاژاوەی ناو ماڵەوەو یان ئەوەی کە من دەمویست لەگەڵ فریشتەدا بەتەنها بژیم و یا ... ڕاستیەکەی پێ بڵێ! پێی بڵێ کە سادە پەیمانەکەی هەڵوەشاندۆتەوەو لەگەڵ فریشتەدا لێرە ڕۆیشتوون و ئێوە نازانن ئێمە لەکوێین، باوکم دوایین بۆچوونی هەڵبژارد و گوتی:

ئەوە بەدایکیشت دەڵێم، چونکە لەڕاستیدا ئێوە هەردووکتان ماڵتان بەجێهێشتوە.

بەو کلیلەی کە پێمان بوو، باوکم دەرگای کۆشکەکەی کردەوە و ئێمە چووینە ژوورەوە. هەموو جێگایەک ئارام و بێدەنگ بوو. هەموو کون و قوژبنێکی ئەویم بەباوکم نیشان دا و دڵنیام کردەوە کە شوێنی شیاوم بۆ خۆم هەڵبژاردوە. ئەو داوای سەرکەوتنی بۆ کردین و ڕۆیشت.

"١٥"

من و فریشته دەستەوسان بووین و نەماندەزانی چی بکەین، تا ئەوەبوو لەسەرلێشێواوی ڕزگارم کرد و پێم گوت:

ئێستا کە لێرەداین. دەبێت وەک سەردەمانێک کە لەماڵی خۆماندا بووین، ڕەفتار بکەین. کەواتە باشترە شتومەکەکان ڕێك خەین. ئەو ڕۆژ و شەوە خەریکی خاوێنکردنەوەی کۆشك و ڕێکخستنی ئەو شت و مەکانە بووین کەلەگەڵ خۆماندا هێنابوومان. بەڵام هەر کە شەو داهات، ترسمان لێ نیشت. هەر یەکەمان هەوڵمان دەدا دڵی ئەوی ترمان بدەینەوە، من بۆ ئەوەی وای لێبکەم باوەڕی پێم هەبێ و پشتم پێ ببەستێت، قسەم لەبارەی ئەو سەردەمەوە بۆ دەکرد کە سەردەستەی کوڕان بووم و دڵنیام دەکردەوە کە ئێستاش وەک رابردوو لەهیچ شتێك ناترسم، بەڕوونی لە روخساریدا دەمبینی کە قسەکانم هێزو تینی پێ داوە. ئەو شەوە هەموو دەرگاکانمان لەژوورەوە کلیلداو پێکەوە لە سەر یەك نوێن نوستین. هووژە هووژی بای نێو لق و پۆی درەختەکان، چەند جارێك ترساندینی و گومانمان کرد کە کەسێك دەیەوێت بێتە نێو کۆشکەوە. نزیکی بەیانی بوو کە هەردووکمان چووینە خەوەوە. خەوێکی قووڵ کە تا نیوەڕۆ بەردەوام بوو. چەندین شەو و ڕۆژ تێپەڕین تا ورد ورد خومان بەو دیمەنەوە گرت و بەدەنگی با و زیرەی سیسرکەکان ڕاهاتین. باوکم لەسەر ئەو بەڵێنەی کە پێی دابووین پەیوەندی پێوە دەکردین و هەواڵی ڕۆژانەی پێ ڕادەگەیاندین. دو مانگمان بەو شێوەیە

بەرێکرد و کاتێك باوکم ئاگاداری کردینەوە کە سامۆئیل بەنیازە بگەڕێتەوە. ڕەنگ لەڕووی هەردوکماندا پەڕی. فریشتە گوتی:

خەریکە فیلمە پۆلیسییەکە دەستپێدەکاتەوە! سێ ڕۆژ تێپەڕی، بەڵام باوکم هیچ تەلەفۆنێکی نەکرد و من و فریشتە لەبێناگایی تەواودا دەژیاین. چەند جارێك دەمانویست خۆمان تەلەفۆنی بۆ بکەین، پاشان پەشیمان دەبوینەوە و جارێکی تر چاوەڕوان دەماینەوە. ڕۆژی چوارەم لەکۆتایی شەودا زەنگی تەلەفۆنەکە لێی دا. زەنگی تەلەفۆن، کلیلێك بوو کەدەروازەی دنیای بەڕووماندا دەکردەوە! باوکم بەپەلەپروزێ گوتی:

ناتوانم زۆر قسە بکەم. تەنها دەڵێم سامۆئیل زۆر تورەیە و لێتان دەگەڕێ. ئاگاتان لەخۆتان بێت! و تەلەفۆنەکەی داخستەوە. فریشتە پرسی:

باشە، ئێستا ئێمە دەبێت چی بکەین؟ هەوڵمدا خۆم تێکنەدەم. گوتم:

هیچ! ئێمە تەنها چاوەڕێ دەبین و نزا دەکەین کە سامۆئیل بەنائومێدی بگەڕێتەوە. ئەو شەوە هیچ کاممان نەمانتوانی بخەوین و لەبیرکردنەوەدا نوقم بووبووین. فریشتە پرسی:

سادە خەوتی؟ بەرەو ڕووی سوڕامەوەو گوتم:

نە، گوتی:

من دەترسم.

- لەچی دەترسی؟

- لەوەی کە سامۆئیل بماندۆزێتەوە. من نازانم بۆچی لەو هەڵهاتووین؟ ئەو کە خەیاڵی کوشتنمانی نییە؟ هەیەتی؟ گوتم:

نەخێر، ئەو نایەوێت ئێمە بکوژێت. بەڵکو مەبەستی ئەوەیە ئێمە وەك کەنیزەك لەخزمەتیدا بین و من ببمە بەندەیەکی گوێ لەمستی ئەو. وا هەست ناکەیت ئەو ژیانە چەندەها جار لەمەرگ خراپترە؟ ئەی بریا منی بکوشتایەو ڕزگار بومایە، بەڵام بەو جۆرە بەندی نەکردباین. گەرووم پڕ بوو بوو لەگریان. لەباوەشی کردم و گوتی:

مەگری من تەنها ویستم بزانم سەرئەنجامی ئێمە بەچی دەگات. گوتم:

نازانم، بەڵام هیوام وایە خوداوەند کۆمەکمانبێ و لەدەستی ڕزگارمان بکات. فریشتە ئامێکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی:

خوداوەند یارمەتیمان دەدات، من دڵنیام. گوتم:

فریشتە ئەگەر دەترسی لەگەڵمدا بمێنیتەوە پێم بڵێ تاکوو بتبەمەوە بۆ ماڵی عەتا. من نیگەرانم کە تۆش هاتیتە ناو ئەم کارەساتەوە. گوتی:

ئەو قسانە مەکە، من تا کۆتایی لەگەڵتدا دەبم. ئەگەر دەبینی پرسیار دەکەم تەنها مەبەستم ئەوەیە بزانم بەرنامەی داهاتوومان چی دەبێت. لەسەر نوێنەکەم هەستامەوەو دانیشتم و گوتم:

بەرنامەیەک لەئارادا نییە، خۆیشم نازانم دەبێت چی بکەم! خۆزگە شتێک دەبوو لەبەرامبەر سامۆئێلدا پارێزگاری لێ بکردباین. من و تۆ ئەگەر هاوسەرمان هەبوایە، هەرگیز سامۆئێل جورئەتی ئەوەی نەدەکرد لێمان نزیک بێتەوە. فریشتە قاقایەکی کردو گوتی:

مانای ئەو لەهاوسەرەکانی ئێمە دەترسا؟ کەسێک کە بتوانێت بەئاسانی یاری بەژیانی دوو مرۆڤ بکات، چۆنچۆنی ناتوانێت لەبەرامبەر دوو پیاودا بوەستێتەوە؟ گوتم:

ئەو لەترسی ریسوابوون کەنار دەگرێ. بەو جۆرە پیاوان، بەو هەموو هێزو تواناکانیانەوە لەریسوایی دەترسن. ئەوان لەبەر پارێزگاری قازانجی خۆشیان ناچارن لەبەرامبەر خەڵکیدا، رۆڵی مرۆڤدۆستی ببینن و روپۆشی پاکیزەیی بەرودا بگرن. ئەگەر سامۆئێل رسوا بێت پشتیوانی باوکی و خەزووری لەدەست دەدات، بوونی مەعشوقە لەگەڵ پەیوەندی نایاسایی لەگەڵ ژنی مێرددارردا جیاوازە. ئەوە ئەو پەڕی تێکشکانە کە پیاوێک بیەوێت... قسەکەی پێ بریم و گوتی:

ئەو لەوانەیە بۆ خۆی هیچ هەنگاوێک نەنێت، بەڵام لەو نێوانەدا هەمان کەس لەگەڵ ئەو کارتێکردنەدا کە تۆ باسی دەکەیت دەتوانێت زیانمان پێ بگەیەنێت. عەتا دەیویست پارێزگاری لەمن و تۆ بکات، بەڵام من پێمگوت و پەشیمانم کردەوە، گوتم:

عەتا دەیویست هەردوکمان لەماڵی خۆیدا چاودێری بکات و بمانپارێزێت. ئەو وای بۆ دەچوو کە دەتوانێت بمانپارێزێت. بەڵام کاتێك گوتم کە سامۆئیل چ جۆرە مرۆڤێکە و بەتەنیا ناتوانیت رووبەرووی بیتەوە. باسی یاسای کرد و گوتی:

کەواتە یاسا چ کارەیە؟ ئەگەر یاسا نەتوانێت پارێزگاریتان لێبکات بەکەڵکی چی دێ؟

پێم گوت:

زۆر بەداخەوە یاساکەی ئێمە لەهاوشێوەکانی سامۆئیل پارێزگاری دەکاو دەستی ئەوانە بۆ ئەم جۆرە کارانە والاتر دەکات. عەتا چەند رۆژ مۆڵەتی خواست تاکوو چارەیەك بدۆزێتەوە، تۆ تەلەفۆنت کردو پێکەوە هاتین بۆ ئێرە. بەیانی زوو باوکم پەیوەندی کردو گوتی:

سامۆئیل بەشێوەیەکی بەرفراوان دەستی بەگەڕان کردوە: وا هەست دەکەم شوێنەکەتان ئەمین نییە و وا باشترە لەوێدا بڕۆن. گوتم:

ئێوە چیتان پێ گوت؟ گوتی:

کاتێك هاتە ماڵەوە چاوەڕوان بوو کە تۆ پێشوازی لێ بکەیت، بەڵام چونکە تۆی نەبینی، پرسی:

سادە لەکوێیە؟ دایکت لەگەڵ گریانێکی دەستکرددا گوتی:

دوێنێ سادە بەجێی هێشتین. ئەو پێی نەگوتین بۆ کوێ دەچێت، تەنیا گوتی ئەگەر سامۆئیلت بینی، پێی بڵێ بەداخەوەم کە نەمتوانی دەوری مەعشوقەیەك ببینم. من ئەگەر لەبرساندا بمرم و تاهەتایە ناچاربم شارەو شار هەڵبێم سەرشۆڕی و لارەملی قەبوڵ ناکەم. کاتێك سامۆئیل ئەمەی بیست تورە بوو و لەڕێگای تەلەفۆنەوە پەیوەندی بەچەند شوێنێکەوە کرد. وا هەست دەکەم کەسێکی بۆ دۆزینەوەی تۆ بەکرێ گرت. ئەو هەر ئەو شەوە سەری لەماڵی مامۆستا و عەتادا، تا تۆ لەوێدا بدۆزێتەوە. وا هەستدەکەم ماڵی ئەو دوانە هێشتا لەژێر چاودێریدا بێت. سادە بەبۆچوونی من کۆشکیش شوێنی دڵنیایی نییە وا باشترە بڕۆیت بۆ ماڵی هاوەڵەکەم. گوتم:

لەگەڵ فریشتەدا گفتوگۆ دەکەم و پاشان ئاگادارتان دەکەمەوە. پاش ئەوە تەلەفۆنم بۆ ماڵی عەتا کرد و توانیم لەگەڵ خۆیدا بدوێنم. هێندە لەبیستنی دەنگم خۆشحاڵ بوو کە بەهاواری شادییەوە پرسی:

تۆ لەکوێیت؟ هێندە نیگەرانی حاڵت بووین کە لەباسکردن نایەت. گوتم:

حاڵی من و فریشتە باشە و ئێستا تەلەفۆنم کرد کە بزانم ئایا سامۆئیلت بینی و ...

ئەمجارەی پێ بڕیم و گوتی:

بەڵێ بینیم. ئەو شەوە هاتبوو کە تۆ لەماڵی ئێمەدا بدۆزێتەوە خۆشبەختانە سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام بوەستە تا لەبیرم نەچوە بڵێم کە مامۆستا گەلێک نیگەرانی تۆیە پاش ئەوەی کە سامۆئیل تۆی لەماڵی مامۆستاشدا نەدۆزییەوە، مامۆستا تەلەفۆنی لەگەڵ مندا کرد و گوتی:

سادە توشی کێشە هاتوە و دەبێت هاوکاری بکەین. من نەمویست مامۆستا هەست بکات، بەڵام پێدەچێ ئەو هەموو شتێک بزانێت. چونکە بەمنی گوت:

ئەگەر سادەت بینی پێی بڵێ ئامادەم هاوکاری بکەم و ئێستا من بەتۆ دەڵێم کە ئەو هەندێک برادەری دەستڕۆشتووی هەیە کە دەتوانێت بۆ ڕزگارکردنی ئێوە هەنگاو بنێ.

گوتم:

سوپاسی مامۆستا بکە، بەڵام پێم خۆش نییە ئەو بێتە ناو ئەم ڕووداوەوە. ئەو لەدەنگەدەنگ و هات و هاوار بەدوورە. لەوانەیە بەهاوکاریکردنی من خۆشی گیرۆدەی دەربەسەری ببێ و منیش ئەوەم ناوێ. بەدڵتەنگییەوە گوتی:

ئەوە چ قسەیەکە. ئێمە دۆستی تۆین. ئەگەر ئێمە نەتوانین هاوکاریت بکەین، کەواتە دەتوانیت لە چ کەسێک چاوەڕێی یارمەتییبیت؟ داوات لێدەکەم واز لەم کەلەڕەقییەت بهێنە و ڕێگەمان بدە یارمەتیت بدەین. گوتم:

کاتێک کە دەزانم کارێکتان پێ ناکرێت، بۆچی گیرۆدەتان بکەم؟ گوتی:

ئەو بابەتەی کە ئێمە دەتوانین یان ناتوانین، پەیوەندی بەوەوە هەیە کە تۆ ڕێگای ئەو کارەمان پێ بدەیت. من ناچار بووم ڕوداوی نێوان تۆ و سامۆئیل و ئەو بەڵێنەی کە

پێت دابوو بۆ مامۆستا ڕوون بکەمەوە. سامۆئیل وەک کەسێکی دەستڕۆشتوو هاتۆتە بەرچاوت. بەڵام بۆ ئێمە بەو جۆرە نییە. من بەفریشتەم گوت کە دەتوانم یارمەتیتان بدەم. ئەگەر ئەو ڕۆژە بەتەنها بووم، ئێستا دوو کەسین. داوات لێدەکەم ڕێگامان بدە، من و مامۆستا بۆ ڕزگارکردنی ئێوە هەنگاو بنێین! ئەگەر دڵت بەحاڵی خۆت ناسوتێت هەر هیچ نەبێت بیر لەفریشتە بکەرەوە و مۆڵەتمان بدە ئەگەربۆجاریکش بووە تاقی بکەینەوە. گوتم:

سامۆئیل کەسێکی بەکرێ گرتوە تاکوو ئێمە بدۆزێتەوەو تۆ و مامۆستاش لەژێر چاودێریدان. چۆنچۆنی ئێوە دەتوانن یارمەتی من و فریشتە بدەن؟ گوتی:

تۆ پێم بڵێ ئێستا لەکوێی باقی کارەکان بۆ ئێمە دابنێ. ناونیشانی کۆشکەکەم پێداو لەگەڵ ئەوەشدا گوتم کە بەبۆچوونی باوکم وا باشترە کۆشك جێ بهێڵین و بەرەو دێهاتەکانی باکوور بڕۆین. گوتی:

ئەو کارە نەکەیت، چونکە ئەوێ لەتاران بچووکترە و بەو حاڵەوە کە فریشتە هەیەتی ئەوا زوو دەناسرێنەوە، وا باشترە هەر لەوێدا بمێننەوە تاکو شوێنێکی گونجاوتان بۆ دەبینمەوە. ژمارەی تەلەفۆنی کۆشکی وەرگرت و پاشان تەلەفۆنەکەی داخست. فریشتە شتومەکەکانی دەخستە سەر مێزەکە تاکو کۆیان بکەینەوە. من بۆچونەکەی عەتام بۆ ڕونکردەوە و لێم پرسی:

بۆچوونی تۆ چییە؟ گوتی:

هەم قسەی باوکت ڕاستە و هەم قسەکانی عەتایش. سادە ئێمە دەبێت جێگایەکی ئەمین بدۆزینەوە و تا زووترە ئێرە جێبهێڵین. گوتم:

دەزانم، بەڵام بۆ کوێ بچین کە نەناسرێینەوە؟ کەوتە بیرکردنەوە. بۆ ئەوەی کە ئەو لەنیگەرانی دەرباز بکەم، گوتم:

نیگەران مەبە! مامۆستا و عەتا بۆ ڕزگارکردنی ئێمە لەدۆزینەوەی ڕێگایەکدان. ئێمە نابێت بێ هیواو نائومێد بین. پێکەوە دەستمان بەکۆکردنەوەی کەلوپەلەکانمان کرد. بەهەموو توانای خۆم دڵی فریشتەم دەدایەوەو خۆیشم هێشتا نیگەران بووم. شەو هەموو

دەرگاکانمان وەك شەوانی تر لەژوورەوە قوفڵ دا و بۆ دڵنیایی زیاتر مێزەکانمان خستە پشتیانەوە و گوڵدانە شوشەییەکانمان لەپشتی پەنجەرەکانەوە دانا تا ئەگەر خەومان لێکەوت و کەسێك ویستی لەپەنجەرەکەوە بێتە ژوورەوە بەشکاندنی گوڵدانەکان بەئاگا بێین. نیوەی شەو لەدەنگی شکانی گوڵدانێك بەشپرزەیی لەخەو ڕاچڵەکاین و فریشتە نیزەیەکی وای کرد کە هەردووك لەباوەشی یەکتریدا خۆمان گرمۆڵە کرد! لەقیژەکەی ئەو پیاوێك کە لەبەر پەنجەرەکەدا بوو، ڕای کرد.

هێندە ترس و سام دایگرتبووین کە نەماندەتوانی هاوار بکەین و هەردووکمان بێ ویستی خۆمان دەگریاین، چووم بۆ لای تەلەفۆنەکە تاکوو داوای یارمەتی بکەم، بەڵام لەترسی ئەوەی کە نەبادا سامۆئیل تەلەفۆنەکە هەڵگرێت پەشیمان بوومەوە. هەوڵمدا کۆنترۆڵی خۆم بکەم. ڕووم کردە فریشتەو گوتم:

ئارام بە ئەو چیتر ناگەڕێتەوە. فریشتە گوتی:

بەڵام ئەو لەپیاوەکانی سامۆئیلە، ئێستا هەموویان دەزانن ئێمە لەکوێدا خۆمان حەشار داوە. دەستیم گرت و گوتم:

من دڵنیام کە ئەو لەپیاوەکانی سامۆئیل نەبوو، دەنا لەقریشکەکانی تۆ نەدەترسا و هەڵنەدەهات. ئەو دزێك بوو و بەس. بەڵام ئەو بەناباوەڕی چەند جارێك سەری ڕاوەشاند وگوتی:

نەخێر، ئەو دز نەبوو، بەڵکو یەکێکە لەپیاوەکانی سامۆئیل و تاکوو کاتژمێرێکی تر هەموویان بەرەو ئێرە دێن. وەرە تا درەنگی نەکردوە کۆشك جێ بهێڵین. گوتم:

زۆر باشە دەڕۆین، بەڵام دەزانی کاتژمێر چەندە؟ ئێمە کە کەرەستەی دەربازبونمان نییە و بەپیادەیش ناتوانین بڕۆین.

ـ کەواتە دەبێت چی بکەین؟ گوتم:

ئارام دەگرین تاکوو کەمێك دنیا ڕوناك دەبێت و ئەو کات بەڕێ دەکەوین. خەو لەچاوەکانمان تۆرابوو. هێندەمان چاو لەئاسمان بڕی تاکوو سپێدەی دا. ئەو کات کۆشکمان بەجێهێشت و بەزەحمەت خۆمان گەیاندە شەقامی سەرەکی. وەستاین تاکوو

خێرخوازێك بێت و لەگەڵ خۆی بمانبات. خۆشبەختانە ئۆتۆمبێلێك بەبینینی ئێمە وەستاو بۆ سوارکردنی فریشتەش هاوکاری کردین‌و عارەبانەکەیشی خستەناوسندووقی ئۆتۆمبیلەکەیەوە. ماوەیەك ڕێگەمان بڕی و پرسی:

بۆ کوێ دەچن؟ من و فریشتە سەیرێکی یەکدیمان کرد و من گوتم کاتێك گەیشتینە یەکەمین میوانخانە، تکایە ئاگادار بە. پرسی:

گەشتیارن؟ بەجوڵاندنی سەرم بەڵێم نیشان دا. گوتی:

بەم بەیانی زووە لەکوێوە هاتوون... نەمهێشت لەپرسیارەکانی بەردەوام بێت و گوتم:

هاوڕێکەم تەندروستی باش نییە، دەمەوێ بیبەمە لای پزیشك و لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی مانەوەشمان پێویستە، چونکە ئاشکرا نییە چەند ڕۆژ کارمان لەشاردا درێژە دەکێشێ. بەڕوکەش باوەڕی کرد و گوتی:

ئەگەر دەخوازیت خۆم دەتانگەیەنمە نەخۆشخانە. گوتم:

نە، سوپاست دەکەم بەهۆی ئەو شت و مەکەی کە پێمانە وا باشترە سەرەتا میوانخانەیەك پەیدا بکەین و پاشان بچین بۆ نەخۆشخانە. بەنیشانەی پەسەندکردنی قسەکەم سەری جوڵاندو ئیتر هیچی نەگوت. ڕەنگی فریشتە هێندە پەڕیبوو هەر کەس بیدیایە باوەڕی دەکرد کە نەخۆشە و ئازاری هەیە. کاتێك گەیشتینە نێوەندی شار، لەبەردەم میوانخانەیەکدا وەستاو گوتی:

پرسیار بکە ئەگەر جێگای بەتاڵیان هەبوو، پاشان هاوڕێکەتان دابەزێنن. کارم بەڕێنماییەکانی کرد و خۆشبەختانە ژوورێك بەتاڵ بوو. ئێمە دابەزین. ژوورەکەمان لەنهۆمی دووەمی میوانخانەکەدا بوو. سەرخستنی فریشتە بەهۆی خراپی باڵابەرەکەوە گەلێك سەخت بوو، بەڵام بەهەر شێوەیەك بوو سەرئەنجام ئەو کارە بەئەنجام گەیشت و سەقامگیر بووین. هیچکاممان ئارەزووی نانی بەیانیمان نەبوو. هەردووکمان لەماندوێتیدا خەومان لێکەوت. بەدەنگی لێدانی دەرگاکە لەخەو ڕاپەڕین و بەسەرسامیەوە چاومان لەدەرگاکە بڕی، بەهێواشی پرسیم:

بەڵێ؟ یەکێك بوو لەخزمەتکارەکانی میوانخانە. پرسی:

ئارەزووی خواردنی میوانخانە دەکەن؟ هەناسەیەکی ئارامیم هەڵکێشا و گوتم:

بەڵێ، ئەگەر بەئەرك نەبێت بۆمان بهێنیتە ژوورەکەی خۆمان. فریشتە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

بەخێر گەڕا. گوتم:

ئیتر نابێت نیگەران بین. شوێنەکەمان تاڕادەیەك ئەمینەو لەو ماوەیەشدا عەتا شوێنێکی گونجاومان بۆ دەبینێتەوە. دەمویست عەتا لەشوێن گۆڕکێکەمان ئاگادار بکەم، بەڵام لەخۆمەوە ژمارەی ماڵی مامۆستام لێدا. دڵم بەتوندی لێی دەدا. ماوەیەکی زۆر بوو گوێبیستی دەنگی مامۆستا نەببووم و حەزم دەکرد لەماڵەوە بێت. تاکوو بتوانم چەند وشەیەك لەگەڵیدا ئاڵوگۆڕ بکەم. دوای چەند زەنگێك دەنگی مامۆستا لەتەلەفونەکەوە دەنگی دایەوە و من بەسۆزەوە گوتم:

سڵاو مامۆستا، سادەم! لەبیستنی دەنگەکەم بەشەوقەوە گوتی:

حاڵت چۆنە؟ لەکوێوە تەلەفۆن دەکەی؟ بۆچی زووتر پەیوەندیت پێوە نەکردم؟ تۆ بەتەواوەتی نیگەرانت کردبووم. گوتم:

باشین و لەمیوانخانەی مرواریییەوە تەلەفۆنت لەگەڵ دەکەم. ویستم داوات لێ بکەم عەتا ئاگادار بکەیتەوە کە نەچووین بۆ باکوور و لەتارانین. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا وگوتی:

خۆشحاڵم نەچوویت بۆ باکوور. کاتێك عەتا گوتی کە نیازی باکوورت هەیە بەڕاستی نیگەران بووم، چونکە ئەوێ بەهیچ شێوەیەك بۆ مانەوەی ئێوە گونجاو نەبوو. گوتم:

ئێمەش بەو ئەنجامە گەشتین و نەچووین. پرسی:

ئەی چۆن بوو کۆشکتان بەجێهێشت؟ ئەوەی کە شەوی پێشوو ڕووی دابوو بۆم باسکرد و ئەو دوای بیستنی ڕووداوەکە گوتی:

پڕ بەدڵ حەز دەکەم هاوکاریتان بکەم، بەڵام نازانم بۆچی ناتەوێ من بێمە ناو ئەم کێشەوە؟ گوتم:

نە، تێگەیشت کە دڵتەنگ بووم. گوتی:

سادە دەمەوێت شتێکت لێ بپرسم، ئایا راستگۆیانە وەڵامم دەدەیتەوە؟ گوتم:

هەوڵ دەدەم. گوتی:

ئایا هێشتا هەر ئەو سادەیەی کە بەبوێرییەوە چووە نێو گۆڕستان و کتێبەکەی هەڵگرت تاکوو بەکوڕەکانی بسەلمێنێت کە لەئازایەتی و بوێریدا لەوان لەبەرترە؟ گوتم:

دەمەوێت هەمان سادە بم، بەڵام دوودڵم. چونکە هەست دەکەم ترس بەری بەئازایەتیەکەم گرتووە. گوتی:

بەڵام من هەمان سادەی پێشوو لەمێشکمدا وێنا دەکەم. کچێك کە لەهەموو هاوڕەگەزەکانی خۆی ئازا و چاونەترس ترە و پڕ بەدڵ حەز دەکەم بۆ هەمیشە ئەو وێنەیەی تۆ لەبیرمدا بمێنێتەوە، بەڵێن دەدەیت کە بەسەرخۆتدا زاڵ بیت و بێهودە رێگای ترس بەخۆت نەدەی؟ گوتم:

حەز دەکەم بەڵێن بدەم، بەڵام باوەڕم نییە. گوتی:

ئەگەر لەبەر فریشتەش بوە هەوڵ بدە ئارام بیت. کاتێك تەلەفۆنەکەم داخست هەستم بەئارامی کرد! نازانم چۆن بوو کە لەدەنگی بەسۆزی ئەو وام هەست کرد پاڵپشتێکی بەهێزم هەیە و دەتوانم پەنای پێ ببەم؟ من و فریشتە خۆمان سەرقاڵ کرد بەخوێندنەوەو چاوەڕوانی تەلەفۆنی ئەوان بووین.

تۆ بۆ خۆت گەلێك كێشە و گرفتت هەیە و پێویست ناكات منیش كێشەكانت بۆ زیاد بكەم. گوتی:

تۆ بیر لەكێشەی من مەكەرەوە. كاتێك لەعەتام بیست كە ناتەوێت من یارمەتیت بدەم لێت نیگەران بووم. دەمزانی لێم زیز بوویت، بەڵام نەك بەو ڕادەیەی كە هەتا ڕێگە نەدەیت هەنگاوێك بەرەو لات بنێم.

ـ بەڵام مامۆستا من لەتۆ زیز نەبووم، باوەڕ بكە! تەنها نامەوێت تۆ دوچاری كێشەی خۆم بكەم. لەبیرت چووە كە پێشتر لەم بارەیەوە پێكەوە گفتوگۆمان كرد و تۆ چەند بەڵگەیەكت هێنایەوە كە ... قسەكەی پێ بڕیم و گوتی:

بەڵام ئەم بابەتە جیاوازە. ئەو كاتە گیانی تۆ و فریشتە لەمەترسیدا نەبوو، بەڵام ئێستا ئەگەر مۆڵەت بدەیت من دەتوانم یارمەتیت بدەم. گوتم:

چۆن چۆنی؟ ماڵی تۆ و عەتاش لەژێر چاودێریدایە و هەر جۆرە هەنگاوێك لەلایەن تۆ و عەتاوە، دەبێتە هۆی ئەوەی كە سامۆئیل ئێمە بدۆزێتەوە. پێكەنینێكی كردو گوتی:

دڵنیابە بەو جۆرە نابێت. ئەگەر ئەو دەستی دەڕوات وا هەست دەكەم منیش تا ئاستێك دەستم دەڕوات كە بتوانم هەوڵەكانی ئەو پووچ بكەمەوە. من بەپێچەوانەی خواستی تۆوە كارگەلێكم ئەنجامداوە كە ئێستا ناتوانم بیدركێنم. تۆ و فریشتە لەمیوانخانە دەرمەچن تا كاتێك من، یان عەتا ئاگادارتان دەكەینەوە. گوتم:

مامۆستا تكات لێدەكەم لەبەر من خۆت گیرۆدە مەكە. جارێكی تر پێكەنی و گوتی:

تۆ زۆر كات منت گیرۆدە كردوە، بەڵام بەخۆت نازانی! گوتم:

كەواتە ڕازی مەبە گیرۆدەبوونەكەتان زیاتر بێت. گوتی:

بەڵام من ئارەزووی ئەو گیرۆدەییە دەكەم و ئامادەم بۆ ڕزگاری تۆ هەوڵی زیاتر بدەم.

ئارام و غەمگین بوو. حەزمدەكرد لەو ساتەدا لەتەنیشتیەوە بوومایە و ڕوخساریم ببینیایە.

پرسی:

پێویستت بەهیچ نییە؟ دەنگم لەگەڵ گریانێكدا كە لەگەرووم گیرابوو تێكەڵاو بوو، گوتم:

"١٦"

کاتی نانخواردنی ئێواره بوو که لەدەرگایان دا. من دەرگای ژوورەکەم کردەوە و لەترساندا وەخت بوو بێهۆش ببم. سامۆئیل هاتە ژوورەوەو بەپێکەنینێکی فێڵبازانەوە گوتی:

شەوباش! من چوومە دواوەو خۆم گەیاندە فریشتە و لەبەرامبەریدا وەستام.

سامۆئیل لەسەر کورسییەکە دانیشت و گوتی:

بۆچی قسە ناکەیت؟ بۆچی لەحاڵم ناپرسی؟ پرسیم:

چۆنچۆنی ئێمەت دۆزییەوە ئێشارەی بەتەلەفۆنەکە کرد و گوتی:

زۆر بەئاسانی! من دەمزانی تۆ لەهەر قوژبنێکدا خۆت حەشاردابێت، سەرەنجام لەگەڵ مامۆستا ئازیزەکەتدا تەلەفۆن دەکەیت، هەر لەبەر ئەوە تەلەفۆنەکەیم کۆنترۆڵ کرد و دواجار تۆم دۆزییەوە. گوتم:

ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟

شانەکانی بێ دەربەستانە هەڵتەکاندو گوتی:

هیچ. تەنها هاتم تۆ ببینم. گوتم:

باشە ئێستا کە بینیمت برۆ. ناوچەوانی لۆچ کرد و بەهەمان لەسەرخۆییەوە بەردەوام بوو:

برۆم؟ گوتم:

بەڵێ، بڕۆ، چونکە ئەگەر هەنگاوێك بێیتە پێش هاوار دەکەم و هەموان بەئاگا دێنم.
دەستەکانی لەشێوەی خۆبەدەستەوەداندا هەڵبڕی و گوتی:
بەڵام من هیچ خەیاڵێکم نییەو ناشمەوێت کارێك ئەنجام بدەم. فریشتە پرسی:
کەواتە چیت لێمان دەوێت؟ بۆچی کۆڵمان لێ نادەیت؟ بەتەوسەوە پێکەنینێکی کرد و گوتی:
ئێوە هەردوکتان پابەندی بەڵێنی خۆتان نەبوون. من هاتم تاکو پێتان بڵێم لەئێستا بەدواوە هەر کارێکتان بەسەر بێت خۆتان بەرپرسیارن، چونکە خۆتان ئەم ڕێگایەتان هەڵبژاردوە! گوتم:
کارت بەفریشتەوە نەبێت، هەر بەرنامەیەکت دارشتوە دەبێت بەرەو ڕووی من بێتەوە.
فریشتە لەو نێوانەدا بێ تاوانە، پێکەنینێکی وەحشیانەی کردو گوتی:
داستانی ڕابردوو دوبارە مەکەرەوە. فریشتەیش بەئەندازەی تۆ تاوانبارە و دەبێت باجی خۆی بدات! من دەزانم فریشتە تۆ دەجوڵێنێت تاکو لەگەڵ مندا میهرەبان نەبێت. ئەگەر دڵسۆزییە بێ ماناکانی ئەو نەبوایە، ئێستا تۆ بەمنەوە وابەستە دەبوویت و یاری مشك و پشیلە بەردەوام نەدەبوو. گوتم:
سامۆئیل تۆ هەڕەشەت لێکردین، کەواتە گوێبگرە با پێتی بڵێم ئەگەر بەڵایەك بەسەر من و فریشتەدا بێت کەسێك هەیە کە خەزوورت ئاگادار بکات و پێی بڵێت کە زاوا خۆشەویستەکەت چ مرۆڤێکی فریودەرەو چۆنچۆنی لەسامان و دەستەڵاتی ئەو کەڵك وەردەگرێت. من تەواوی کارەکانی تۆم لەنامەیەکدا نوسیوەو بەناونیشانی ئەمانەت سپاردوومە بەیەکێك لە دۆستەکانم کە بۆ ئەو کاتە بەکەڵك دەبێت. گوتی:
پاش ئەوەی کە من تۆڵەی خۆمم لێ کردیتەوە ئیتر بەلامەوە گرنگ نییە چی ڕوو دەدات. گوتم:
ئایا ئامادەیت چاو لەو هەموو سەروەت و سامانە بپۆشی؟ گوتی:
نەخێر، چاوی لێ ناپۆشم، چونکە دەزانم هیچ شتێك ڕوو نادات. فریشتە پێکەنینێکی گاڵتەجاڕانەی کرد و گوتی:

هێندەش دڵنیا مەبە. ساموئیل سەیرێکی کاتژمێرەکەی کردو گوتی:

تاقی دەکەینەوە! ئێمە هەردووکمان ئەم یاریەمان دەست پێکردوە و دەبێت تەواویشی بکەین. گوتم:

ئەم یارییە بردنەوەی نییە. ئەگەر تۆ بەرووکەش براوە بیت، یان من براوە بم، ئازاری ویژدان تامەتایە بەخەمان بەرنادات! نێوچاوانی تێکدا و گوتی:

خۆت ئەمەت دەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا کە جۆکەری سەرکەوتن لەدەستی مندا بوو، من هەموو مەرجەکانی تۆم قەبووڵ کرد، بەڵام تۆ بەخیانەتکردن منت ناچارکرد تاکوو دەست بۆ تۆڵەسەندنەوە درێژ بکەم. گوتم:

ئەگەر بەدەستی تۆ بکوژرێم یان بەند بکرێم، هێشتا براوە نیت. چونکە دەزانی کە نەتتوانیوە دڵم لێ بستێنی و ئەوەش هیچ بەهایەکی نابێ. گوتی:

دەزانم، بەڵام تەنها ئەوەم بەسە کە نەهێڵم تۆ بەئارەزووەکانت بگەیت و لەتەنیشت مامۆستا خۆشەویستەکەتدا بژیت،. من بەتەنها هاتومەتە مەیدان و زۆر حەز دەکەم بزانم مامۆستاکەت چۆنچۆنی نەخشەکانی من پووچ دەکاتەوە. ئێمە هەردووکمان لەپێناو شتێکدا تێدەکۆشین. لەڕاستیدا شەڕی من و مامۆستایە. ئارەزوومە ببینم چۆن بەسەرشۆڕی و شکستخواردویی مەیدانی جەنگ جێ دەهێڵێ و پاشەکشێ دەکات. ئەویش بەئارەزووی خۆی هاتۆتە نێو ئەم کێشەیەوە. کەواتە دەبێت ئەنجامەکەیشی قەبووڵ بکات. گوتم:

کارت بەسەر ئەوەوە نەبێت. ئەو لەم کێشەیەدا هیچ بەرنامەیەکی نییە. هەستایەوە و ڕووبەڕووم وەستا و گوتی:

یان ئەوەیە لەگەڵمدادێیت، یان هەر کەسێك هاتە نێو ئەم کێشەیەوە ئەوا خۆی بەرپرسە! ئێستا ئارەزووی خۆتە. ئەگەر ژیانی دۆستەکانت لا مەبەستە لەگەڵ مندا وەرە و ئەوان لەم کێشەیە دوور بخەرەوە. گوتم:

لەکوێوە بزانم کە تۆ کارت بەوانەوە نابێت؟ بەدەنگی بەرز لەقاقای دا و گوتی:

من تا ئێستا هەرچیم گوتوە کارم پێکردوە، ئێستاش هەر وایە. لەو کاتەدا هیچ خەیاڵێکم جگە لەڕزگارکردنی فریشتەو ئەوانی دیکە نەبوو. بڕیارمدا خۆم بکەم بەفیدای ئەوان. گوتم:

لەگەڵتدا دێم و باوەڕم بەقسەکانت هەیە. گریەو زاری فریشتەیش نەیتوانی لەو بڕیارە پاشگەزم بکاتەوە. جانتاکەم هەڵگرت و گوتم:

فریشتە تەلەفۆن بۆ باوکم بکە، ئەو دەتباتەوە بۆ ماڵ.

سامۆئیل منی برد بۆ فڕگەو لەوێدا بەفڕۆکەی تایبەتی ئەو فڕین. من لەحاڵێکی وادا بووم کە بەلامەوە گرنگ نەبوو بۆ کوێم دەبات. سامۆئیل چووە ناو کابینەی فڕۆکەوانەوە و شتێکی پێ گوت و دواجار بەخواردنەوەیەکەوە گەڕایەوەو لەتەنیشتم دانیشت و گوتی:

ئەمە بخۆرەوە دێیتەوە سەر خۆ. کاتێک ڕەتم کردەوە بەبێزارییەوە گوتی:

منداڵ مەبە و بینۆشە. فرمێسکی سوێرم لەگەڵ خواردنەوەیدا بەربوونەوە. گیانم گەرم داهات و چاوەکانم قورس بوون. کاتێک چاوم کردەوە. فڕۆکەکە لەزەوییەکی نامۆ و سەوزدا نیشتبووەوە. سامۆئیل دەستی خستە ژێر باڵم و گوتی:

گەیشتین ئەزیزم. دابەزە. وەک بەرخۆلەیەکی دەستەمۆ دوای کەوتم. فڕۆکەوان فڕۆکەکەی بردە شوێنی خۆی و ئیتر نەمبینیەوە. سامۆئیل سواری ئۆتۆمبێل بوو. منی بردە کۆشکێکی شکۆدار کە تا ئەو کاتە هاوتاییم نەبینیبوو، ئەو خزمەتکارانەی کە خەریکی دەرو ژوور بوون، جلی عەرەبییان لەبەردابوو، وام هەست کرد لەوڵاتێکی عەرەبیدایین. سامۆئیل منی دایە دەست خزمەتکارێک و ڕۆیشت. ئەو بەزمانی عەرەبی شتێکی گوت کە تێی نەگەیشتم. لێم پرسی:

فارسی دەزانی؟ لێم ڕاما و جارێکی تر شتێکی بەعەرەبی گوت، بەدەستی ئیشارەی بۆ لایەک کرد. تێگەیشتم کە دەبێ لەگەڵیدا بڕۆم. منی بردە نهۆمی دووەمی کۆشک و دەرگای ژوورێکی بۆ کردمەوە. ژووری نوستن گەلێک گەورە و شکۆدار بوو، تەختە خەوەکەی بەجۆرێکی ناسک و جوان ڕازابۆوە. داستانی هەزار و یەک شەوم هاتەوە یاد. هەموو جوانکارییەکانی ژوورەکە ڕۆژهەڵاتی بوو. لەدڵی خۆمدا گوتم:

ئەگەر سامۆئیل موسڵمان بوایە، باوەڕم دەکرد کە ئەم کۆشکە حەرەمسەرای ئەوە و منیش یەکێکم لەژنەکانی! خزمەتکار بۆ گۆڕینی جلەکانم هاوکاری کردم و هەر لەو کاتەدا گەرماوەکەی نیشاندام و چووە دەرەوە. کاتێك چوومە ژێر رەشاشەکە، داهێزراوی و سستی لەلاشەم دەرچوو و توانیم بیر بکەمەوە. دەمزانی لەوڵاتێکی عەرەبیدام، بەڵام کام وڵات؟ کاتێك لەگەرماوەکە هاتمە دەرەوە لەپشت شوشەوە سەیری دەوروبەرم کرد. دیمەنێکی فراوان و سەوز بوو، وام بەخەیاڵدا هات کە ئەم کۆشکە تاکە بینای ئێرەیە و ئێمەش تەنها دانیشتوانی ئەوێین. توانای هەڵهاتن نەبوو. نە ڕێگا شارەزا بووم و نە دەشمزانی لەکوێدام. دەبوو ئارام بم و چاوەڕوانی هەلێکی گونجاوم بکردایە. سامۆئیل و هەمان خزمەتکار بەدوایەوە هاتنە ژوورەوە. سامۆئیل گوتی:

ناوی ئەو ژنە جەمیلەیە. کارەکانی تۆ ئەنجام دەدات. ئەو لەزمانی ئێمە نازانێت، بەڵام بەباشی کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات، بەتەنزەوە گوتم:

کاتێك لەزمانی یەکتر تێنەگەین، ئەو چۆن دەتوانێت هاودەمم بێ؟ گوتی:

من دەمتوانی کەسێکت بۆ بهێنم کە هاوزمانت بێت، بەڵام ترسام بەجوانیەکەت فریوی بدەی و لێرە هەڵبێیت. بەهەمان ئاواز گوتم:

کاتێك نازانم لەکوێم، چۆنچۆنی دەتوانم رابکەم؟ بەدەنگێکی بەرز پێکەنینێکی کردو گوتی:

ئەگەر کچێکی تر ئەم قسەیەی بکردبا لێم وەردەگرت، بەڵام تۆ لەگەڵ کەسانی تردا جیاوازیت. گوتم:

ناتەوێ پێمی بڵێیت منت بۆ کوێ هێناوە؟ گوتی:

نە ئازیزەکەم، چونکە ڕۆژێك خۆت ئاگادار دەبیت. گوتم:

ئێستاش تێگەیشتووم و دەزانم کە لەوڵاتێکی عەرەبیدام، بەڵام کامەیان؟ دەستەکانی لەیەك دا و گوتی:

قسەکەت ڕاستە. ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت و بشزانی لەکوێیت جەمیلە دەتوانێ یارمەتیت بدات. من تۆم بەو سپاردوەو ئەو بەوردی چاودێریت دەکات. پاشان لەکاتێکدا کەدەستەکانی دەخستە سەرشانم، گوتی:

هەوڵ بدە بیری ڕاکردن لەمێشکتدا وەدەرنێی، چونکە هەموو دانیشتوانی ئەم کۆشکە لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسانێکی میهرەبان و پسپۆڕن، هەر بەو جۆرە لەزۆر کاتیشدا گەلێک دڵڕەقن و ڕەحمت پێناکەن. گوتم:

منت لەم کۆشکەدا بەند کردوە؟ ڕاست و ڕەوان گوتی:

ئەگەر حەز دەکەیت وا بیر بکەیتەوە کێشەیەك نییە، بەڵام پێت دەڵێم کە بەتەواوی ئازادی و دەتوانی بەئارەزووی خۆت لێرە خۆشی ببینی، ئازیزەکەم تۆ بەڕێزترین ئافرەتی ئەم کۆشکەیت. هەموو خزمەتکاری تۆن، هەر فەرمانێك بدەیت، بەزوویی جێبەجێ دەکرێت، بەڵام ئەوەت بەڕاستی پێ دەڵێم کە هیچ کارێك بەبێ ڕەزامەندی من جێبەجێ ناکرێت، من ئەمڕۆ بۆ گرێبەستێك سەفەر دەکەم و تاکوو سێ ڕۆژی تر ناگەڕێمەوە، حەز دەکەم لەو سێ ڕۆژەدا کچێکی باش بیت و لەکۆشك دەرنەچیت. ئەگەر گەڕامەوەو بینیم گوێت بەقسەکانم داوە، بەڵێنت پێدەدەم کە بۆ گەشت و گوزار بتبەمە دەرەوە. ئێستا جەمیلە یارمەتیت دەدات کە جلەکانت لەبەر بکەیت. ئەمەی گوت و لەژوورەکە چووە دەرەوە. جەمیلە جلی عەرەبی لەبەر کردم و لەشێوەی ژنە عەرەبەکاندا ڕازاندمییەوە. کاتێك پێکەوە لەقادرمەکان چووینە خوارەوە، سامۆئێل لەپشتی مێزی نانخواردنەکەوە چاوەڕوانی دەکردم. کاتێك منی بەو جلانەوە بینی، چاوەکانی درەوشایەوەو روخساری شادی لێ دەباری. تاکوو نزیك قادرمەکان بەپیرمەوە هات و گوتی:

شەهرزادەکەم! تۆ بەڕاستی جوانی! لەئێستا بەدواوە من تۆ بەشەهرزاد بانگ دەکەم و فەرمان بەوانی تریش دەدەم وات بانگ بکەن. من گەورەترین ئەڵماست پێدەدەم تا هەلیواسی بەنێوچاوانتەوە، دروست وەك شەهرزادی چیرۆك بێژ. سامۆئێل چاوەڕێی دەکرد خۆشحاڵبم و لەبەر ئەو پیاهەڵدانەی سوپاسی بکەم، بەڵام کاتێك لەگەڵ

گوێپێنەدانی مندا ڕووبەڕوو بویەوە لەپڕدا توڕەیی ڕوخساری داگرت، بەڵام بەخێرایی دانی بەخۆیدا گرت و گوتی:

دەزانم ئەم شتانە خۆشحاڵت ناکەن، بەڵام باوەڕم وایە وردە وردە لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ڕادێیت. باڵی گرتم و لەبەرامبەر خۆی دانیشاندم و فەرمانی دا خواردن بهێنن و بۆ چرکەیەك چاوی لەسەر روخسارم هەڵنەدەگرت. لەکاتی نانخواردندا گوتی:

من مەعشوقەگەلێکی زۆرم هەن، بەڵام هیچ کامیان بەجوانی تۆ نابن. یەکەمین جار کە تۆم بینی لەدڵی خۆمدا گوتم، ئەم کیژە گەوهەرێکی کەم وێنەیە و دەبێت بەدەستی بهێنیت. زۆرم هەوڵدا کە دڵت ڕام بکەم، بەڵام بێئاگا بووم لەوەی مامۆستایەکی شرپۆش دڵی لێسەندویت! . گوتم:

ئیهانەی مەکە ! چەند جارێك دەستی بەمانای داوای لێبوردن جوڵاند و گوتی:

بەڵێ، بەڵێ داوای لێبوردن دەکەم کە ئیهانەی مامۆستاکەتم کرد، ئیهانەم کرد، بەڵام زۆر حەزم دەکرد روخساری مامۆستام ببینیایە، کاتێك کە ئاگادار دەبوو من مەعشوقەکەیم ڕفاندووە. گوتم:

من مەعشوقەی هیچ کەس نەبووم و نیم. مامۆستایش بەهیچ جۆرێ خۆشەویستی بۆ من نەبووە کە روخساری بەبیستنی ئەمە بگۆڕێت. سەری ڕاوەشاندو گوتی:

لێرەشدا تۆ لەسەر حەقی. من پیاوێکی خەیاڵ بڵاوم. لەبیرم کرد کە شەهرزادە جوانەکەی من عاشقی ئەوە نەك ئەو عاشقی شەهرزاد. تکات لێدەکەم لەبەر ئەم هەڵەیەم بمبەخشیت، بەڵام ئازیزەکەم وا هەست ناکەیت کە ئەو پیاوێکی بێ سەلیقەیە کە تۆی ناوێت؟ کچێك بەو هەموو جوانییەوە بەپێی خۆی چوو بۆ ماڵی و ئەو لێی بێئاگا بوو؟ ئەگەر دڵگران نابیت دەبێ بڵێم مامۆستاکەی تۆ پیاو نییە ! هاوارم کرد:

بیبڕەوە ! تۆ مافی ئەوەت نییە لەبارەی ئەوەوە بەمجۆرە بدوێی. بەدەستەسڕی سەر سفرەکە گۆشەی لێوی سڕی وگوتی:

هەر جۆرێ تۆ ئارەزوو دەکەیت. نامەوێ لەکاتێکدا لێت دوور دەکەومەوە لێم ڕەنجابیت. هەستا و شوێنی نانخواردنەکەی بەجێهێشت، من گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم

لەسەر تەختە خەوەکەم پاڵ کەوتم و دەستم بەگریان کرد. دڵم بۆ مامۆستا و فریشتە و ئەوانی تر تەنگ ببوو. نەمدەزانی چی دەکەن و فریشتە لەکوێدا نیشتەجێیە. ئاگام لەهاتنی سامۆئیل نەبوو، بەڵام کاتێك گەرمی لێویم لەسەر لێوم هەست پێکرد، بەسەرسوڕمانەوە چاوم هەڵبڕی و لەسەر نوێنەکەم دانیشتم. سامۆئیل پێکەنینێکی کرد و گوتی:

نیگەران مەبە. من کارێکم بەتۆ نییە. تەنها ماچی ماڵئاواییم کردی. هیوادارم قسەکانمت لەبیر نەکردبێ و تا دەگەڕێمەوە کیژێکی لەسەرخۆ و ئارام بیت. ئەوەی گوت و چووە دەرەوە. کەدەنگی فڕۆکەکە بەرز بوویەوە تێگەیشتم کە سامۆئیل کۆشکی بەجێ هێشتووە. لەکاتی دوا نیوەڕۆدا چوومە دەرەوە و دەستم بەپیاسەکرد. دەبێت دەوروبەرەکەم بناسم. کۆشك لەکەناری دەریادا بوو، دەورو بەریشی درەختی سنەوبەر دەورەیان بوو. لەتەپۆڵکەیەکەوە سەرکەوتم و چاوم کەوت بەدەریایەك کە ئاوە شینەکەی چاوی تێك دەدا و کەشتیگەلێکی گەورە و بچووك لەحاڵی هاتوچۆ دابوون. لەپشتی کۆشکدا چاوم بەتەویلەیەك کەوت و پیاوێك لەحاڵی قاشاوکردنی ئەسپێکدا بوو. بەئومێدی ئەوەی کە بەڵکوو ئەو زمانم بزانێت، بەرەو لای چووم و پرسیم:

تۆ لەزمانی من تێدەگەیت؟ سەیرێکی کردم و هیچی نەگوت، سەری بەرەو تەویلەکە وەرچەرخاند و بەعەرەبی بانگی کەسێکی کرد. ماوەیەك دوای ئەوە پیاوێك وەدەرکەوت کە جلەکانی خاوێن و ڕێکوپێك بوون. کاتێك منی بینی بەرەو لام هات و لەکاتێکدا کە بەڕێزەوە چەمییەوە و جارێکی تر بەعەرەبی شتێکی گوت. کاتێك منی وڕ و کاس هاتە بەرچاو، بەئیشارەی دەستی تێی گەیاندم کە پەلە نەکەم پاشان بەرەو تەویلەکە چوو و ئەسپێکی جوانی هێنایە دەرەوەو بۆی زین کردم. ئەو پیاوە وای گومان بردبوو کە خەیاڵی ئەسپ سواریم هەیە. ئەسپەکەی بۆ هێنام و جارێکی تر شتانێکی گوت کە وای بۆ دەچووم باسی ئەسپەکەم بۆ دەکات، چونکە لەکاتی قسەکردنەکەیدا دەستی بەسەر و ملی ئەسپەکەدا دەهێنا. بەلامەوە خراپ نەبوو کە بەئەسپ سەر لەشوێنەکانی تری کۆشك بدەم. بەهاوکاری ئەو سوار بووم و ئەو پیاوە وەك بزانێت سوارێکی ناشیم،

چونکە لغاوی ئەسپەکەی بەرنەدا و من و ئەسپەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، ماوەیەك ڕێگەمان کرد. ئیشارەتم کرد کە لغاوی ئەسپەکە بەربدات، بەڵام چەند جارێك سەری بەشێوەی نارەزایەتی ڕاوەشاند و کەوتەوە ڕێ و ئێمە دەورێکی کۆشکمان لێدا. لەبینینی باڵەخانە بەرز و جوانەکان و لەقەشەنگی ئەو شارە ڕازاوەیەو گڵۆپە ڕەنگاو ڕەنگەکانی بەتەواوی سەرم سوڕمابوو. لەسەر تەپۆڵکەکەوە دەمتوانی بەباشی گەڕیدەکان ببینم. هەرچییم دەبینی هەمووی هەرجوانی بوو. بەدەنگی بۆقی کەشتیەکان کە دەهاتنە بەندەرەکەوە بۆم ئاشکرا بوو کە کۆشکەکەی سامۆئیل لەکەنار بەندەرێکی گەورە دایە کە خەڵکانێکی زۆری لێن و جمەی دێ. ویستم بەئەسپەکە لەکۆشك بچمە دەرەوە و تاکو کەناری لەنگەرگا بڕۆم، بەڵام ئەو پیاوە لێی قەدەغە کردم و منی تا نزیك دەروازەی کۆشك برد و لەئەسپەکە دایبەزاندم. جەمیلە لەتەنیشت کۆشکدا چاوەڕوانی دەکردم و لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و ئیشارەی بۆ جلەکانم دەکرد، وامزانی جلەکانم پیس بووە، بەڵام کاتێك گەڕامەوە ژوورەکەم ئەو جلێکی سواری نیشاندام و بەئیشارەت تێی گەیاندم کە بەو جلانەوە نەدەبوا سواری بکەم. هەم پێکەنینم دەهات و هەم توڕەش بووم و بەدەست ئیشارەم بۆ کرد کە بێدەنگ بێت. تێگەیشت و بەبێزاری لەژوورەکەم چووە دەرەوە، هەر خێرا لەو کردەوەی خۆم پەشیمان بوومەوەو لەشەودا کاتێك هات جلەکانم بگۆڕێت بەزمانی خۆم داوای لێبووردنم لێکردو چونکە تێگەیشتم لەمەبەستم حاڵی نابێت، ڕوخساریم ماچ کرد کە وەك کارەبا گرتوو بەرەو پاش کشایەوە! بۆساتێك بەمات و حەپەساوی لێم ڕاما، کاتێك زەردەخەنەی لەسەر لێوەکانم بینی ڕوخساری گەشایەوەو ئەویش بۆم پێکەنی. لەکاتی داهێنانی قژەکەمدا دەستی سۆزی بەسەرمدا هێنا و منیش بێ ویستی خۆم سەرم بەسینگەوە نا. بۆ ماوەیەك دەستی بەسەرمدا دەهێناو ئەو کات وەك بڵێی لەخەو بێدار بووبێت بەپەلە و چاپوکیەوە دەستی بەڕازاندنەوەی پرچم کرد. پۆشاکێکی گەلێك جوان‌و درێژی نەرمی لەبەر کردم. پۆشاکێك بەنەرمی حەریر و بەڕەنگ پەمەیی. هێندە خۆشم لەو جلانە دەهات کەچەند جارێك دەستم پیادا هێنان و لەئاوێنەکەدا لەخۆم ڕوانی. جوان ببووم. جەمیلە جۆرە پوڵەکەیەکی لەسەرمدا و خۆیشی

وەستا بۆ تەماشاکردنم. پێکەوە هاتینە خوارەوە و من بەتەنها خواردنم خواردو لەبیناکەدا دەستم بەپیاسە کرد. جەمیلە لەمەبەستم حاڵی بوو، یەك یەك ژوورەکانی نیشاندام. هەر یەکێك لەژوورەکان بەکەمێك جیاوازییەوە، هاوشێوەی یەکتر ڕازێنرابوونەوە. لەیەکێك لەژوورەکاندا چاوم بەتابلۆیەك کەوت کە لەوێنەی بەندەرگایەکدا بوو کە لەسەر تەپۆڵکەکەوە بینیبووم. چووم بۆ لای تابلۆکە و نوسینەکەی ژێریم خوێندەوە کە بەئینگلیزی نوسرابوو. ئەو دیمەنە تایبەت بوو بە بەیروتەوە. روم کردە جەمیلەو بەپەنجە ئیشارەم بۆ زەوی کرد و گوتم:

ئێرە بەیروتە؟ چەند جارێك بەیروتم دووبارە کردەوە. لەمەبەستم تێگەیشت و لەکاتێکدا کە پێدەکەنی بەجوڵاندنی سەری بەڵێی نیشاندا و گوتی:

بەیروت. بەیروت. هەناسەیەکی ئارامم هەڵکێشا. جەمیلە دەستی گرتم و بەرەو خۆی رایکێشام. هەستم کرد دەیەوێت شتێکم نیشان بدات بەرەو لای چووم، دەرگای ژوورێکی تری کردەوە کە پێشتر نەمدیبوو. چووینە نێو کتێبخانەیەکی گەورەوە و ئەو راستەوخۆ بەرەو لای قەفەسێك چوو کتێبێکی وێنەداری هەڵگرت و دایە دەستم. نوسینی کتێبەکە عەرەبی و فەرەنسی بوو، بەڵام دیار بوو کە جەمیلە دەیویست ئەو زەویەم پێ بناسێنێت. بەگوشینی دەستی سوپاسم کردو سەرقاڵی تەماشاکردنی کتێبەکە بووم. خۆم زانیارییەکی کەمم دەربارەی لوبنان هەبوو، دەمزانی بەیروت نازناوی بووکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی هەیەو شارێکە جوان و بازرگانی. تێگەیشتم دەریایەك کە منی لەناو خۆیدا ئابلۆقە داوە " دەریای سپییە". لەگەڵ وردبوونەوەم لەپاشماوەی وێنەی ئەو کۆشکانەی کە وەك ئەو کۆشکە وابوومنی تێدا دەژیام ناوی شەقامەکەیشم پەیدا کرد و بەجەمیلەم گوت:

شارع الحمرا! و لەکاتی گوتنیدا ئیشارەم بەدەوروبەرم کرد. لەمەبەستم تێگەیشت و جارێکی تر بەزەردەخەنەوە دانی بەڕاستی قسەکەمدا نا. کاتێك لەکتێبخانەکە چووینە دەرەوە من بەمەبەستی خۆم گەیشتبووم کە نیشانەی سەرکەوتنم بوو. شەوم بەئارامی

بەسەر برد و بەیانی زوو لەخەو هەستام. کاتێك بێ وادە چوومە چێشتخانەکەوە، هەموان سەرقاڵی خواردنی نانی بەیانی بوون، جەمیلەش لەنێویاندا بوو، بەبینینی من هەوڵ بوو بەرەو لام هات، چوونە ژوورەوەی لەناکاوی من ئەوانی حەپەساندبوو بەواق وڕمانەوە چاویان تێبڕیبووم. حەزم دەکرد ئەوان من بەیەکێك لەخۆیان بزانن و بەجۆرێك تێیان بگەیەنم کە دەبێت هەڵێم و داوای یارمەتیان لێبکەم. کاتێك لەسەر کورسییەکەی جەمیلە دانیشتم ئیشارەم بەوانیش دا کە دانیشن. پاشان بەهێما و ئیشارە جەمیلەم تێگەیاند کە نانی بەیانیم بۆ بهێنن، باوەڕی نەدەکرد من بمەوێت لەوێدا نانەکەم بخۆم، بەڵام کاتێك پارچە نانێکی باغەوانەکەم هەڵگرت و نامە نێو دەمم، بەخێرایی نان و پێخۆری لەپێشم دانا. خواردنێکی تەواو بوو. من دەمخواردو ئیشارەم بۆ ئەوانیش دەکرد کە نانەکەی خۆیان تەواو بکەن. کاتێك نیگام لەگەڵ نیگایاندا بەر یەك دەکەوت، زەردەخەنەیەکم دەکردو تەنها ئەوە بووە هۆی خۆشەویستییەکی پتەو لەنێوانماندا. پاش خواردنی نانی بەیانی هێمام بۆ جەمیلە کرد کە لەگەڵم بێت و ئەویش لەگەڵمدا هات و من ڕێگای تەپۆڵکەی گوڵی سورم گرتە بەر. دەمویست ئەو پاسپۆرتی دەرچوونم بێت لەکۆشکدا. بەڵام هێشتا لەدەروازەی حەسار نزیك نەببوینەوە کە ئەسپ سوارێك هاتە پێشمان و بەعەرەبی شتێکی بەجەمیلە گوت و ئەو دەستی ڕاکێشام و ڕێگای بەرەو کۆشك گۆڕین. من لەسەر تەپۆڵکەکە دانیشتم و سەیری ئەو خەڵکانەم دەکرد کە خۆیان دەهاویشتە ناو ئاوەکەوە. سەرەنجام توانیم دوا مۆدیلی جل و بەرگەکان لەبەر گەشتیاراندا ببینم و سەرم سوڕما کە بۆچی سامۆئیل دەیەوێت من بەجلی عەرەبییەوە ببینێت. ئایا من لەشێوەی ئەواندا بووم؟ لەبینینی گەشتیارەکاندا ئارەزووی مەلەم کرد و جەمیلەم لەمەبەستم حاڵی کرد، ئەو چاوی بەدوای سوارەکەدا گێڕا و دواجار بەدەنگێکی بەرز بانگی لێکرد. کاتێك سوارەکە لێمان نزیك بوویەوە جەمیلە نیازەکەی منی پێ ڕاگەیاند، بەڵام جارێکی تر ئەو پیاوە سەری ڕاوەشاند و لێمان دوور کەوتەوە. جەمیلە بەئامێکەوە

ـەبری کردم. تێگەیشتم کەسامۆئیل هەموو ئەو ڕێگایانەی لێ گرتووم کە لەوێدا دەرباز
بم و فەرمانی بەوان داوە ڕێگای ئەنجامدانی ئەو کارانەم لێبگرن. من تەنها دەمتوانی
سواری ئەسپ بم و ئەویش بەو ڕێگایەی کە لەپێشدا گوتم، هەوساری ئەسپەکەیان
بەدەستی خۆمەوە نەدەدا. کاتێك چوومە ژوورەوە لەبینینی ئەوگوڵە سوورانەی کە لە
سەر مێزی تەنیشت تەختەکەمەوە دانرابوو خۆشحاڵ بووم و هەستم کرد کە توانیومە
متمانەی ئەوان بەدەست بهێنم. بۆ نانخواردن بانگهێشتم کردن، جەمیلەم تێگەیاند کە
دەبێت هەموویان لەسەر مێز ئامادە بن. ئەو هەستی کرد کە بۆ نانخواردن بانگهێشتیان
دەکەم. بەئاشکرا خۆشحاڵیم لەڕوخساریدا دەبینی. بەدڵخۆشی چووە چێشتخانە و
ئەوانیشی ئاگادار کرد. دانیشتنی ئەوان لەپشت مێزی میوانداریيەوە شتێکی جوان و
سەرنج ڕاکێش بوو بوو. هەموو خۆیان بۆ ئەم بانگهێشت کردنە ڕازاندبۆوە، بەلامەوە
ئەشیاو نەبوو خزمەتیان بکەم و کاتێك بینیان کە بۆ خزمەتکردنیان پەشتەماڵم بەستوە
تێکڕا لەپێکەنینیاندا. میوانداریيەکی باش بوو هێندە لەخزمەتکارەکان خۆش گوزەرا کە
یەکێ لەکرێکارەکان دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ سازە تایبەتەکەی خۆی هێنا و دەستی
بەژەندنی کرد. کیژەکان بەئارامییەکی تەواوەوە گوێمان بۆ نەوای مۆسیقاکە شل کرد و
لەبیریانکرد کە من لەنێویاندام. میوانداریيەکەمان بەهاتنی ئەو پیاوەی کە بەئەسپەکەوە
چاودێری دەکردم کۆتایی هات. ئەو بەتوندی هەموویانی پەرتەوازە کرد و بەشوێنیاندا
بەرەو چێشتخانەکە چوو. تەنها مامەوە و بەرەو ژوورەکەم گەڕامەوە، تێگەیشتم ئەو
پیاوە ناهێڵێت لەو ڕێگایەی کە بەنیازم لێیەوە دەرباز بم سەرکەوتوو بم. دوانیوەڕۆی ئەو
ڕۆژە کاتێك بۆ پیاسەکردن لەقادرمەکانەوە دەهاتمە خوار، لەڕوخسارياندا چیتر
تروسکەی میهرەبانی و خۆشەویستیم نەبینی. هەڵسوکەوتیان بەتەواوی سارد و دوور
لەخۆشەویستی بوو. لەدڵمدا ڕق و قینم بەرامبەر بەو پیاوە پەیدا کردو بەتەنهایی بەرەو
حەساری کۆشك کەوتمە ڕێ. ڕۆژ لەئاوابووندا بوو دەنگی شەپۆلی دەریا لەگەڵ قیژەقاوی

گەشتیارەکاندا تێکەڵ ببوو. لەم دیو حەسارەکەوە وەستام و سەیری مرۆڤە دڵخۆشەکانم دەکرد کە لەحاڵی هاتووچۆدا بوون. دەنگی مۆسیقایەکم بەر گوێ کەوت کە زۆر دوور نەبوو، کەشتیەك لەحاڵی بارخاڵی کردندا بوو، شنەبایەکی دەهات کە لەگەڵ خۆیدا بۆنی دەریای دەهێنا. دڵم لەو خۆرئاوابونەدا تەنگ بوو، لەخۆمەوە فرمێسکم بەرەو خوار دەخزی. بیری ماڵم دەکردەوە. حەزم دەکرد کە خۆزگە ئێستا لەماڵی مامۆستادا دابنیشتبایەم و چاوەڕوانی هاتنەوەی ئەوم بکردبا، دڵم بۆ نیگاکانی، تووڕەبوونی و زەردەخەنە کاڵەکانی تەنگ ببوو. نەمدەزانی بەبێ من چی دەکات، چ کەسێك نانی بۆ ئامادە دەکات، نەمدەزانی کە ئایا ئازاری گەدەی لەکۆڵ بۆتەوە، یان هێشتا لەبەر کاریگەری خواردنی دەرەوە خراپتر بووە. بەخۆم گوت:

چ کەسێك ماڵەکەی بۆ خاوێن دەکاتەوە؟ چ کەسێك بەیانی زوو نانی بۆ دێنێت؟ ئایا ئەویش بیر لەمن دەکاتەوە؟ ئایا دڵی ئەویش بۆ من تەنگ دەبێت؟ ئای...! ئەگەر منی لەبیر کردبێت دەبێت چی بکەم؟ غەمگین و نائومێد گەڕامەوە بۆ کۆشك، خەمبار و پەشێو چوومە سەر نوێنەکەم و نانی ئێوارەشم نەخوارد.

بەیانی زوو لەدەنگی فڕۆکە بەئاگا هاتم و زانیم کە سامۆئیل گەڕاوەتەوە. جەمیلە بەپرتاو هاتە ژوورەوەو ویستی بۆ لەبەرکردنی جلەکانم هاوکاریم بکات. تێمگەیاند کە بەنیاز نیم لەنوێنەکەم بێمە دەرەوە. چەند جارێك سەری ڕاوەشاندو شتانێکی گوت، بەڵام کە بینی من بەهیچ شێوەیەك بەنیاز نیم نوێنەکەم جێ بهێڵم جارێکی تر سەری ڕاوەشاندەوەو چووە دەرەوە. چەند خولەکێك تێنەپەڕی بوو کە سامۆئیل بەجلی فڕینەوە هاتە ژوورەوە و پرسی:

شەهرزاد حاڵت باشە؟ بەبیستنی دەنگێکی ئاشنا دڵخۆشبووم! بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت، گوتم:

حاڵم باش نییە، بەتەواوی لەو مرۆڤانە بێزار بووم، هیچ کامیان زمانی من تێناگەن. تۆ منت لێرەدا زیندانی کردوە. نە مۆڵەتم هەیە لەکۆشك بچمە دەرەوەو نە رێگای مەلەکردنم هەیە. من لێرەدا باڵندەیەکی باڵ بەستراوم و لەهەمووی خراپتر ئەو پیاوە ئەسپ سوارەیە. هێندە بێزاری کردووم، کە حەز دەکەم بەچنگ و ددان لەناوی بەرم! بەجۆرێك لەسەر ئەسپەکە دامدەنێت، ڕەشمەکە ڕادەکێشێت، وەك بڵێی دزم و یان تاوانێکی گەلێك گەورەم ئەنجام دابێت! ئەگەر ئەو قەلە ڕەشە جارێکی تر هەستم بریندار بکات هەرچی بەسەر هات خۆی بەرپرسیارە! لەمەبەستم تێدەگەیی؟ لەقەراغی نوێنەکەمەوە دانیشت و گوتی:

لەمەبەستت تێدەگەم. هەر وەك دەزانی ناچار بووم کەسانێك هەڵبژێرم کە زمانی تۆ تێنەگەن. ئێستا من لەلای تۆ دام و دەتوانی لەگەڵ مندا قسە بکەیت. دوێ شەو ئاگاداریان کردم کە تۆ نانت نەخواردوە. ترسام نەخۆش بیت، ئەوە بوو کە بەپەلە کارەکانم ئەنجامدا و گەڕامەوە، گوتم:

سەرچاوەی زانیاری وردت هەیە، بەتەوسەوە پێکەنینێکی کرد و گوتی:

کارەکەی ئێمە ئەوە دەخوازێت کە لەکارەکەماندا ڕاڕا بین. حەز دەکەیت لەسەر جێگاکەت نانی بەیانی بخۆیت یان لەگەڵ مندا دەبیت؟ گوتم:

نە، هەڵدەستم. ئەو تا نزیك دەرگاکە ڕۆیشت و پاشان وەستا و ڕوی تێکردم و گوتی:

شەهرزاد، خۆشحاڵم کە ساغ و تەندروستیت؟ زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و ئەو بەشادومانییەوە ژوورەکەی بەجێ هێشتم.

"١٧"

کاریگەری ئاووهەوای بەیرووت و هەروەها نەبوونی هاوزمان هەستێکی وای تێدا دروستکردبووم کە لەبیرم کردبوو سامۆئیل دوژمنی منە و تێکدەری بەختەوەرییەکانمە. لەبیرم کردبوو کە ئەو منی لەئەزیزانم دوور خستۆتەوە. کاتێك لەسەر مێزی نانخواردنی بەیانی ئامادە بووم، سەیرێکی سەرتاپامی کردو گوتی:

شەهرزاد خانم تۆ ڕۆژ بەڕۆژ جوانتر دەبیت و منیش ڕۆژ بەڕۆژ گڕی عەشقم زیاتر زمانە دەکێشێ! گوتم:

بەڵام من بەجۆرێکی تر بیر دەکەمەوە. کورسییەکەمی بەرەو دواوە ڕاکێشاو یارمەتی دام دابنیشم و گوتی:

خۆشەویستەکەم تۆ چۆن بیر دەکەیتەوە؟ بیر و ئەندێشەی تۆ بەلامەوە بەهای تایبەتی هەیە و تامەزرۆم گوێبیستی قسەکانت بم. بێدەنگ بووم و خۆم خەریك کرد بەخواردنی نانەکەوە کە گەلێك شاهانە بوو. پاشان هەردووکمان بەپیاسە کەوتینە ڕێ. ئەسپ سوارەکەم بەرچاو نەکەوت. لەوەی کە دەمتوانی ئازادانە هەنگاو بنێم خۆشحاڵ بووم، شادییەکی منداڵانە لەدەمارەکانمدا خرۆشا. بەسامۆئیلم گوت:

لەگەڵ ئەو هەموو نیگەرانییەی کە لەدڵمدایە بەرانبەرت، خۆشحاڵم کە لەتەنیشتمدای و دەتوانم لەگەڵتدا گفتوگۆ بکەم. شەوقی ڕازیبوونم لەڕوخساریدا هەست پێکرد. گوتی:

تۆ گەلێك هەست بەدڵتەنگی دەکەیت، دەزانم مافی خۆتە، بەڵام هیوادارم بەم شوێنە ڕابێیت و دەست لەم لاسارییەت هەڵبگری. گوتم:

من لاسار نیم، بەڵام بەدەستی خۆم نییە. ناتوانم خۆشەویستی پیاوێکی تر لەدڵمدا بێ بکەمەوە. من مامۆستام خۆش دەوێ و لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانم ئەو عاشقی من نییە، بەڵام بەوەیشەوە بەلامەوە گرنگ نییە. من بەڕاستگۆیانە خۆشم دەوێ و بەیادی ئەوەوە هەناسە دەدەم. هەستدەکەم هەر هەنگاوێك کە دەینێم ئەوم لەگەڵدایە و لەرِوخسارم ورد دەبێتەوە. دەزانی؟ هەتا لەهەندێك کاتیشدا گوێم لەدەنگی دەبێت کە ناوم دەهێنێت! عەشقی مامۆستا لەگەڵ خوێنمدا تێکەڵ بووە. من ئەگەر چەندین ساڵیش لەلای تۆدابم و بەو شێوەیە بژیم، هێشتاش دەزانم کە ڕۆژێك بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوەو لەتەنیشتی ئەودا بەردەوامی بەژیان دەدەم. تۆ ڕۆژێك گوتت کە نامێلێت ئێمە پێکەوە بین، لەوانەیە سەرکەوتوو بیت، بەڵام خۆشحاڵم کە ناتوانیت لەو دونیا لێکمان جیا بکەیتەوە! من دەزانم کە لەو دونیا لەلای یەکتر دەبین و خۆشبەختیش دەبین. سامۆئیل دەستی گرتم و گوتی:

شەهرزادەخۆشەویستەکەم! من هێندە خۆشەویستیت بۆ دەردەبڕم کە عەشقی مامۆستا لەبیر بکەیت. تۆ شایانی ئەو نیت. بەرقەوە سەیرێکم کرد. داوای لێبوردنی کرد و گوتی:

داوای لێبوردن دەکەم. مەبەستی سووك کردنیم نەبوو، بەڵام ئێستاش دڵنیام کە ئەو هەست بەجوانییەکان ناکات، ئەگینا گەلێك زوو دڵی پێ دەدای. گوتم:

بەڵام ئەو نووسەرەو هەستێکی پاك و بێگەردی هەیە، ئەو هەست بەجوانی دەکات، بەڵام لەوانەیە جوانی لەمندا نەبینیبێ لەبەر ئەوە ئاشکرای ناکات. سەری ڕاوەشاندو گوتی:

ناگونجێت جوانی بناسێت و تۆ بەجوان نەزانێت. تۆ جوانی وەك شەهرزادی نێو چیرۆکەکان! نازانیت خاڵی سەر ڕوومەتت چەندە تۆی دڵرفێن کردوە. ئەو چاوانە. ئەو برۆ و لێوە خونچەییانە! ئەوانە هەموو لوتکەی جوانین! هیچ پیاوێك ناتوانێت بێ سەرنجدان بەلای ئەو هەموو جوانییەدا تێپەڕێ، مەگەر ئەوەی کە لەناخیدا هەستی جوانیناسی مردبێ. ئەزیزەکەم باوەڕ بکە کە ڕاستیت پێدەڵێم، تۆ هێندە جوانی کە هیچ

پیاوێك ناتوانێ بۆ ماوەیەك لەبەرامبەرتدا خۆی ڕاگرێت و عاشقت نەبێت. تۆ وەك ئەستێرە لەنێوان ژناندا دەدرەوشێیتەوە، تۆ گەوهەرێکی کەم وێنەیەی و هەر بەو شێوەیەی کە پێشتر گوتم تۆ لەگەڵ ئافرەتانی تردا جیاوازیت، لەتۆدا هێزێکی ڕاکێشەر هەیە وەك موگناتیس کە هەمووان بەرەو خۆی ڕادەگێشێت! حەزدەکەم لەو بارەوە بیر بکەیتەوە کە مامۆستات پیاوێکی نەخۆشە و وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەیتەوە، ئایا لەو چەند مانگەدا کە لەماڵی ئەودا دەژیای، بۆجارێك لێوی بۆ ستایشکردنت هەڵێنایەوە؟ ویستم بڵێم نەخێر، کە ڕووداوی ئەو شەوەم هاتەوە یاد کە گوتی، تۆ لەکوێ دەزانی من عاشق نیم و ئەو ساتەم هێنایەوە یادم کە پێکەوە شووشە شکاوەکانی گوڵدانەکەمان کۆ دەکردەوە. چاوە عاشقەکانی مامۆستاو دەستە لەرزۆکەکانی چیرۆکی دڵیان دەگێڕایەوە.

گوتم:

مامۆستا پیاوێك نەبوو کە نهێنی دەروونی خۆی بەزبان بدرکێنێ، ئەو بەدڵسۆزییەکانی نیشانی دەدا کە عاشقە و ئەوەش بەلامەوە بەس بوو. سامۆئیل گوتی:

دڵسۆزی و عاشقی جیاوازییان هەیە، پەرستارێك بۆ نەخۆشەکەی دڵسۆزە، بەڵام عاشقی نییە. ئەو ئەگەر لەبەرامبەر خزمەتێکدا کە تۆ کردوتە لەگەڵت میهرەبان بووە، ئەوە نیشانەی ئەوە نییە کە عاشقت بوو بێت. عاشقێك بەهەر هۆیەکەوە بێت بتوانێ عەشقەکەی ئاشکرا بکات. شەهرزادە ئازیزەکەم مامۆستا بەرانبەرت ئەمەکناس بووە و هیچی تر. ئێمە بەپیاسە بەسەر زیخەکەدا دەڕۆیشتین و من لێدەگەڕام ئاو خۆی لەقاچەکانم بسوێ. قسەکانی ئەو منیان بۆ بیرکردنەوە کێش کردبوو، ئایا بەڕاستی قسەکانی سامۆئیل حەقیقەتن و مامۆستا عاشقی من نەبوو؟ ئایا پێدانی ئەو گەردنبەندە بەتەنیا لەڕووی ئەمەکناسییەوە بوو؟ هەروەك ئەوەی کە ئەو ڕۆژە بۆی چووم؟ ئایا قسەکانی فریشتە ڕاستییان تێدا بوو، مامۆستا بەناوی لێبووردنەوە ئەو گەردنبەندەی نەکڕیبوو؟ بەڵام ئایا نیگای مامۆستا و لەرزینی دەستەکانیشی حەقیقەت نەبوون؟ کاتێك کە سامۆئیل دەستی گرتم لەساردی دەستم حەپەسا و بەنیگەرانییەوە پرسی:

شەهرزاد حاڵت باشە؟ نیگای بێ تینم لەچاوەکانی بڕی و گوتم:

هەست دەکەم خوێن لەدەمارەکانمدا بەستوویەتی! هەست بەسەرما دەکەم. وەرە بگەڕێنەوە، سامۆئیل دەستی خستە ژێر باڵم و گەڕاندمیەوە بۆ کۆشك. توانام نەبوو لەقادرمەکان سەرکەوم هەر لەبەر ئەوە سامۆئیل منی لەئامێز گرت و لەسەر نوێنەکەم ڕابکێشام. فەرمانی دا پزیشك بێنە سەرم و خۆیشی بەخەمبارییەوە لەلای تەختەکەمەوە دانیشت و لەحاڵێکدا کە پەنجەی دەستەکانمی بەڕوومەتیەوە دەچەسپاند، بەورتە ورتەوە گوتی:

شەهرزادە خۆشەویستەکەم! ئەگەر دەمزانی قسەکانم تۆ بەم حاڵە دەگەیەنێت هەرگیز بە زمانمدا نەدەهێنان. تکات لێدەکەم لێم ببوورە!

من گیرۆدەی بێ هیوایی و ڕەنجەڕۆییەکی سەخت بوبووم. ئەگەر لەژێر باری دیلێتیدا ئارامم دەگرت، تەنها لەبەر ئەوە بوو کە نەمدەویست مامۆستا ئازارێك ببینێ. من دەترسام سامۆئیل لەبەر شکستی لەعەشقەکەیدا و بۆ تۆڵەکردنەوەی لەمن کارەساتێك بەسەر مامۆستادا بهێنێ. من دڵم بەوە خۆش دەکرد کە مامۆستا خۆشی دەوێم و هەست بەبەهای فیداکارییەکانم دەکات. قسەکانی سامۆئیل منیان لەقەڵایەکی بەرزەوە بۆ شیوێکی قووڵ فڕێ دابوو. من تەواوی هیوا و ئارەزووەکانم بەناکامی دەبینی. بیرم لەخۆم دەکردەوە سامۆئیل ڕاست دەکات! من هێندە عاشقی مامۆستا بووم کە بچووکترین هەڵسوکەوتی ئەوم بەسوودی خۆم لێکدەدایەوە. ئەو بۆ تەنیا جارێکیش لەبەر جوانییەکەم ستایشی نەکردم! خۆشی نەدەویستم و تەنها من بووم کە لەو عەشقەمدا گەداییم دەکرد. ئەو لەکەناری فریشتەو دۆستەکانیدا دڵخۆشتر بوو لەو کاتانەی کە بەتەنها من و ئەو بووین. هێنامەوە یادم کە چۆنچۆنی مامۆستا لەمن دوور دەکەوتەوەو خۆی لەژوورەکەیدا بەند دەکرد. هێنامەوە یادم کە ئەو بەچ شێوەیەك پەیکەرێکی بەفرینەی دروست کردبوو و پێداگری دەکرد کە لەشێوەی من دایە. لەکاتێکدا کە شکڵی ئەو پەیکەرە گەلێك ناحەز و ناشیرین بوو، ئایا مامۆستا دەیویست من تێبگەیەنێت کە شێوەم لەپێش چاوی ئەودا بەو جۆرەیە؟ ئای من چەندە بیرکورت بووم کە تێنەگەیشتم مامۆستا چ مەبەستێکی هەیە! بەڵام بۆچی منی لەلای خۆی دەهێشتەوەو دەری

نەدەکردم؟ ئایا خووی پێوە گرتبووم؟ بەڵام ئەو داوای لێکردم کە نەچم بۆ کڵێسەو لەماڵدا لای ئەو بمێنمەوە، ئەو هەتا لێشی پرسیم کە ئایا ئامادەم موسڵمان ببم؟ ئۆی، نە! من دڵنیام کە مامۆستا خۆشی دەوێم. هەم ئەویش نیگەرانی حاڵی منە. ئەگەر بیزانیبا من لەکوێم بەدڵنیاییەوە بۆ ڕزگارکردنم تێدەکۆشا. مامۆستا منی بە کابانی خۆی بانگ دەکرد! من کابانی ئەوم و ئەو هیچ ئافرەتێکی تری جگە لەمن خۆش ناوێت. سەرم گێژی دەخواردو پەردەیەکی ڕەش لەبەرامبەر چاوەکانمدا دەشێوا. لەدوایین ساتدا ئارەزووی ئەوەم کرد کە خۆزگە مامۆستا خۆشی بویستبام و لەلایشمدا دەبوو. ڕەنگ لەڕووم پەڕیبوو، سارد ببوومەوە. کاتێك پزیشك بەوردی سەرنجی دام و لەکاتی ڕۆیشتندا لەوەڵامی ئەو پرسیارەی سامۆئیلدا کە گوتی:

دکتۆر گیان حاڵی چۆنە؟ گوتی:

ئەو لەفشارێکی دەروونی بەهێزدا ڕەنج دەبات. ئەم ژنە جوانە دەستەمۆی جۆرێك لەکێشەی دەروونییە کە دەبێت زۆر بەوردی چاودێری بکرێت. ئەگەر ئەو بیەوێت لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بێت، بەداخەوە بەزوویی لەناو دەچێت. ئەو خۆی داوەتە دەستی مەرگ. هەر لەبەر ئەوەیە کەچاو هەڵنابڕێ، دەبێت تامەزرۆی بکەیتەوە بەژیان و کارێك بکەیت کە نوێنەکەی جێ بهێڵێ. سامۆئیل گوتی:

دکتۆر تا ئێستا چل و هەشت کاتژمێرە دەمی بۆ خواردن نەبردوە، ئەو نایەوێت و بەنیاز نییە شتێك بخوات. پزیشك گوتی:

هێشتا مەترسییەك لەئارادا نییە، بەڵام هەروەك گوتم ئەگەر ئەو بیەوێت هەرگیز چاو هەڵنەبڕیت و مان لەخواردن بگرێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەمرێت. سامۆئیل پزیشکەکەی بەڕێ کردو جارێکی تر لەلای نوێنەکەی منەوە دانیشت و دەستمی لەناو دەستی نا. فرمێسکە گەرمەکانی تکانە سەر دەستم و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

شەهرزادەکەم! چاوەکانت هەڵبڕە! ئەگەر تۆ بتەوێت چاو لەجوانییەکانی دونیا دابخەیت، دەبێت منیش لەگەڵ خۆتدا بەریت. من لەپاش تۆ دنیام ناوێت! شەهرزاد خۆشەویستەکەم من بەهەڵەدا چووم و حەق بەتۆ بوو، لەدنیادا ئەو شتەی کە ناکرێت،

عەشقە. تۆ عاشقی مامۆستای هەر بەو جۆرەی کە من عاشقی تۆم، تۆ کیژێکی کامەرانیت و مامۆستاش لەمن بەختیارترە کە تۆی هەیە. چاوەکانت بکەرەوەو پێبکەنە بۆ ژیان، بەڵێن دەدەم بتگەڕێنمەوە بۆ ئێران بۆ لای مامۆستاکەت! مامۆستا خۆشی دەوێی، ئەو گەلێك لەمن زیاتر خۆشی دەوێی. ئەو جەستەی تۆی نەدەویست، ئەو لەتۆدا بەدوای ڕەوشتی جواندا دەگەڕاو عاشقی ئەوانە بوو. عەشقی ئەو دوور بوو لەئارەزوو. ئەو لاشەتی نەدەویست و ڕۆحی پاك و بێگەردو هەستیاری تۆی دەویست. مامۆستا بێ ئەوەی کە بێتە مەیدانی ململانێوە شکستی پێ هێنام! من لەبەرامبەر عەشقی تۆ و مامۆستادا خۆم بەهیچ دەبینم. ئازیزەکەم گوێت لەقسەکانمە؟ من شکستم خوارد و تۆ دەبەمەوە بۆ ئێران. ئەگەر گوێت لەقسەکانم بووە دەستم بگوشە. من وای بۆ دەچووم کە قسەکانی سامۆئیل لەجیهانی وڕێنەدا دەبیستم، بەڵام نەمدەتوانی کاردانەوەیەك لەخۆم نیشان بدەم. بێتوانایی هێندە بوونمی داگرتبوو وەك بڵێی لەحاڵەتی بێ هێزییدا دەست و پێم دەهاویشت. لەدڵی خۆمدا دەمگوت مامۆستام خۆش دەوێ و بەعەشقی ئەوەوە لەدنیا دەردەچم و لەو دنیا هیچ کەسێك ناتوانێت لەیەکتر جیامان بکاتەوە. نە باوك و دایکم و نە سامۆئیل. ئێمە هەردووکمان لەوێدا ئاسودەو ئارام بەردەوامی بەژیانی خۆمان دەدەین. لەو دونیا تەفرەدان نییە. دوڕوویی نییە. درۆو فریودان نییە، ئێمە لەوێدا ئەزموونی عەشق دەکەین و ژیانێکی هەتا هەتایی بەسەر دەبەین. لەوێدا حەسار نییە و هیچ پیاوێك بەئەسپەکەی چاودێریم ناکات، ورتە ورتم کرد:

مامۆستا! لەگەڵ مندا وەرە لێرەدا چاوم لەڕێگەیە. تۆ لەو دنیا دڵنیا دەبیت کە من چەندە خۆشم دەوێی. ئاه.. چەندە کامەران دەبین. کامەران! کامەران! ئەو ئەندێشەیە بزەی خستە سەر لێوەکانم و لەو ساتەدا هەستم کرد کە کەسێك دەڵێت من تۆ دەبەمەوە بۆ ئێران. تکات لێدەکەم چاوەکانت بکەرەوە! لەپڕ هەستم بەشادی کردو خوێن لەدەمارەکانمدا جمین. هەوڵمدا پێبکەنم، بەڵام توانام نەبوو. هەموو توانای خۆم بەکارهێنا، هەستم کرد دەتوانم پێبکەنم، دەستێك بەتوندی دەستی گوشیم و گەرمی لێوێکم لەسەر دەستم هەست پێ کرد. کاتێکم چاوم کردەوە یەکەم شتێك کە بینیم چاوە

پڕ لەناوو سوورەوەبوەکانی سامۆئیل بوو، گەلێك هەستم بەبرسێتی دەکرد، بەدەنگێك که زیاتر لەچپە دەچوو، گوتم:

برسیمە. سامۆئیل بەخۆشحاڵی لەجێگاکەی دەرپەڕی و هاواری کرد. شەهرزادەکەی من برسییەتی خواردنی بۆ بهێنن! شوربایەکیان بۆ هێنام بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە خواردم و دواجار چوومە خەوێکی قوڵەوە. رۆژی دواتر که چاوم کردەوە و لەدەربڕینی خۆشحاڵی خزمەتکارەکان که هاتبوون بۆ سەردانم، بەسەر وەڵامم دانەوە. دوانیوەڕۆ بەیارمەتی جەمیلەو سامۆئیل لەجێگاکەم هاتمە خوارەوەو لەژوورەکەدا کەمێك پیاسەم کرد. جارێکی تر گەڕامەوە بۆ سەر جێگاکەم. هەر کاتێك سامۆئیل ناوی ئێرانی بەزماندا دەهات جۆش و خرۆش لەمندا دەژیایەوە ئومێدەوار دەبوومەوە بەژیان.

سامۆئیل هەستی کردبوو که ئەگەر من هیوادار نەکاتەوە بەژیان بۆ هەمیشە لەدەستم دەدا. لەکاتێکدا که پێکەوە لەکەناری دەریای سپیدا پیاسەمان دەکرد. ئەو جۆش و خرۆشەی جاران زیاتر لەروخسار و هەڵسوکەوتمدا بەدەر دەکەوت. هەر چەند بەرەو چاکبوونەوە دەچووم، زیاتر خەم و خەفەت باڵی بەسەر سامۆئیلدا دەکێشاو بیری لەوە دەکردەوە که ناچارە تاکە عەشقی ژیانی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ئێران و ئەمەش لەهەموو شتێك زیاتر ئازاری دەدا. ئەو عەشقی کیژانێکی زۆری بەپارە کڕی بوو، ئەوانە هەر کامێکیان بۆ ماوەیەك توانیبویان سەرگەرمی بکەن، بەڵام هیچ کامێکیان بەو جۆرە که من توانیبووم لەدڵی ئەودا جێگای خۆم بکەمەوە، نەیانتوانیبوو یاری بەدڵی بکەن. ئەو لە بەر خۆیەوە دانی پێدادەنا ئەو عەشقەی بەرامبەرم هەیەتی عەشقێکی بەتین‌وحەقیقەتە و دوورە لەساختەوە. ئەو لەرێگایەك که بۆ رامکردنی من کەڵکی وەرگرتبوو پەشیمان بوو چەندین بەڵگەی دەهێنایەوە که ئەگەر بەجۆرێکی تر قسەی لەبارەی هەستیەوە بکردبا لەوانە بوو بیتوانیبا شوێنێك بۆخۆی لە دڵمدا بگرێت. من کچێك نەبووم که بتوانێت بەباق و بریقی ئەڵماس دڵی لێ بکرێت. باڵندەیەکی ئازاد بووم که بەدوای جووتەکەی خۆیدا دەگەڕێ و لەقەفەسی ئاڵتونیدا دەمرێت، بەڵام ناوی مەرگ گیانی سامۆئیلی دەهێنایە لەرزین و هەستی بەو ساردییە دەکرد. چونکە ئەو لە دوایین ساڵدا چەندەهاجار ئەو

ساردییەی چەشتبوو، هەر کاتێك سەردانی نەخۆشخانەی دەکرد و خۆی بەدەستی پزیشکەکان دەسپارد تاکوو لەجێگای خوێنی توشبووی بەشێرپەنجە، خوێنی پاکی نێیکەن، سێبەرە شوومەکانی مەرگی بینی بوو، لەو ساتانەدا هیچ شتێك بەلایەوە لەوە خۆشتر نەبوو کە بتوانێت جارێکی تر چاوی بەڕووی دنیادا بکاتەوەو هەمدیسان جوانیەکانی دنیا ببینێت. جگە لەخۆی و میکائیل هیچ کەسێکی تر ئاگای لەم نەخۆشییەی نەبوو. هەرکاتێك دەرۆشت بۆگۆڕینی خوێنەکەی، دەکەوتە خەیاڵ و ئەندێشەوە کە ئەگەر بۆ هەمیشە چاودا بخات، هاوسەرەکەی دوای ئەو چی دەکات؟ حەزی دەکرد پشتیوانێکی هەبێ و کەسێك خەمخواری بێت. بەباشی دەیزانی کە هیچ عەشقێك لەنێوان خۆی و "ئایدین"دا بوونی نییە. چەندە لەسیاسەت بێزار بوو. لەدڵەوە نەفرەتی لەچینی سیاسی و سەرمایەداری دەکرد. لەبەکارهێنانی واژەگەلی وەك "پێویست و ئەبێ"، ئیتر خەریك بوو تێکدەچوو. هەموو ژیانی لەرێگای "داواو پێویستی و دەبێت"ەوە بەفێرێ دابوو، قسەکانی باوکی دەهاتەوە یاد کە گوتبووی هەلومەرج وا دەخوازێت کە تۆ لەگەڵ ئایدیندا زەماوەند بکەیت و "پێویستە" کە سەرمایەکانی ئەوان لەگەڵ ئێمەدا تێکەڵ ببن، تۆ چ ڕازی بیت و چ ناڕازی "دەبێت" بەم بەیەك گەیشتنە رازی بیت. باسی قازانج و سەرمایەیە نەك عەشق و سۆز! ئەو ناچار کرابوو بەو کارە، لەکاتێکدا کە دڵی، رۆحی لەنێران بارمتەی عەشقی کیژێك بوو کە هەستی لەگەڵ کیژەکانی تردا جیاوازبوو. وای بۆدەچوو دەتوانێت ئەو بەدەست بهێنێت و دوور لەسیاسەت و قازانج و سەرمایە لەگەڵ ئەودا ژیان بکات. چەندین شەو بەو هیوایەوە خەو بردبوویەوە و بەرگەی ئەم ئازارەی گرتبوو، لەوکاتەوەی خۆی ناسیبوو هەمیشە بەدوای باوکیەوە بوو کە هۆگری پووڵ و پارە و چەکی بانکی کردبوو، تێی گەیاندبوو کە ژیان بەگشتی بریتیە لەبەدەستهێنانی پارە و دەسەڵات. بەڵام ئێستا ئەو لەهەرەتی لاویدا نەخۆشی بەرۆکی گرتووە، کە نە پارە دەیتوانی کارێکی بۆ بکات و نەدەسەڵات. حەزی دەکرد بیتوانیبا هاواری بکات و خۆی لەو کۆت و بەندە ڕزگار بکات. ئارەزووی دەکرد

کەسێکی تر بوایە، وەك ئیبراهیم، پیاوێکی جەستە بەهێز و چالاك کە سەرکەشترین ئەسپی رام دەکرد. بەخۆی گوت:

ئیبراهیم لەمن چالاکترە، بریا هێزو توانای ئەوم هەبوایە و بمتوانیبا ئەم کیژە سەرکەشە رام بکەم. سەیرێکی دەستە رەق و تەقەکانی خۆی کردو زەردەخەنەیەکی خەماوی کەوتە سەر لێوەکانی. سامونیل ئەو رۆژە ناچار بوو جارێکی تر بۆ گۆڕینی خوێنەکەی بەرێکەوێت. چەند ساتێك وەستا و چاوی لەلەنگەرگرتنی کەشتیە بازرگانیەکان بڕی و لەخۆیەوە گوتی:

سادە گەوهەرێکی بێ وێنەیە کە دەبێت پارێزراو بێت! سادەش هەر بەو جۆرەی کە زەردەخەنەیەکی خەماوی کەوتە سەر لێوەکانی گوتی:

بێگومان. چەند رۆژێك دواتر هەستم بەو روانین و هەڵسوکەوتانەی سامۆئیل کرد و تێگەیشتم کە بەچ هۆیەکەوە بیرکردنەوەکانی هەمیشە ئازاری دەدەن.

لەسەر مێزی نانی بەیانی ئاگاداری رەنگە پەڕیوەکەی سامۆئیل بووم و پرسیم:

حاڵت باشە؟ ئەو هەوڵیدا ئازارەکەی بەدەمامکی خەندە دابپۆشێت و گوتی:

خراپ نییە، بەڵام ئەم سەفەرانە ماندووی کردووم، پڕ بەدڵ حەز دەکەم هیچ کاتێك نەچم بۆ سەفەر و بتوانم هەموو ساتێك لەڕوخسارە جوانەکەی تۆ بڕوانم. کاتێك لەتەنیشتی تۆ دام خۆم بەبەختەوەر دەزانم. بەتوانجەوە گوتم:

بەڵام تۆ پیاوێکی بەختەوەریت و بەبێ منیش بەختەوەریت لەگەڵدایە. تۆ هەموو شتێکت هەیە، سامان، دەستەڵات و هاوسەرێك کە خۆشی دەوێی. ئیتر چیت دەوێ؟

سامۆئیل ئاهێکی هەڵکێشا و دەیویست شتێك بڵێ کە مکائیل لێمان نزیك بویەوەو سامۆئیلی ئاگادار کرد کە فڕۆکە ئامادەیە بۆ فڕین. سامۆئیل بەبێ ئەوەی دەست بۆ نانەکەی بەرێت، هەستایەوەو گوتی:

ئازیزەکەم ببەخشە لەوەی کە ناچارم جارێکی تر جێت بهێڵم، بەڵام بەڵێنت پێدەدەم کاتێك گەڕامەوە لەبارەی گەڕانەوەی تۆوە بۆ ئێران دابنیشین و گفتوگۆ بکەین. منیش هەستامەوەو بەشێوەیەك کە پیاوە ئەسپ سوارەکە گوێی لێ بێت، گوتم:

تا تۆ دەگەڕێیتەوە منیش دەچم بۆ بینینی شەقامەکانی بەیروت و هیوادارم کەسێك سیخوڕیم بەسەرەوە نەکات!

سوارەکە سەری بەرەو لایەکی تر سوڕاند، وەك ئەوەی گوێبیسی قسەکەی من نەبووە. ساموئیل دەستی خستە سەر شانم و گوتی:

ئەگەر مۆڵەتت بدەم لەکۆشك بچیتە دەرەوە، بەڵێنم پێ دەدەیت کە ڕانەکەیت؟

گوتم:

ئەگەر تۆ ناتەوێت بمبەیتەوە، کەوایە پێویست ناکات هەڵبێم. ساموئیل گوتی:

زۆر باشە، دەتوانی بڕۆیت، بەڵام دەبێت جەمیلەش لەگەڵ خۆت بەری. ئەو بەتەواوی ئاگای لێت دەبێ و دەتوانێت چاوساغێکی باش بێت بۆت. کاتێك ساموئیل دەستی دەگوشیم، بەتاسەوە چاوی لەچاوەکانم بڕی و گوتی:

من دەگەڕێمەوە، چاوەڕوانم بە. لەو ساتەدا لەژێر کاریگەریی نیگاکانیدا هەموو شتێکم لەبیر کردو گوتم:

چاوەڕێت دەکەم. کاتێك گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم فرۆکەکەی ئەو بەرز بوبوویەوە. خۆشەویستەکانی ساموئیل هێواش هێواش نەرمیان دەکردم و ببوە هۆی ئەوەی کە ڕق و قینی رابردوو بەدەستی فەرامۆشی بسپێرم. جارجارەش هەستم دەکرد خۆشم دەوێ. مرۆڤ پێویستی بەخۆشەویستی هەیە و میهرەبان دەبێت بەرامبەر بەو کەسەی کە خۆشی دەوێ. هەستی منیش بەو شێوەیەبوو. من لەدڵی خۆمدا جۆرێك لەڕاستیم لەساموئیلدا هەست پێدەکرد، بەباشی دەمزانی کەئەو دەتوانێت هەموو جۆرە فشارێکم بۆ بهێنێت و ناچارم بکات خۆم بە دەستییەوە بدەم، بەڵام ڕەفتاری میهرەبان و دورلەتوندوتیژی ئەو دەیسەلماند کەواهەست بکەم ئەو ساموئیلەی کەلەئێران لەگەڵ من وفریشتەدا بە توندوتیژی هەڵس و کەوتی دەکرد لەگەڵ ئەم ساموئیلەدا یەکێك نین و زۆر لەیەکتریش جیاوازن. جارجار بیرم لەوەدەکردەوە کە ئەگەر عاشقی مامۆستا نەبوایەم، دەمتوانی هەموو خۆشەویستی خۆم پێشکەش بە ساموئیل بکەمو خۆشم بوێ. ساموئیل لە"بەیروت" پیاوێك بوو لەسەرخۆو میهرەبان و خۆشەویست. ژێردەستەکانی خۆشیان

دەویست بۆ پارێزکردنی ئەو ئامادەبوون هەموو کارێك بکەن. مکائیل پیاوە ئەسپسوارەکە هەتا ئامادەبوو بۆ کامەرانی ساموئیل خۆی فڕێ بداتە دەریاوە و هەستم کرد هەتا ئامادەیە بە ئیشارەیەکی ساموئیل لەناوم ببات. چاوە تیژەکانی مکائیل هەتا ئەوکاتانەیشی کەچاودێری نەدەکردم دەستبەردارم نەدەبوو. ئەو هەروەك سەگی ڕاو لەدوورەوە چاوی تێدەبڕیم و بچوکترین هەڵس و کەوتمی کۆنترۆڵ دەکرد.

پاش ڕۆشتنی ساموئیل منوجەمیلە بەئازادی لەکۆشك چوینەدەرەوە بۆ گەڕان. بەیروت بەهۆی جوگرافی ناوچەکەیەوە، بەندەرێکی ئازادبووکە نرخ و بەهای تایبەتی هەبوو. من و جەمیلە چونکە زمانی یەکتریمان نەدەزانی، پێکەوە هەنگاومان دەناو ئەو بەگرتنی دەستم منی بۆهەر خاڵێك ڕێنمونی دەکرد کەحەزی پێدەکرد. ئەو شەوو ڕۆژە من وجەمیلە لەدەرەوەی کۆشك کاتمان بەسەربرد و بەگوێرەی ئارەزووەکانمان ژیاین. کاتێك گەڕاینەوە هەموو دانیشتوانی کۆشك لەخەودابوون. کاتێك جەمیلە بۆ سەر جێگاکەم ئامادەی دەکردم و نیازی چونەوە دەرەوەی هەبوو بانگم کردوو گوتم:

جەمیلە؟ بەرەولام گەڕایەوە و سەیرێکی کردم. بەپەنجە ئیشارەم بەخۆم و ئەوکردووگوتم:

حبیب؟ پێکەنی و دەستی گوشیم و خستییە سەر ڕوخساری و گوتی:

حبیب. دواجار ژوورەکەی جێهێشتم. من لەساموئیلم بیستبوو کە وشەی دۆست بە عەرەبی "حبیب"ە ولەو ڕێگایەوە لەکۆشکدا دۆستێکم بۆخۆم چنگ کەوتبوو. لەدڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە ڕەنگەبتوانم بەهۆی جەمیلەوە نامەیەك بۆ دایك و باوکم بنێرمو تەمی نیگەرانییان بڕەوێنمەوە. پەیوەندی تەلەفۆنی بەهیچ شێوەیەك نەدەلوا، چونکە تەلەفۆنەکان کۆنترۆڵ کرابون و ڕێگایەکی تریشم شك نەدەبرد.

بەیانی ئەو ڕۆژەیش لەگەڵ جەمیلەدا چوبوین بۆ گەڕان و دیارییەکیشم بۆکڕیبوو. بەئاشکرا دەمبینی کە خۆشحاڵە وزیاتر لێم نزیك دەبویەوە، حەزم نەدەکرد ئەو بکەمە وەسیلەیەك بۆ بەئامانج گەیشتنم، بەڵام لەو هەلومەرجەدە چارەیەکی ترم نەبوو. دەترسام کە ساموئیل بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکات و هەربەو جۆرە لەوێدا دەستبەسەرم

بکات. ئەگەروابوومن دەمتوانی لە خۆشەویستی و دۆستایەتی جەمیلە کەڵك وەرگرم و ڕێگای هەڵاتن بۆخۆم بدۆزمەوە.

ڕۆژێکی تر لەگەڵ جەمیلەدا بەمەبەستی گەڕان لەسەر دەریا سواری بەلەمی گەشت و گوزاری ساموئیل بوین. میکائیل ڕێنوێنییەکەی گرتە ئەستۆ. من و جەمیلە لەسەرتەختی بەلەمەکە خۆماندابەخۆروو چێژمان لەهەوای سازگار وەرگرت. لەتەواوی درێژی ڕێگادا میکایل بێدەنگ بوو چاوی لە خاڵی بەرامبەری بریبوو. دەنگی گۆرانیبێژێکی عەرەب لە ئامێری بڵاوکەرەوەی بەلەمەکەوە بەرگوێ دەکەت کە هەتا بۆمنیش کە زمانی عەرەبیم نەدەزانی و دەرکم بە مانای شیعرەکەی نەدەکرد، خۆش و دڵگیربوو. ئێمە ئەو ڕۆژە چەند کاتژمێرێك پێکەوەبوین، بەڵام میکائیل هەتا بۆجارێکیش ورتەی لەزار دەرنەهات و قسەی لەگەڵ جەمیلەشدا نەکرد. لەکاتێکدا کە گەشتینە کەناری دەریا گفتوگۆیەك لەنێوان مکائیل وجەمیلەدا ڕویدا کەمن هەستم بەناوەرۆکەکەی نەکرد، بەڵام بینیم جەمیلە لێم دوورکەوتەوە و ڕێگای کۆشکی گرتەبەر، ویستم دوای بکەوم ، میکائیل گوتی:

تۆ بمێنەرەوە! شێوەی فەرمانکردنەکەی لەجێگای خۆم وشکی کردم ونەمتوانی هەنگاوێك بنێم. کاتێك جەمیلە لێمان دوورکەوتەوە، میکائیل گوتی:

دەمەوێت لەگەڵتدا بدوێم. لەو ترسابووم هەربۆیە بەشڵەژاوییەوە گوتم:

بۆچی لێردا؟ دەتوانین لە کۆشکدا پێکەوە گفتوگۆبکەین؟ بەهێواشی گوتی:

نامەوێت دانیشتوانی کۆشك ئێمە لەکاتی گفتوگۆدابیبینن. بابەتێکی گرنگ هەیە کە تۆ دەبێت لێی بەئاگابیت! ئەوەی گوت و بەرەولای بارخانەکە کەوتەڕێ. بێئاگا بەدوایدا هەنگاومنا. سەرم سوڕما کەئەو دەیەوێت چ بابەتێکی گرنگم پێبڵێ و نایەوێت هیچ کەسێك پێکەوە بمانبینێت. هەنگاوەکانی کورتکردەوە تاکو لەگەڵ مندا لەئاستێکدا بوەستێت. گێژو سەرلێشێواوبووم. من هیچ کاتێك خۆشم لەو نەدەهات و لەناخەوە هەستم بەترسێکی زۆردەکرد لێی. لەهەڵس و کەوتیدا جۆرێك لە توندوتیژی هەبوو کەبێئەوەی ئاشکرای بکات بەڕوونی دەردەکەوت، چاوە بچوك و بێ تروسکەکانی و

ڕوخسارە وشك هەڵاتووە هەڵقرچاوەکەی شکڵێکی ترسناکی تێدا دروستکردبوو، هەرگیز خەندەیەکم لەسەر لێوەکانی نەدیبوو. بەجۆرێك لەدەوروبەر ورد دەبویەوە وەك بڵێی چاودێریمان دەکەن و دەیانەوێت بمانخەنە داوەوە. من لەو ڕاڕاییەی کەلەکاتی ڕێگەکردندا لەخۆی نیشان دەدا، هەم پێکەنینم دەهات و هەم ترسم لێنیشتبوو.

"١٨"

**من** لەگەڵیدا دەڕۆشتم و ئەو منی لەگەڵ خۆیدا دەبرد و نەمدەزانی بەرەو کوێ دەچین. گەشتینە پشتی بارخانەکەو ئەو دەرگای ئەمبارێکی گەورەی کردەوە و چوینە ژورەوە. چرایەکی کز دەوروبەری ڕوناك کردبوو. لە ڕۆشنایی تروسکەی چراکەدا چاوم بە چەندین سندوق کەوت کە لەسەریەك هەڵچنرابوون. میکائیل دەرگای ژورێکی بچوکی کردەوە و کاتێك کلیلەکە برسکایەوە تێگەیشتم کە دەفتەرێك هەیە و لەگەڵ مێزێك و چەند کورسییەك و تەلەفۆنێك. هەردوکمان دانیشتین و من چاوەڕێبووم تاکو میکائیل زار بۆقسە هەڵبچرێت. ئەو جگەرەیەکی داگیرساندو من بۆیەکەمینجار ترسم لەڕوخساریدا بینی. دەستەکانی دەلەرزین و کاتێك دەستی بەقسانکرد، لەرزینی دەنگی ترسەکەیان ئاشکرادەکرد، میکائیل گوتی:

من لە ژیانمدا چەندین کاری ناپەسەندم ئەنجامداوە، بەڵام هەرگیز دەستم بە خوێنی کەسێك سوور نەبووە. خەریکبوو لەترساندا زراوم بچێت، بەترسەوە پرسیم:

تۆ دەتەوێت بمکوژیت؟ مژێکی قوڵی لەجگەرەکەیدا و گوتی:

نازانم! ئەگەر ناچاربووم دەتکوژم. گوتم:

بۆچی دەتەوێت لەناوم ببەیت لەکاتێکدا کەمن گوناهێکم نەکردووە. چاوەکانی بڕییە ڕوخسارم و بە گاڵتە پێکردنەوە گوتی:

گوناهێکت نەکردووە؟ چ گوناهێك لەوە گەورەترە کەتۆ دەتەوێت ساموئیل لەناو ببەیت! گوتم:

من هۆی لەناو بردنی سامونێل نیم. سەری ڕاوەشاندو نەیهێشت بەردەوام بم وگوتی:

تۆ هەر ڕۆژەی هەنگاوێك ئەو لەنەبوون نزیکتر دەکەیتەوە، و ئەو ڕۆژی هەنگاوێك زیاتر لەژیان دووری دەگرێت. گوتم:

من نازانم کە بە چ شێوەیەك بومەتە هۆی ئەوەی ئەو لەمەرگ نزیك بێتەوە، لەکاتێکدا کەمن بەندکراوی ئەوم و ئەو لە حاڵی لەناوبردنی مندایە، بەتەوسەوە پێکەنینێکی کردو گوتی:

ئەو تۆی لەگیانی شیرینی خۆی زیاتر خۆش دەوێ. تۆ تەنها ژنێکی کەلەبەرامبەریدا خۆڕاگریتکردووە. ئەو پیاوی ململانێیە و لە ململانێدا چێژ دەبینێت. سامونێل بەها بۆئەو شتانە دانانێت کەبەئاسانی و بێ تێکۆشان بەدەستی دەهێنێت، ئەوکە بۆبەدەستخستی هەرشتێك هەوڵ دەدات. ئەوانەی کە بەزوویی خۆبەدەستەوە دەدەن، زووش لە مەیدان دوور دەکەونەوە، تۆئەگەر دەست لە ململانێ هەڵبگریت وەك ئەوانی تر وەلاوەتدەنێ و ئامادە دەبێت لە نەخۆشخانەدا بخەوێت! لەبیستنی دەستەواژەی "خەوتن لە نەخۆشخانە" زارم لە سەرسوڕماندا هەڵبچڕی و پرسیم:

خەوتن؟ بۆچی سامونێل دەبێت لە نەخۆشخانەدا بخەوێت؟ جگەرەیەکی تری داگیرساندو گوتی:

بابەتێکی گرنگ کەدەمەوێت پێتی بڵێم ئەمەیە. سامونێل بەدەست نەخۆشییەکی نادیارەوە ئازار دەچێژێت و دەبێت چەند زووترە لەژێر چاودێری تایبەتی پزیشکدابێت. لەساڵی ڕابردوودا کە بەم نەخۆشییەوە گیرۆدەبوو هەر چەند ڕۆژ جارێك دەڕۆشت و خوێنی خۆی دەگۆڕی، بەڵام هێشتا نەخۆشییەکە کۆڵی لێنەداوە. پزیشکەکان باوەڕیان وایە کە دەبێت لەنەخۆشخانەدا بخەوێت تابتوانن چارەسەرێکی پێویستی بۆبکەن. بەڵام ئەو لەبەر تۆ ئامادە نییە ئەم کارەبکات، ئەو هێندە تۆی خۆشدەوێت کە حەزناکات هەتا بۆ ساتێکیش لێت دوور بکەوێتەوە. ئەگەرتۆ نەچوبایتە نێو ژیانییەوە و ئەگەر وەك کیژەکانی تر بەچەند چارچە ئەڵماسێك لەژیانی ئەو وازت بهێنابا ئەو هێندە ئەم دەردو ئازارەی نەدەبینی. من بڕیارم داوە کارەکە تەواو بکەم! کاتێك سامونێل لەتۆ نائومێدبوو

بەژیان و گیانی خۆی پەیوەندیدار دەبێت. بەلام تانەوکاتەی تۆهەبیت ئەم کارە سەرناگرێت. پرسیم:

ئایا واهەست دەکەیت بە لەناو بردنی من ساموئیل چاک دەبێتەوە؟ تۆ کە دانی پێدادەنێیت ئەو لەساڵی ڕابردووەوە دوچاری ئەم نەخۆشییە بووە ئایاواهەست ناکەیت کە ئەو نەخۆشییە نادیارە دەیتوانی هەر لەو ڕۆژانەدا لەناوی ببات، بەلام عەشق و وابەستەیی ساموئیل بەمنەوە بەربەست بوو لەڕێی ئەمەدا؟ ساموئیل هەموو شتێکی هەیەو بەقسەی تۆ کیژانێکی زۆر لەژیانیدا هەن، بەلام ئەو منی لەنێوان ئەوانەدا هەڵبژاردووە و دڵی بەمن داوە ئەگەر بزانێت منیش لەناو چووم ئیتر هیوایەک لەژیانی ئەودا نامێنێت و ئەویش لەناو دەچێت. ئەگەر دەیبینی ساموئیل لەگەڵ ئەو ئازارو نەخۆشییەیدا کە جەستەی داگیر کردووە و هێشتا ڕێگە دەکات و پێدەکەنێ، بەو هۆیەوەیە کە دەیەوێت لەم ململانێیەشدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. من هێزی بزوێنەری ساموئیلم! ئەگەر لێ گەڕێی بگەڕێمەوە، کارێک دەکەم کەڕازی بێ و لەنەخۆشخانەدا بخەوێت. بەلام دڵنیابە بە لەناو بردنی من ئەویش لەناو دەبەیت! ئەگەر ئەوەت دەوێت من بکوژە! ساموئیل کاتێک منی کوشت کەلە خێزانەکەم دووری خستمەوە! تۆ وای بۆدەچی من ڕازیم کە بەم شێوەیە بژیم؟ مردن لەم ژیانەم باشترە . میکائیل جارێکی تر چاوی لەچاوەکانم بڕی و گوتی:

ئەگەر ساموئیل بزانێت کە من نهێنی نەخۆشییەکەیم درکاندووە دەمکوژێت! من لەمردن ناترسم، بەلام حەزناکەم ساموئیل واهەست بکات خیانەتم لێ کردووە. گوتم:

لەمەبەستت تێدەگەم ئێمە دەتوانین باوەڕمان بەیەکتر هەبێت. من ساموئیل ڕازی دەکەم کە لەنەخۆشخانەدا بخەوێت، بەبێ ئەوەی باسی تۆبکەم. گوتی:

ڕازیم، بەلام ئەوەبزانە کە ئەگەر بتەوێت زیاد لەمە یاری بەژیانی ساموئیل بکەیت دەتکوژم. هەردووکمان بارخانەکەمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە بۆ ناو کۆشک. بەماندوویی چوومە سەر نوێنەکەم و بیرم لە چارەنوسی شوومی خۆم دەکردە. من ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بومایە ساموئیلم لەناو دەبردوو بە مردنی ئەویش خۆم بەدەستی میکایل بەکوشت دەدا. ئەگەر دەستم لە ململانێ هەڵبگرتایەو خۆم بدایەتە دەستی

ساموئیل ئیتر رووی گەڕانەوەم بۆ ئێران نەدەبوو. نەمدەزانی چ قەدەرێك لە لوبناندا چاوەڕێمە بەو قسانەدا کەلەساموئیلم بیستبوو هەستم کرد ساموئیل هیچ کاتێك نام باتەوە بۆئێران، لە نێوانی مەرگ و ژیاندا بووم و دواجار بەوئەنجامەگەیشتم کە هەردووکیان بۆمن نیشانەی لەناوچوونە. ئەو شەوە تاکو بەیانی نەنوستم. هیچ کەسێکم نەبوو تاکو دەردەدڵی لابکەم و داوای ڕێنمایی لێ بکەم. کاتێك هیلاك و ماندوو چاوم دادەخست خەونی ئاڵۆزوناخۆش بەرۆکیان دەگرتم. دەمبینی کە ساموێل مردووە و میکائیل خەریکە دەمکوژێت و من بۆئەوەی خۆم لەچنگی ڕزگاربکەم هەڵدەهاتم، بەڵام بەرەو هەرلایەك دەچووم دەرگاکان داخرابوون و میکائیل بە شمشێرێکی تیژەوە دەردەکەوت. کاتێك بە پەشۆکاوی چاوم دەکردەوە هەناسەیەکی ئارامم هەڵدەکێشا، بەڵام لە ڕاستشدا من لەگەڵ بکوژەکەمدا دەژیام و هەموو ڕۆژێك و هەموو کاتژمێرێك لەگەڵیدا ڕووبەڕوو دەبومەوە. ئێستا ئیتر کاتێك کەمیکائیل سەیری دەکردم زەردەخەنەیەکی بێزارکەر لەسەر لێوەکانی نەقشی دەبەست. ئەو چاوەڕوانی هەنگاوی من بوو، دەیویست ببینێت کەمن چۆنچۆنی ساموئیل ڕازی دەکەم لەنەخۆشخانەدا بخەوێت. من بەدوای هەلێکدا دەگەڕام تاکو بەبێ ئەوەی کە ساموئیل ئاگاداربێت و ڕازی بکەم و هەنگاو بۆهەڵاتن بنێم. دووڕۆژبوو کە ساموئیل کۆشکی جێهێشتبوو من و میکائیل دەمانزانی لەکوێیە. بەردەوام ئەو مانگی جارێك دەڕۆشت بۆگۆڕینی خوێنەکەی و سەفەرەکانی تری بۆ کاری بازرگانی بوون . میکائیل ئارەزووی لە بەیروت نەبوو، بەڵام لەبەر ساموئیل زاری خۆی بەستبوو ناڕەزایەتی دەرنەدەبڕی. ئەو کە بەردەوام هاوڕێ و هاوسەفەری ساموئیل بوو لەبەر پارێزگاری و چاودێری من ناچاریبوو زۆربەی ساتەکانی لەکۆشك بەسەر بەرێت و چاودێریم بکات. ئەو ماندوێتی و بێئەزموونی لەوکارەدا بەهاوار بەسەر خزمەتکارەکانداخاڵی دەکردەوە و هەموو دانیشتوانی کۆشکیش لێی دەترسان و سڵیان لێدەکرد. من لەبەر ئەوەی کەم لەگەڵ خزمەتکارەکانی کۆشکدا ڕووبەڕوو دەبوومەوە جگە لە جەمیلە، بەڵام هەستمدەکرد کەئەوکاتانەی لەگەڵ ئەواندام هەستبەئارامی دەکەن و بە خەیاڵی ئاسوودەوە خەریکی کاری خۆیان دەبن. من

هەموویانم خۆشدەویست و بەهەر ڕێگایەک کەبمتوانیبا خۆشەویستی خۆمم بۆ دەردەبڕین. پاش ئەوبانگهێشتە کە نێوانی من و میکائیل تێکچوو. ئیتر دەعوەتم نەکردن، بەڵام کاتێک بەدەمیانەوە پێدەکەنیم و دەستەکانیانم دەگوشی، ئەوان هەستیان بەوەکردبوو کە خۆشم دەوێن وڕێزیان لێدەگرم، هەریەکێک لەوانیش خۆشەویستی خۆیان بەجۆرێک کە میکائیل ئاگادار نەبێت بۆمن دەردەبڕی، گوڵێکی بۆنخۆش لەسەر سینی نانخواردنی بەیانی نیشانەی دەربڕینی خۆشەویستی باخەوان و شەربەتی فێنکی نارنجی بەهار لەکاتی پیاسەکردندا، نیشانەی دەربڕینی خۆشەویستی چێشتلێنەر بوو. میکائیل گوێی بەم چەشنە هەڵس و کەوتانە نەدەدا، بەڵام بەلای منەوە دەربڕینی خۆشەویستی ئەوان دەرگایەکبوو بەرەو ئازادی و هەڵاتن لەو ژینگەیە. بەیانی ڕۆژی سێیەم بە نیشتنەوەی فڕۆکە بچوکەکەی ساموئیل، میکائیل کە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆژنامەبوو پەتوندی سەیرێکی کردم و گوتی:

ئەمە دواین فرسەتە! و چوە دەرەوە تاکوبچێت بەپێشوازی ساموئیلەوە. من لەتەنیشت دەرگاکەوە وەستابوم و توانام نەبوو هەنگاوێک بنێم. قسەکانی میکائیل گیانی بەلەرزە خستبووم و دەمزانی کە ئەگەر سەرکەوتوو نەبم تاکو ساموئیل ڕازی بکەم، گیانی خۆم لەدەست دەدەم. ئارەزوومەدەکرد لەو ساتەدا بەسواری فڕۆکەکە خۆم دەرباز بکردایە، لە ڕۆژێکەوە پێم نابووە ئەوێوە چەندینجار ویستبووم کار بەو بیرکردنەوەیەم بکەم، بەڵام بەداخەوە بوونی پاسەوانێکی چەکدار کە چاودێری ئەو شوێنەی دەکرد، دەرفەتی ڕاکردنی نەهێشتبۆوە. ساموئیل دڵشادو دەم بەپێکەنین هاتەژوورەوە و بەرامبەرم وەستا، چەمییەوە و ڕوخساری ماچکردم وپرسی:

شەهزادەکەم ئەمڕۆ حاڵت چۆنە؟ لەخۆوە گریان بینی گرتم و بەئەستەم توانیم بەر بەفرمێسکەکانم بگرم. لە حاڵێکدا کە هەوڵم دەدا پێبکەنم گوتم:

باشم. لەدەنگە لەرزۆکەکەم حەپەساو پرسی:

شتێك ڕویداوە؟ نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە. ڕێگای ژوورەکەمم گرتەبەر و ئەویش لەگەڵمداهات. کاتێك چوومە ژوورەکەمەوە ساموئیل دەرگاکەی داخست و جارێکی تر پرسیارەکەی دووبارەکردەوە. فرمێسکم لەخۆوە بەربوونەوە. لەئامێزی گرتم و گوتی:

تکاتلێدەکەم قسەم لەگەڵدابکە و پێم بڵێ چی ڕویداوە. ئایا میکائیل زویری کردویت؟

دەمتوانی چی بڵێم. ئایا دەبوو بمگوتبا کەئەو ویستی بمکوژێت ولێگەڕابام ساموئیل لەناوی ببات، یاخود درۆبکەم. گوتم:

کاتێك فرۆکەکەتان نیشتەوە ئەوڕۆژەم هاتەوەیاد کە خۆم بۆ یەکەمینجار فرینم تاقی کردەوەو هەر بەو هۆیەوە هەستم بەغەریبی کرد. هەناسەیەکی ئارامی هەڵکێشاو گوتی:

خەیاڵمت ئاسودە کرد! کاتێك لە فرۆکەکە دابەزیم میکائیلم بینی لە دەرگاکەوە بەپرتاو چووەدەرەوە گومانمکرد کە لەنێوانتاندا کێشەیەك ڕویداوە. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەگەر ئەو بوبێتەهۆی ئازاری تۆ بەدەستی خۆم لەناوی دەبەم. لە ئەندێشەی ئەودوانەدا لەناخەوە لەرزیم، یەکێك دەیویست بمکوژێت تاکو هاوەڵەکەی زیندوو بمێنێت و ئەوی تریان دەیویست خۆی لەناو ببات تاکو بژیم. گوتم:

ئەو چاودێرێکی باشەو چیتر دەردیسەریم بۆ دروست ناکات. بەپێچەوانەی ڕابردووەوە کە نەفرەتم لێدەکرد ئێستا ئەو هەستەم بەرامبەری نەماوە. کاتێك تۆ لێرەنیت میکائیل هەوڵدەدات کەرەستەی ئارامیم بۆ دەستەبەر بکات. هەر بەوجۆرەی کە گوتم فرینی تۆ منی خەمبار کردو تەنها ئەوە. دەستی گرتم و بەرەو ڕووی خۆی داینیشاندم و گوتی:

ئەگەر ڕێگات بدەم فرۆکە لێبخوڕیت، لەبەرامبەردا بەڵێنم پێدەدەیت کە بەرەو ڕووم پێبکەنی؟ گوتم:

چۆن دەتوانم باوەڕم بەبەڵێنەکانت هەبێت، لەکاتێکدا کە دەتویست بمبەیتەوە و ئەوکارەت نەکرد. تۆهەرجارێك کەدەڕۆیت بەڵێن دەدەیت کەکاتی گەڕانەوە لەبارەی ڕۆشتنمانەوە بۆئێران بڕیار بدەیت، هیچ جارێکیش لەسەر بەڵێنەکەی خۆت نەبوویت.

ساموئیل چاوەکانی بچوککردەوە و قژەپڕەکەی بۆسەرەوە هەڵدایەوە وگوتی:

ئەی تۆیش بۆچی لەسەر بەڵێنی خۆت سوور نیت؟ تۆ بەڵێنت دا کە پەرستیارم بیت و هەرجارێك کە بێم بۆسەردانت بە پێشوازییەکی گەرم و گوڕەوە لەگەڵمدا ڕووبەڕوو ببیتەوە، بەڵام هەموو جارێك ئەوە من بووم کەهەنگاوم بەرەو پێشەوە ناوە و هاتووم بەپێشوازیتەوە. ئەوە من بووم کە لەحاڵتم پرسیوە و تۆ هەتا بۆ جارێکیش هەنگاوت بەرەو پێشەوە نەناوەو لەحاڵمت نەپرسیوە. گوتم:

چونکە دەزانم لەبارەی حاڵتەوە ڕاستیت پێنەگوتوم. جاری پێشوو کاتێك لەسەر مێزی نانخواردنی بەیانی حاڵم پرسیت و تۆ درۆت لەگەڵکردم واتنیشاندا هیچ تەنگ و چەڵەمەیەکت نییەو لەکاتێکدا کە ڕەنگە پەڕیوەکەت وکەوەبوونەوەی بەر چاوەکانت چیرۆکێکی تری هەیە. کاتێك ئەو ڕۆژە لەبارەی تەندروستیتەوە درۆت لەگەڵکردم لەدڵی خۆمدا بڕیارمدا کە ئیتر حاڵت نەپرسم نەیشم پرسی. ساموئیل لەپاڵ پەنجەرەکەدا وەستا و سەیرێکی دەرەوەی کردوو چووە خەیاڵەوە. لەتەنیشتیدا ڕاوەستام و سەیری زەوییە چیمەنەکەم دەکرد. ئەو پاش چەند خولەکێك بێدەنگی شکاندو گوتی:

ئایا بەڕاستی حاڵی من بەلاتەوە گرنگە و نەخۆشی و تەندروستی من بەلای تۆوە نرخی هەیە؟ گوتم:

لەگەڵ ئەوەدا کەدەزانیت عاشقت نیم، بەڵام دەبێت بڵێم بەڵێ بەلامەوە گرنگە کەتۆ لەش ساغبیت. پرسی:

بۆچی؟ گوتم:

چـــونکە لێـــرەدا تـــۆ تـــەنها کەســـێکی کـــەمن بتـــوانم لەگەڵتـــدا گفتوەگۆبکـــەم و تەنهاکەسێکیشی کە بتوانیت بمبەیتەوە بۆ زێدی خۆم. قاقایەکی کردوو گوتی:

چەندە گەوج بووم کە لەو ساتەدا وام هەستکرد تۆ لەبەر خاتری خۆم بۆ حاڵم نیگەران بوویت. شەهرزادەکەم نیگەران مەبە! ئەگەر من شتێکم بەسەر بێت میکائیل تۆ دەباتەوە بۆئێران. ویستم لێو هەڵبێنمەوە و بڵێم ئەو ویستی من بکوژێت، بەڵام زارم باست و ئیتر هیچم نەگوت. کاتێك ژوورەکەی جێدەهێشتم ساتێك وەستاو گوتی:

ژنان پیاوی نەخۆشیان خۆشدەوێ و ئارەزووش ناکەن بیان بینن. ئەمەی گوت و چووەدەرەوە. لەوساتەدا دڵم بەحاڵی سوتا، بیرمکردەوە کە سامونیل دەترسێت نەخۆشییەکەی ئاشکرابکات، چونکە ترسی هەیە کەهاوسەرەکەی لێی جیاببێتەوە. هەستی دڵسۆزی و خەمخۆری لەمنداجولآو لەوکاتەدا خەیاڵی هەلآتنم وەلاوەنا، لەدڵی خۆمدا پەیمانمدا کەتا کاتێك سامونیل زیندوبێت پەرستیاری لەئەستۆبگرم و بەو مەبەستە لەژوورەکەم چومەدەرەوە و گەڕام بەدوایدا. ئەو لەژوورەکەیدا لەسەر تەختەکەی ڕاکشابوو. کاتێك چوومەژورەوە سەری سوڕماو پرسی:

کارێکت هەیە؟ گوتم:

هاتووم لەگەڵتدا گفتوگۆبکەم. هاتووم تاپێت بڵێم تەنها لەبەر خاتری خۆم نییە کە نیگەرانی حاڵی تۆم، بەڵکو بەڕاستی لەبەر تۆیشە نیگەرانم و ئەگەر خەم بۆ نەخۆشی دەخۆیت حەزدەکەم بزانم و بۆچارەسەرت هەنگاو بنێم. وەك بروسکە لەجێگاکەی هاتەخوارەوە و بەرامبەرم وەستاو گوتی:

بۆچی وادەست دەکەیت من نەخۆشم؟ کێ پێی گوتویت؟ قسەبکە. شانەکانی گرتبوم و ڕایدەوەشاندم. گوتم:

هیچ کەس! باوەڕبکە. من لەخۆمەوەگومانم کرد کە نەخۆشی. تۆئەو سامونیلەنیت کەدەهات بۆ ئێران، تۆ ڕۆژبەڕۆژ لاوازتر دەبی و ڕەنگ بەڕووتەوە نامێنێت. ناتوانیت ئەوانە بشاریتەوە. شانی بەردام و دووبارە لەسەر تەختەکەی ڕاکشایەوە و چاوی لەسەقفەکە بری. لەلای دانیشتم و گوتم:

ڕۆژێك بانگەشەی ئەوەت دەرکرد کەمنت لەگیانی خۆت خۆشتردەوێ. ئەگەر وابێت ڕاستییەکەم پێبڵێ. ئاهێکی کێشاو گوتی:

قسەکانم تەنها بانگەشەیەکی ڕووت نەبوون من ئێستاش تۆم لەگیانم خۆشتر دەوێ، بەڵام تاکاتێك کە لەو ململانێیەدا سەرنەکەوم هیچ شتێك ناڵێم. گوتم:

ئەگەر من دانی پێدابنێم شکستم خواردووە و تۆ بەسەرمدا سەرکەوتوویت ئایا ئەوکاتە دەیدرکێنیت؟ کەوتەسەر ئەولایەی کەڕووبەڕوی من بوو گوتی:

یانی دەتەوێت خۆت بەدەستەوە بدەیت؟ بە جولاندنی سەرم جەختم لەسەر قسەکەی کردەوە و گوتم:

ئەوکارە دەکەم. گوتی:

بەلام تۆ چەند خولەکێك لەمەو پێش گوتت کەهێشتا عەشقت بەرامبەرم نییە. گوتم:

بەلێ من عاشقی تۆنیم، بەلام ئامادەم خۆم بەدەستەوە بدەم. گوتی:

بۆچی دەتەوێت ئەوەبکەیت؟ گوتم:

چونکە ئیتر ماندوو بووم و دەمەوێت بگەڕێمەوە. چونکە دەمەوێت تۆلەم ئازاری ناخۆشییە ڕزگار بکەم. چونکە دەمەوێت...گریان مۆلەتی نەدام و بەدەنگی بەرز گریام.

لەنێوان گریانەکەمدا گوتم:

ئەگەر تۆمنت نەهێنا بۆ ئێرە تاکو خۆم بەدەستەوە بدەم؟ ئێستادەمەوێت وابکەم!

هەستایەوە و سەری لەئامێزگرتم و گوتی:

لەو چەند ڕۆژەدا کەمن لێرە نەبووم ڕوداوێك لەکۆشکدا ڕویداوە و ناتەوێت ئاشکرای بکەیت، بەلام من گێل نیم! کەسێك شتێکی بەتۆ گوتووەکە لەناکاو بیرو باوەڕتی گۆڕیوە و من تاکو ئەوە ئاشکرانەکەم ناحەوێمەوە! ئەوەی گوت و بە پڕتاو ژوورەکەی بەجێهێشتو منیش بەدوایداچووم، بەلام ئەو بەخێرایی لەدەرگاکە چووە دەرەوە وبەدەنگی بەرز بانگی لەمیکائیل کرد. میکائیل بەترسەوە خۆی گەیاندەلای. ساموئیل یەخەی گرت و پرسی:

ڕاست بلێ لەوکاتانەدا کەمن لێرە نەبووم چی لێرە ڕویداوە و تۆ چیت بەشەهرزاد گوتووە؟ میکائیل خۆی بەحەپەساو نیشاندا و گوتی:

برای خۆم هیچ شتێك ڕوینەداوە. باوەڕبکە! میکائیل سەیرێکی منی کردوو من بە جولاندنی سەرم تێمگەیاند کە هیچم نەگوتووە. ساموئیل وازی لەمیکائیل هێناو گوتی:

هەردوکتان درۆم لەگەلّ دەکەن. هەم باشترین هاوەلّم و هەم تاکە عەشقی ژیانیشم.

لەناکاو کەوتە ڕێ لەکاتێکدا کەبە پەلە هەنگاوی دەنا، لەقادرمەکانەوە چووە سەرەوە.

بەدوایدا چووم و بینیم لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتووە و چاوی بەیەکداناوە. لەتەنیشتیدا دانیشتم و گوتم:

بۆچی ناتەوێت ئەم یارییە تەواو بکەیت؟ هەم خۆت ئازار دەدەیت و هەم منیش.

دەستی بەناوچەوانیەوە گرت و وەك لەگەڵ خۆیدا بدوێ گوتی:

هەرگیز بیرم نەدەکردەوە وابێت؟ وای بۆدەچووم بەدەستت دێنم، هەربەو جۆرەی کە دڵم دەیویست! نەك وەك کەسانی تر کە بە پارچەیەك ئەڵماس خۆیان دەنایە بەردەستم. من تۆم دەویست، چونکە دەستەمۆم نەدەبووی. تۆقورس و سەنگین بووی من ویستم نەرمت بکەم. لەدڵی خۆمدا دەمگوت ئەم کیژە جگە لە جوانی، دڵێکیشی هەیە کە دەبێت ئەو بەدەست بهێنم، ئەویش وەك کەسانی تر بەبینینی بریق و باقی ئەڵماس و گەوهەر و ژیانی خۆش و شایستە نەرم دەبێت. من لە سەرەتادا تەنها دەمویست بەدەستت بهێنم، بەڵام پاشان عاشقت بووم. عەشقێك کە سەراپای گیانمی بەئاگری خۆی سوتاند و کردی بەخۆڵەمێش، من جەنگێکم لەگەڵت دەستپێکرد. تۆ ئاسکێکی تیژڕەوبووی کەمن بۆ ڕاوکردنت مێرگەکانم تەی دەکرد، من لە ململانێ لەگەڵ تۆدا ماندونەدەبووم، بەڵکو ئەو جەنگ و ململانێیە هیوادارتری دەرکردمەوە بەژیان، ئەمڕۆ تۆ بە گوتنی ئەو ڕستەیەت خەونەجوانەکانی منت شێواند. گوتم:

بەهەرحاڵ هەموو ئاسکێك ڕۆژێك دەکەوێتە دەستی ڕاوچییەکەی! لەداوی تۆدا بۆڕزگاربوون هەوڵی خۆمم دا، بەڵام سەرەنجام خۆم بەدەستەوەدا. زەردەخەنەیەکی تاڵی کردوو گوتی:

نەخێر، من تۆ بەباشی دەناسم ئەگەر دڵنیانەبوایەیت کە من نەخۆشم و بەمزوانە دەمرم هێشتا ڕام نەدەبوویت. تۆ وادەست دەکەیت من نازانم کە دەتەوێت بەزەییت بەحاڵمدابێتە؟ گوتم:

هەق بەتۆیە، من دەزانم نەخۆشی. ڕۆژێك تۆ بەڵێنت لێ وەرگرتم کە پەرستارتبم و هەربەو شێوەی کە چاودێری مامۆستا دەکەم چاودێری تۆش بکەم و وادەست دەکەم ئەو ڕۆژە هاتۆتەپێش. تۆ دەزانیت من هیچ کاتێك خۆم بەدەستەوەنادەم، ئێستاش ئەگەر

بنەوێت سەرپێچی بکەیت کە پەرستاریت لەئەستۆبگرم لەبەرامبەرتدا خۆڕاگری دەکەم.

واز لەوڕک گرتن و سەرسەختی بهێنە و لەبارەی نەخۆشییەکەتەوە بۆم بدوێ. گوتی:

ئەگەر دان بەنەخۆشییەکەمدا بنێم تۆ لەدەست دەدەم. گوتم:

ئەگەر بەڵێنت پێبدەم؟ زەردەخەنەکەی دووبارەکردەوە و گوتی:

کاری ئێمە ئەوەیە کەتەنها بەڵێن بەیەکتری بدەین! من دەزانم کە لەپاش فشاری نەخۆشییەکەم جێمدەهێڵی و ئەم جەنگە بەقازانجی خۆت تەواو دەکەیت. گوتم:

هەڵەکەی تۆ لێرەدایە. من لەتۆ دوور ناکەومەوە، چونکە نەپێویستم بەوە هەیە و نە توانای ئەوەشم هەیە. من ئەگەر کچێکی هێندە ئازاو چاونەترس بوایەم دەمتوانی زۆر زووتر لێرە هەڵبێم، بەڵام ئەو ئازایەتییە لەخۆمدا نابینم. تۆ بەڵێنت بەمندا کە بمبەیتەوە بۆ ئێران و دەبێت بەڵێنەکەت جێبەجێ بکەیت. من کاتێك هەست بە سەرکەوتن دەکەم کەتۆ بەتەندروستێکی باشەوە بمبەیتەوە. من ئەگەر دەبمە پەرستارت تەنها لەبەر ئەوەیە کە دەمەوێت هەرچی زوترە چاکببیتەوە تاکو ململانێکەمان بەردەوام بێت. ڕۆژێك پێم گوتی کە لەم ململانێیەدا سەرناکەویت، بەڵام ئەوەیکە دوایین قسەمت لەمساتەدا پێ دەڵێم ئەوەیە، لەم پێشبڕکێیەدا ئەوکەسە سەرکەوتووە کەبتوانێت بەرگری بکات. ئێمە هەردوکمان عاشقین. من مامۆستام خۆش دەوێ و تۆیش من. دەمەوێت بزانم عەشقی کاممان بەهێزترە، تۆ یا من! بەئاشکرا بینیم کە ڕوخساری گەشایەوە و تروسکەی هیوابەژیان و ململانێ لەچاوەکانیدا درەوشایەوە. هەستایەوە دانیشت و گوتی:

خۆشحاڵم کە بەزەیت بەحاڵمدا نەهاتەوە. من بەردەوامی بەم جەنگە دەدەم، بەڵام دەبێت بڵێم کەتۆ هیچ شانسێکت لەم ململانێیەدا نییە! گوتم:

تائێستا من براوەم و دەشزانم سەرکەوتن بۆمنە، قاقاپێکەنی و گوتی:

کەواتە کێبوو کە چەند خولەکێك پێش ئێستا دەیویست خۆی بەدەستەوە بدات؟ گوتم:

لەوساتەدا دڵم بەحاڵت دەسوتا، بەڵام ئێستا ئەوهەستەم نییە. هەمدیسان بە پێکەنینەوەگوتی:

لام پەسەندە، بەلام بریا قسەکانم تۆمار بکردبایەیت، چونکە دەزانم ئەوانە جارێکی تر دووبارەنابنەوە. منیش پێکەنیم و گوتم:

بۆیەکەمینجار لەژیانتدا ڕاستت گوت. لەدەنگی پێکەنینمان جەمیلە کەبۆدۆزینەوەم هاتبوونەویش دەستی بەپێکەنین کردو ساموئیلی ئاگادار کردەوە کە خواردن ئامادەیە. ساموئیل قۆڵی گرتم و گوتی:

شەهرزادەکەم! بۆ دەستپێکردنەوەی ململانێکەمان هەردووکمان پێویستمان بەهێز هەیە. گوتم:

بەڵێ هەروایە و بەیانی زوو تۆبۆ هێزی زیاتر دەبێت لە نەخۆشخانەدا بخەوی. قۆڵی گوشیمو پرسی:

تۆ لەنەخۆشخانەدا لام دەمێنیتەوە؟ گوتم:

بەڵێ، دەمێنمەوە.

سادە چاوی لەسەر خاڵێك ئەبڵەق ببوو نەیدەتروكاند. پرسیم:

ئایا هەربەڕاستی خۆشت نەدەویست؟ بەغەمبارییەوە سەیرێكی ڕوخساری كردم و

گوتی:

چۆن خۆشم نەدەویست. من ڕفێنەرەكەی خۆمم خۆشدەویست. لەوكاتەدا خەندەیەكی خەماوی هێنایە سەرلێوەكانی وبەردەوام بوو، من لەیەك كاتدا دووپیاوم خۆشدەویست. من تامەزرۆی خۆشەویستی بووم و ئەو كەسەی خۆشەویستی بۆم هەبوایە خۆشم دەویست. من عاشقی ساموئیل نەبووم، بەڵام خۆشم دەویست و ڕێزی خۆشەویستییەكەیم دەگرت هەرلەبەر ئەوەش بوو جێمنەهێشت و وەك پەرستارێكی دڵسۆز چاودێریكردنیم گرتە ئەستۆ. دڵنیابووم كە دەتوانم سەركەوتووبم و دەمویست ساموئیل لەتەندروستییەكی تەواودا جێبهێڵم. ئەو بەو هەموو سامانەیەوە تەنهاو بێكەس بوو. كەسێكی نەبوو خەمی لێ بخوات. گەرچی بەڕوكەش لەوكارە بێزاربوو، بەڵام لەدڵەوە پێی خۆشبوو. ئەو وەك منداڵێكی بچوك وابووكە پێویستی بە دڵسۆزی و دەست بەسەرداهێنان هەیە. ئەو لەنێوان مەعشوقەكانیدا بەدوای خۆشەویستیدا دەگەڕا، بەڵام بەدەستی نەهێنا. هەموو ئەو كەسانەی كە بەدەورییەوەبوون بەگوێرەی پێویستی خۆیان خۆشەویستییان بۆی هەبوو. هیچ كەسێك ئەوی لەبەر خۆی نەدەویس، هەتا "ئایدین"ی هاوسەریشی. هاوسەرەكەی ساموئیل باڵی هەڵسوڕێنەری كابینەی ئیسرائیل بوو، پیاوی

بەتوانای ئیسرائیل بەبێ ئەو هەستی بە لاوازی خۆی دەکرد. ئایدین هەموو کاتەکانی خۆی لەگەڵ ئەودا بەسەر دەبردوو بێئاگابوو لەهاوسەرەکەی. منیش وەکو سامونیل بروام وایە کەسیاسەت شتێکی قیزەونە. سەرمایە گوزاری لەهەر ڕێگەیەکەوە بێت پۆخڵە. پارە و هێز میهرەبانییەکانی مرۆڤ لەبەین دەبەن و مرۆڤێکی ئامێری و بێدڵ پێکدەهێنێن. بۆبەیانی سامونیلم بۆ خەوتن لە نەخۆشخانە ئامادەکرد. سامونیل ڕێگای پێدام کە من فرۆکەکە لێبخورم و خۆیشی لە جێگای یارمەتی دەری فرۆکەوانەوە دانیشت و میکائیلیشمان لەگەڵدا هات. کاتێك فرۆکەکەم لە جێگایەکی گونجاودا نیشاندەوە، سامونیل بۆ یەکەمینجار لەخۆشییاندا لێوەکانی ماچکردم و گوتی:

شەهرزادەکەی من تۆ ئافرەت نیت، بەڵکو ئەستێرەیەکی کەبەهەڵە هاتویتەتە سەرزەوی! ئێمە ئەومان برد بۆنەخۆشخانەو بەخەوتنی ئەو نەخۆشییەکەیشی ئاشکرابوو هەموو زانیمان سامونیل دووچاری نەخۆشییەکی مەترسیدار بووە. پزیشکە ئیسرائیلییەکان دەستیان بەچارەسەرکردنی کردوو من پەرستاری تایبەتی ئەو بووم کە بۆساتێکیش لایم چۆڵنەکرد. هەرڕۆژەی کەسانێکی بەناوبانگ دەهات بۆسەردانی. کەسانێکی دەستڕۆیشتووکە لەکاتی سەردانەکانیاندا پاسەوانییان دەکرا، شەوێکیان کەسی یەکەمی ئیسرائیل هات و من لەگەڵ ئەو، دیداری ئایدینم کرد. ئایدین هەڵس و کەوتی لەگەڵ مندا ساردوو سڕبوو، وەك بڵێیت من یەکێکبم لەژێردەستەکانی ئەو. بەسوکی سەیری دەکردم و خۆی لەمن بەگەورەتر نیشان دەدا. سامونیل لەگەڵ ئەوەشدا کە تەندروستی باش نەبوو، بەڵام ئاگاداری هەڵوێستە خراپەکانی ئایدین بووبەرامبەرمن، دەمبینی لەو هەڵس و کەوتەی ئەو گەڵێك بێزارەو کسپە لەدڵیەوەدێ. ئەو جارجار دەهات بۆسەردانی و لەچەند خولەکێك زیاتر نەدەمایەوەو دەڕۆیشت. خۆشملێی نەدەهات و بێزم لەو ڕەفتارانەی دەبووەوە کەلای هاوسەرە نەخۆشەکەیدا ئەنجامی دەدان، ئەو وەك هاوسەرێك دەبوو بۆ هاوسەرەکەی دڵسۆزبوایە وچاودێری بکردبا، بەڵام بە بیانوی کۆنفرانسەوە نەخۆشخانەکەی جێدەهێشت، وەك بڵێی بۆسەردانی نەخۆشێك هاتووە کەهیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە. لەیەکێك لەسەردانەکانیدا سامونیل گوتی:

نابدین ئەمشەو تۆلەلام دەمێنیتەوە؟ ئەو کەدەستەپاچەببوو گوتی:

نااای! خۆشەویستەکەم مەگەرنازانی ئەمڕۆ یەکشەمەیەومن دەبێت لەکۆبونەوەی حزیدابم؟ کاتێکیش کۆبوونەوەکەمان تەواوبووهێندەماندوم کەناتوانم پەرستارێکی باشبم بۆت، من دڵنییام کەمەعشوقە جوانەکەت بەباشی چاودێریت دەکات. ساموئیل گوتی:

ئەو مەعشوقەی من نییە، ئەو مرۆڤێکە، مرۆڤێکی باش کە ڕێزی خۆشەویستی دەزانێت. کاتێك ئەو ڕۆیشت ساموئیل گوتی:

من نیگەرانم لەوەی کەهاوسەرەکەم بەوجۆرە لەگەڵتدا جولاَیەوە. گوتم:

گرنگ نییە ئەگەر هەرژنێکی تریش لەباتی ئەوبوایە هەمان هەڵوێستی دەبوو. هیچ کەسێك نازانێت کە چ پەیوەندییەك لەنێوان من و تۆدا هەیە. هەموان واهەوست دەکەن منیش یەکێکیترم لە مەعشوقەکانت. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

ژیان یارییەکی سەیرە! هیچ کاتێك مرۆڤەکان بە ئارەزووی خۆیان ناگەن. من هەموو شتێکم هەیە، بەلاَم خۆم بەبەختەوەر نازانم. زەماوەندی من و هاوسەرەکەم لەڕووی عەشق و خۆشەویستییەوەنەبوو. سیاسەت شتێکی قیزەونە. هاوسەرم منی خۆشناوێت هەروەك ئەوەی کەمن ئەوم خۆشناوێت. ئەوعاشقی پیاوێکی بالاَدەستی ئیسرائیلەو من عاشقی تۆم و تۆیش عاشقی مامۆستاو خوداش دەزانێت کەمامۆستاش عاشقی کێیە؟ گوتم:

هەق بەتۆیە، ئێمەهەریەکەمان بەدوای بەختەوەری و کامەرانیدا دەگەڕێین، چونکە نازانین خۆشبەختی چییە و کامەرانی کامەیە، بۆیە خۆمان بە بەختەوەر نازانین، لەکاتێکدا کە دەشێ بەختەوەری هەرئەوەبێت کە تیایداین. ڕووی لێوەرگێڕام و گوتی:

من لای تۆدا هەست بەکامەرانی دەکەم. ئەوەم لێ زەوت مەکە. من هێندەم لە ژیاندا نەماوە! لێگەڕێ واهەستبکەم بەخۆشبەختی ژیاوم و بە بەختەوەریش سەردەنێمەوە. گوتم:

دیسانیش قسەی نائومێدانە دەکەیت؟ من ئیهانە و سووکایەتی کەسانی ترم بەگیانم کڕی. تەنها لەبەرئەوەی کەتۆ زوترچاکبیتەوە و تاکو بتوانین بەردەوامی بەململانێیەکە

بدەین. ئەگەر بزانم هیوات بەژیان نەماوە، دەڕۆم و وازت لێدێنم. کاتێك ڕووی بەرەولام وەرگێڕا دڵۆپەیەك ئەسرین لەچاوی بەربویەوە و گوتی:

من چاکدەبمەوە چونکە تۆ دەتەوێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو کەئەو بەرەو پیری مەرگ دەچووکورترین ماوەی لەژیاندا مابوو. من و باوکی ساموئیل لەبارەی حاڵی ئەوەوە زۆردادەنیشتین و گفتوگۆمان دەکرد، لەنێوانماندا خۆشەویستی و متمانەیەکی پتەو دروست ببوو. میکائیل ڕاستییەکەی بەوگوتبوو ئەوچونکە دەیزانی من تەنها لەبەر بەڵێنێك کەبەساموئیلمداوە پەرستاری دەکەم، هەستی بە نرخی کارەکەم کردوو ڕەفتاری لوتبەرزانە نەبوو. ئەویش لەبەر ساموئیل منی بە شەهرزاد بانگ دەکردوو جارجاریش کچەکەمی پێدەگوتم. تاقیکردنەوە جۆراو جۆرەکان، ساموئیلی خەمبارو لاوازتر کردبوو. چاوەکانی بەقوڵاچوبوون و بێ ڕەونەق ببوون. دەمارەکانی گیانی هێندە ئاڵۆزبوو کە بەزەحمەت خوێنی تێدەکرا. ئەو خۆیشی هەستی پێکردبوو کە چاکبونەوەی محاڵە و هەرلەبەر ئەوە داوای لەباوکی کردتاکو لە نەخۆشخانە دەری بکات و بیبەنەوە بۆ لوبنان.

لەبەرامبەر ئەو قسەیەی ساموئیلدا، باوکی بەسەرسامییەوە سەیرێکی منی کردو گوتم:

هەرچی دەڵێت ئەنجامی بدەن. ئێمە ساموئیلمان بەتەختەکەوە نایەناو فڕۆکەو دوکتۆرێك و پەرستارێکمان لەگەڵدا هات. لەکۆشکدا هەمووشتێك بۆ گەڕانەوەی ساموئیل ئامادەکرابوو. ژوورەکەی ساموئیل گۆڕا بە بەشێکی نەخۆشخانەو هەر ڕۆژەی لەسەرانسەری دنیاوە پزیشکەناودارەکان دەهاتن بۆ بینینی، بەڵام هەموو ئەوانە بێ ئەنجام دەگەڕانەوە. باوکی ساموئیل دەستی لەهەموو کاروپیشەیەکی هەڵگرت تاکو لەگەڵ ئێمەدا بژی. لەڕوخساریدا غەمێکی گەورە شەپۆلی دەدا. ئەو دەیبینی کە کوڕەکەی هەموو ڕۆژێك وەك مۆمێك لەپێشچاویدا دەتوێتەوە و نەیشی دەتوانی کارێکی بۆبکات، تاسەرەنجام بەهۆی بێخەوییەکی زۆر و نیگەرانییەوە لەپێکەوت و لەنەخۆشخانەکەوت. من تەختەخەوەکەی خۆم بردە ژوورەکەی ساموئیلو پەرستاریش ژوورەکەی منی شپرزە کردبوو. لەخۆرئاوابونێکی خەماویدا ساموئیل داوای لێکردم تاکو

لەبەر پەنجەرەکەدا دایدەنیشێنم. خۆر دەڕۆشت تاکو لەپێش چاوان ونبێت، سامونیل سەیرێکی خۆرەکەی کردوو گوتی:

خۆری ژیانی منیش لەحاڵی ئاوابوندایە. گریان بینی گرتبووم، بەبێدەنگی گوێم بۆقسەکانی گرتبوو ئەو بەردەوامی پێدا:

کاتێك مردم هەر لەم خاکەدا بمنێژە! من لێرەدا خۆشبەخت و ڕازی بووم. من ئەرزداری تۆم ، چونکە دووساڵم لەتەمەنت گرت و دەبێت هەقی ئەوەت پێبدەم. پڕبەدڵ حەزدەکەم پێم بڵێیت چیت دەوێ. گوتم:

هیچ! نیگابێتینەکەی بڕییە ڕوخسارم و گوتی:

ئەگەر دەتەوێت بەئاسودەیی سەربنێمەوە شتێکم لێداوابکە. گوتم:

تۆ هیچ قەرزاری من نیت، ئەگەر دەبینی لە تەنیشتتدام، تەنها لەبەرئەوەیە کە خۆم خواستوومە. پێکەنینێکی تەوساوی کردوو گوتی:

لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆشت ناوێم، بەڵام لە هاوسەرەکەم بەوەفاتری بۆم. گوتم:

من خۆشم دەوێیت، بەڵام عاشقت نیم. ڕوخساری سور هەڵگەڕا و گوتی:

تکات لێدەکەم جارێکی تر ئەو رستەیە دووبارە بکەرەوە! گوتم:

من خۆشم دەوێیت بەڵام... نەیهێشت قەسەکەم تەواو بکەم.گوتی:

ئەویتری مەڵێ. بهێڵە واخەیاڵ بکەم کەتۆ پڕبەدڵ خۆشت دەوێم و لەبەر عەشق لامماویتەوە! بێدەنگ بووم و ئەوگوتی:

ئایا ئامادەیت دواین ئارەزووم بهێنیتەدی؟ نیگام لەگەڵ نیگایدا تێکەڵ بوو. نەمدەزانی دواین ئارەزووی ئەو چییە، بەڵام سەرم ڕاوەشاند. گوتم:

بەڵێ، ئامادەم. دەستمی خستە ناودەستی خۆی و گوتی:

بڕۆ ئەو جلانە لەبەر بکە. پرسیم:

کام جل؟ گوتی:

هەرئەو جلانەی کە دەتکاتە شەهرزاد! دەمەوێت شانبەشانت هەنگاو بنێم. بەگوێرەی دڵی ئەو ڕەفتارم کرد و داوام لەجەمیلەکرد تاکو وەك ژنانی عەرەب بمرازێنێتەوە. کاتێك چوومە ژورەکەیەوە ساتێك بەتامەزرۆییەوە لێم ڕاماو پاشان گوتی:

ئێستا یارمەتیم بدە تاکو لەدەرگاکە دەچمە دەرەوە. من و میکائیل ئەومان گەیاندە حەوشەکە و سامونیل لەحاڵێکدا کە خۆی چەسپاندبوو بەقوڵمەوە گوتی:

وەرە تاکەناری ڕوبارەکە بچین. بۆئەو ڕێگایەکی دوور و درێژبوو. گوتم:

بەوحاڵەتەوە ڕۆیشتن بەپێ زیانی هەیەبۆت. دەستی گوشیم و گوتی:

حاڵم باشە. تاکو گەشتینە ڕوبارەکە خۆر بەتەواوی ئاواببوو ڕوناکی مانگ دەورووبەری ڕۆشنکردبویەوە. خورەی ئاوو دەنگی بایەك کەلەناو درەختەکانەوەدەهات، دیمەنێکی شاعیرانەی دروستکردبوو، لەژێر درەختێکدا دانیشت و گوتی:

ئێستا کەمێك لێم دووربکەوەرەوە و لەبەرامبەر ڕوناکی مانگدا بەرەولام وەرە! لەپشتی سەریەوە هەنگاومناو خۆم گەیاندەلای و ورد ورد لێی نزیك بومەوە، بێویستی خۆم دەگریام و حەزم دەکرد بانگ هەڵبدەم. ئەو بەئەستەم لەسەر قاچەکانی وەستاو باڵەکانی ئاوەڵا کردو گوتی:

تۆسەرەنجام بویت بە ماڵی من! من تۆم بەدەست هێنا! من تەنها گەوهەرە گرانبەهاکەی ئەم دنیایەم بەدەست هێنا! دواجار لەئامێزی گرتم و سەری خستە سەرشانم و بە دەنگێك کەبەئاستەم دەبیسترا، چپاندی بەگوێمدا:

من سەرەنجام لەم یارییەدا سەرکەوتم و تۆم بەدەست هێنا! هەرگیز لەبیرم نەکەیت! ئەوکات دەستەکانی سامونیل کە کەمەرمی بەتوندی گرتبوو شۆڕبویەوە و لەبەر پێمدا کەوتە سەرزەوی. سامونیل لەدنیا دەرچوو، باوکی ئەوی لەلوبنان بەخاك سپارد. سامونیل بەخۆشبەختی ماڵئاوایی لەم جیهانە کرد، بەڵام بەڕۆشتنی منی دوچاری شێتی کرد. من هێندە گریام تانەخۆش کەوتم. وەك بڵێیت ڕۆح وگیانمیان لەگەڵ سامونیلدا خستبێتە گۆڕەوە. ئەوان منیان بردەوە بۆئێران و بردمیان بۆ خەڵوەتگە. من بەنەفرتکردن لەسامونیل لەئێران ڕۆشتبوم و ئێستا بەرۆح و دڵی کوت کوتەوە

گەڕابوەمەوە. هیچ کەسم نەدەناسییەوە و نەشمدەزانی لەکوێم. من لەگەڵ ساموئیلدا مردبووم تەنها جیاوازیمان ئەوەبوو کەمن هەناسەم دەداو ئەو لەژێر کۆمایەک خۆڵدا ئارامی گرتبوو. میکائیل هەموو شتێکی بۆ باوک و دایکم باسکردو منی دایە دەستیان و ڕۆشت. کچە تاقانەکەیان بە شێتی گەڕابویەوە. هێندە شین و گریانم دەکرد کەناچار بوون بۆکۆنتڕۆڵکردنم دەست و پێم بەزنجیر ببەستن. من لەدنیایەکی تردا دەژیام، دنیایەک کە سەراپای ئاوبوو تاشەبەردەکانیشی قەوزە گرتبوی. وەک بڵێی من تەنها دانیشتووی ئەو دنیا پەرت و شێواوەبووم. وەک پاشماوەی کەشتییەکی نوقم بوو. لە مۆتەکەکانی هەرشەوێکمدا، دایک و باوکم و ساموئیل لەپێش چاوەکانمدا نوقم دەبوون و وەک داوای یارمەتی بکەن دەستەکانیان بەرەولام درێژدەکرد. دەمویستم هاوکارییان بکەم، بەڵام تاشەبەردە قەوزەگرتووەکان بواریان نەدەدا دەستیان بگرم و ئەوان سات بۆسات لێم دووردەکەوتنەوە. من بەدەستولاقی زامدارەوە لەسەر تاشەبەردە تیژەکان ڕێگام دەکردوو نائومێدانە هەوڵم دەدا بۆ ڕزگارکردنی ئەوان ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە، بەڵام شەپۆلە یاخییەکان، ئەوانی لەگەڵ خۆیدا دەبردوو من شێتانە هەوڵم دەدا. لەدوورەوە گوێم لەناوی خۆم بوو، بەڵام نەمدەزانی لەچ لایەکەوەیە. تائەوەبوو شەوێک لە ناو قوڵایی دەریادا کەسێک هاتەدەرەوە، ئەو ڕوخسارێکی ڕەق و تەقی هەبوو، بەچاوە وردو ڕاکێشەرەکانییەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

من بۆڕزگارکردنی تۆ هاتووم، دەستت بێنە! گەرمی دەستەکانی تینی دووبارەی ژیانی پێبەخشیمەوە. دەنگی ئەو وەک ئاوازی مۆسیقا وابوو. دەستم نایە ناو دەستی و هێندەگریام تا خەو بردمییەوە. لەپاش ئەوە کاتێک دەستەگەرمەکانی ئەو بەدەستمەوەبوو سەختترین سوتێنەرەکانم قەبوڵ دەکردوو ڕێگام دەدا تاکو تارماییەکە هەرکارێکی دەویست لەگەڵ لاشەی مندا ئەنجامی بدات. کاتێک ئەو لەدەریاوە دەهات بێدەنگ و ئارام دادەنیشتم و لێم دەڕوانی، بەڵام کاتێک تاریکی هەموو شوێنێکی دادەپۆشی و ئەودەگەڕایەوە بۆ ناو دەریا، هەستو ژیانیشمی لەگەڵ خۆی دەبرد. ڕۆژێك چپاندی بەگوێمدا:

دەتەوێت لەگەڵ خۆم بدبەم؟ تەنها سەیرم کردوو دڵۆپی ئەشك بەسەر گۆنامدا شۆڕبویەوە. بەئارامی گوتی:

من تۆ لەگەڵ خۆم دەبەم، بەڵام بەڵێن بدە کەکاتێك بەجێتدەهێڵم هاوار نەکەیت و ئارام بیت. ورتەم لەدەمەوە نەهات، بەڵام مانای نیگاکەمی هەست پێکردوو ڕۆیشت. کاتێك بەجێی هێشتم نەگریام و هاواریشم نەکرد. ئەو منی لەگەڵ خۆیدا لە خەڵوەتگە بردە دەرەوە. بردمی بۆماڵی خۆی. ماڵێك کە ڕۆژێ پڕبەدڵ ئارەزووم دەکرد لەوێدا بژیم و خۆشم دەویست و دڵم پێی دەکرایەوە. دانیشتم و سەیری دەوروبەرم کرد، هەستم کرد هۆگری ئەوێمو هەموو شتەکانی لەگەڵمدا میهرەبانن. دەستم بۆ نوێنە ڕاخراوەکەبردو سەیری تابلۆکەم کرد کەبەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو. بێدەنگی ئەوماڵە دڵگیربوو. ئەوشەوە لەوماڵەدا بەبێ هیچ دەرزی و دەرمانێك خەوم لێکەوت. خەوێکی شیرین و دوور لەمۆتەکە. من دەریاو تاشەبەردم وەلاوەنابوو لەکەناردا ماڵێکی ئارامم درووستکردبوو. بەیانی لەگەڵ دەنگی بەسۆزی ئەو چاوم کردەوە. ئەو لەتەنیشت جێگەخەوەکەمەوە دانیشتبوو سەیری دەکردم. دەستیم گرت و نامە سەر ڕوخسارم. گەرمی ئەو تێیدەگەیاندم کەهێشتا زیندووم و هەست لەجەستەمدا نەمردووە. کاتێك خواردنی بۆ ئامادە دەکردم و دەینایە ناو دەممەوە، دەگریا. کاتێك ناچار دەبوو دەرزیم لێبدات و من لەبەرامبەریدا دەستم درێژ دەکرد، دەگریاو هەتا کاتێك کە داوام لێکرد چیرۆکم بۆ بڵێت دیسان دەگریا. ئەو تارماییانەی کە هەر ڕۆژێك دەهاتن بۆ ماڵەوە بێ ئازار بوون، بەڵام من لەترسی ئەوەی کە نەبا لەگەڵ خۆیاندا بمبەن لەپشتی تەختە خەوەکەمەوە خۆم حەشار دەدا و ئەو هیچ کاتێك داوای لێنەدەکردم کە خۆم نیشانی تارماییەکان بدەم. کاتێك ئەوان دەڕۆشتن، بەئارامی لەژێر تەختەکە دەهاتمە دەرەوە و هەردووکمان هەناسەی ئاسودەییمان هەڵدەکێشا و شادومانبووین لەوەیکە بەتەنها بەجێیان هێشتووین. کاتێك بەفر دەباری ئەو مرۆڤێکی لەبەفر دروست دەکردوو ڕەنگی دەکردو پاشان هەردووکمان کەم کەم لێمان دەکردەوە و بەڕوخساری یەکتریماندا دەداو پێدەکەنین. شەوان ئەو گۆرانی لەبارەی ژیان و ئومێدەوە بۆدەگوتم، زۆربەی شەوان

هەردوکمان هەربەوجۆرەی کەدانیشتبووین خەو دەیبردینەوە. ئەوەدەیویست بیرەوەریە خۆشەکان لە یادەوەریمدا زیندوو بکاتەوەو بمگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمانی پێشووم. ئەو پزیشکی من بوو و سوور بوو لەسەر ئەوەی نەخۆشەکەی چاک بکاتەوە. ڕۆژێک پرسی:

سادە ئارەزوی وەرزش دەکەیت؟ گوتم:

چۆنچۆنی؟ گوتی:

چۆنچۆنی نە. دەبوو بڵێیت چ جۆرە وەرزشێک و ئەوکات من دەمگوت چ یارییەک بکەین. گوتم:

چ وەرزشێک؟ گوتی:

تۆپێن! تۆپێکی بچوکی هێناو گوتی:

کچێک دەناسم کە باشتر لەکوڕان یاری بەتۆپ دەکات و واهەست دەکەم تۆ وەک ئەو بەچاکی بتوانیت. ئەوکات خۆی دەستیکرد بەسەرپێیی لێدان. چەند سەرپێییەکی لێداو تۆپەکەی بەرەو لام هاویشت و گوتی:

ئێستا تۆ دەست پێبکە و من دەستم پێکرد. کاتێک ماندوو بووم بینیم کەئەو دەگریەت. مات و سەرگەردان سەیرێکم کرد. ئەو دەستی گرتم و گوتی:

بێوێنەبوو! زۆرباش بوو. گوتم:

بەڵام تۆ گریایت! دەستی نایە سەر دەستم و گوتی:

فرمێسکی من فرمێسکی شادییە. تۆ زۆر باشتر لەو کچە یاری دەکەیت. ئێستا ئیتر تەواو تۆ دەبێت پشوو بدەیت. ئێمە ڕۆژمان دەگوزەری بەمانگ و لە تەنیشت یەکتردا ژیانێکی ئاسودەمان هەبوو. تەندروستی من باشتر ببوو ئیتر دەمتوانی دەورووبەرەکەم بناسمەوە و لێیان هەڵنەیەم. فریشتەو عەتام خۆشدەویست و لەقوڵایی ناخمدا هەستم بەخۆشەویستیان دەکرد. ئەوان کاتێک دەهاتن بۆ سەردانمان گوڵیان بۆ دەهێنام و عەتا قسەی گاڵتەو گەپیان بۆ دەکردم و منیش پڕبەدڵ پێدەکەنیم. شەوێک ئەوان لەلامان بوون و مامۆستا چیرۆکی کچێکی گێڕایەوە کە لەبەر عەشقی پیاوێکی ئاسایی چاوی لەباشترینەکان پۆشی و بە شێت و شەیدایی گەڕایەوە. من بینیم ئەوان دەگریان چاوم

بۆیە ئەو گوڵانەی کە بۆیان هێنابووم لەوەی کە گوڵێکیان لەلاسکەکەی خۆی کردبویەوە خەمباربووم. هەستامەوە و گوڵێکم بەدەستەوە گرت و گوتم:

سەیرکە! ببینە چەندە جوانە؟ بەڵام ئەگەر دەستیان لێبدەم، بەخێرایی دەژاکێن و دەمرن. عەتا چاوی تێبڕیم و پرسی:

چی بکەین بۆئەوەی هەڵنەوەرێن؟ گوتم:

نابێت لە لاسکەکەیان جیابکەینەوە و ئەگەر کەسێك ویستی دەستیان لێبدات ئاگاداریان بکەینەوە. مامۆستا گوڵەکانی بەدەستەوە گرت و گوتی:

بەڵێ تۆ راست دەکەیت. نابێت گوڵ لەچڵی خۆی جیابکرێتەوە. ڕووم لەفریشتەکردوو گوتم:

ئەمجارەیان کەهاتنەوە گوڵدانم بۆ بهێنن. گوڵدانێك بەگوڵەوە کە لق و پۆی هەبێت. لەمانای نیگاکانیان تێگەیشتم و چوومە سەر تەختە خەوەکەم. جارێکی تر کەهاتن گوڵدانێکیان بەگوڵەوە بۆ هێنام و گوتیان کە دەتوانم لەباخچەکەدا دایبنێم. چێژم لەباغەوانی دەبینی، بەڵام ئەوکارە دەبوو لەکاتێکدا ئەنجامم بدایە کە مامۆستاش لە تەنیشتمدابوو. بەهاتنی وەرزی هاوین حاڵی دەرونیم خراپتربوو. مامۆستا ناچاربوو لەنەخۆشخانە بمخەوێنێت. بەڵام ئیتر زنجیر لەئارادا نەبوو، نەخۆشێکی ئارام بووم کە تەنها لەهۆش خۆم دەچووم و چاوم لەسەر خاڵێك ئەبڵەق دەبوو. مامۆستا زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ مندا بەسەر دەبردوو تاکو ئەو لەگەڵمدابوو لەهیچ شتێك و هیچ کەسێك نەدەترسام، بەڵام شەوان ئەو ناچاردەبوو نەخۆشخانە بەجێبهێڵێ و بگەڕێتەوە ماڵ. کاتێك ئەو دەڕۆیشت ترس سەرتاپامی دادەگرت و تاکو بەیانی نەدەنوستم، بەڵام هەرکە سپێدەم دەبینی ئارام دەبوم و خەو دەیبردمەوە. دکتۆرەکان زاتیان نەبوو لێم نزیك ببنەوە، کە دەستیان لەدەستم دەدا دەترسام و هاوارم دەکرد. هێندەم داوو دەرمان خواردبوو کە چیتر کاریگەرییان نەمابوو، لەو ڕۆژگارەدا دووجار هەوڵی خۆکوشتنمداو سەرکەوتوو نەبووم. ڕۆژێك کەوەك هەمیشە مامۆستا هات بۆلامو پێکەوە لەباخچەی نەخۆشخانەکەدا پیاسەمان دەکرد. مامۆستا دەستی گرتبووم و هەردووکمان

هێواش هێواش ڕێگەمان دەکرد. من لەژێر کاریگەری دەرمانە ئارامبەخشەکاندا هەستم بە لاوازی خۆم دەکرد. ئارەزووم دەکرد بایەکی بەهێز هەڵی بگرتمایەو لەگەڵ خۆی بیبردبام. کاتێك ئارەزووەکەمم بە مامۆستاگوت. گوتی:

حەزدەکەیت بایەکە لەچ جێگایەك داتبنێ؟ گوتم:

ئەو جێگایەی کە دایك و باوکم لەوێن. هیچ شوێنێکی دونیام بەقەد ئەو جێگایە خۆشناوێت. زەردەخەنەیەکی کردوو گوتی:

بەڵام ئەویَ گەلێك دوورەو ئەگەر تۆبڕۆیت من بەتەنها دەمێنمەوە. گوتم:

تۆش لەگەڵمدا وەرە، بەڵام دەبێت وەك من کێشت کەمبێ و تاکو بایەکە هەردوکمان لەگەڵ خۆیدا ببات. بەڵام من ئارەزووی جێگایەکی تر دەکەم. پرسیم:

تۆ حەزت لەکوێیە؟ گوتی:

من حەزدەکەم تۆ ببەم بۆ جێگایەك کە ئازادانە بتوانین لەوێدا ژیان بکەین و لە دەشتێکی بەریندا یاریبکەین، حەزدەکەم بتبەم بۆ جێگایەك کە وەك ڕابردوو پێبکەنی و لێم تورەبی و جارجارەش لێم زیزبیت. ئەوکات من نازت بکێشم و تکات لێبکەم کە لەگەڵمدا ئاشت ببیتەوە. گوتم:

من هەرگیز لەتۆ زویر نابم و ئەگەر ڕۆژێك لێم جیاببیتەوە دەخوازم بمرم. گوتی:

کەواتە بۆ دەتەوێت بەتەنها جێم بهێڵیت، لەکاتێکدا کە دەزانیت بەبێ تۆ دەمرم. ناکەمیوای ژیانم تۆی. ئەگەر ڕۆژێك نەتبینم شێت دەبم. سەرم نوساند بەشانییەوە و گوتم:

بەڵام دایك و باوکم بەتەنهان. ئەوان بانگم لێدەکەن و گوێم لێیە کە دەڵێن سادە وەرە! وەرەو لەگەڵ ئێمەدا بژی تۆ کیژی تاقانەی ئێمەی تۆ دەبێت لەگەڵ ئێمەدابیت، من دەمەوێت بڕۆم، بەڵام هەرکە ئامادە دەبم، چاوەکانی تۆ لەڕۆیشتن پەشیمانم دەکەنەوە و گەرمی دەستەکانت ژیانی دووبارە بەمن دەبەخشن. دەستمی گوشی و گوتی:

کەواتە بۆچی دەتەوێت جێم بهێڵیت لەکاتێکدا کە دەزانیت تەنها منم کە خۆشم دەوێیت؟ ئەگەر ئەوان خۆشیان بویستبای ئەیان دەهێشت تەنها بیت. ئەوە منم ک خۆشم دەوێت و هەمیشە لات دەمێنمەوە. هەولبدە ئەوان لەبیر بکەیت و تەنها بیر لەمن و ئەوعەشقەی نێوانمان بکەیتەوە. مردووەکان فەرامۆشکەو لەبیری زیندووەکاندابە! ئەگەر بزانم کەتۆ تەنها بیر لەمن دەکەیتەوە، خۆم بە خۆشبەختترین پیاوی دونیا دەزانم. گوتم:

من لەگەڵ خۆتندا دەبەیت بۆ دەشتی فران؟ گوتی:

ئەگەر بزانم تەنها بیر لەمن دەکەیتەوە، بەڵێ، دەتبەم. ڕوخساریم ماچکردوو گوتم:

ئێستا باوەڕبکە وادەکەم. ئەویش دەستی ماچکردم و گوتی:

باوەڕدەکەم.

"٢٠"

دوایین مانگی هاوین بردمی بۆدەشت، شوێنێک کە تا چاوبڕی دەکرد سەوزایی بوو. هێندە پێکەوە ڕێگەمان کردکە هەردووکمان بەتەواوی هیلاک و ماندوو بوین و بەهەناسە بڕکێ لەسەر سەوزەگیا درێژ بووین. ئاسمان ساف و بێگەرد بوو. شنە بایەک لە گوڵ و گیاکانی دەداو دەیهێنانەسەما. مامۆستا هەربەو جۆرەی کە سەیری ئاسمانی دەکرد گۆرانی بۆ دەچڕیم. ئاوازی ئەو هیوای ژیانی لە مندا بەهێز دەکردو دەرگای ئومێدو ئارەزووی لەڕومدا والادەکرد. ئێمە خێوەتی خۆمان لە نێوان دەشت و کەناری ڕوباردا هەڵدابوو. هەموو ڕۆژێک مامۆستا بە چەپکێک گوڵی دەشتییەوە لەخەو بێداری دەکردمەوە و منیش نانی بەیانیم بۆ ئامادە دەکرد. دۆستەکانمان سەردانیان دەکردین و ئازوقەیان بۆ دەهێناین. کاتێک مامۆستا و عەتا دەستیان بە گفتوگۆ دەکرد، من و فریشتەش بەو دەشتەدا دەگەڕاین و ئەو لەبارەی خۆشییەکانی ژیانەوە دەدوا. لە میهرەبانی خەڵکی و ئەوەیکە هەموو عەشقەکان بەناکامی تەواو نەبوون. ئێمە بەپیاسە تاسەر چاوەکە ڕۆشتین و لەژێر درەختی کەنار ڕوبارەکەدا پشوومان دەدا. قسە خۆشەکانی ئەوان هێوری دەکردمەوە. ئەوان پێیان دەگوتم کە سامونێل لەو دنیا بەخۆشحاڵییەوە لە تەنیشت باوک و دایکمدا ژیان دەکاو نیگەرانی حاڵی منە. مامۆستا دەیگوت ئەگەر دەتەوێت سامونێل ئارام و ئاسودەبێت، دەبێت بێیتەوە سەر خۆو هیوات بەژیان هەبێت، من قسەکانی ئەوانم دەبیست و باوەڕم پێیان دەکرد. تائەوەبوو شەوێک سامونێلم لە خەودا بینی و پێی گوتم:

شەهرزاد تۆ دەبێت هیوات بەژیان هەبێ و لەگەڵ مامۆستادا بژیت. من لەو دووساڵەدا خۆم بە بەختیار ترین پیاوی سەر زەوی دەزانی و ئێستا داوات لێدەکەم کەمامۆستاش وەك من بگەیەنیتە ترۆپکی کامەرانی. بەڵێن دەدەیت ئەم دوایین ئارەزووەشم بێنیتە دی؟ و پاشان گوڵێکی سوری بەچڵێك زەیتونەوە پێدام و لەکاتێکدا کە پێدەکەنی ماڵئاوایی لێکردم. من کاتێك لەزمانی خۆیەوە ژنەفتم کە ئاسودەیە ئارام بوومەوە و ورد ورد تەندروستیم بەرەو باشتر چوو. من لەژێر چاودێرییەکانی مامۆستادا ڕابردووم هێنایەوە یادم و جارێکی تر پێیان ئاشنابوومەوە. مامۆستا تارماییە وەهمییەکانی لەپێش چاوەکانم لاداو جارێکی تر تەندروستیم بۆ گەڕایەوە، بەڵام ئەو ڕوداوەو ئەو نەخۆشییە چوار ساڵی لەباشترین ڕۆژەکانی ژیانی لاویمی لەناو بردوو دای بەدەم ڕەشەبای فەنابوونەوە.

سادە جگەرەیەکی داگیرساندوو گوتی:

ئێستا تێگەیشتیت کە بۆچی من و مامۆستا نامانەوێت ببینە خاوەنی منداڵ؟ بەجوڵاندنی سەرم قسەکەیم پەسەندکرد. بەهاتنە ژوورەوەی کوڕەکەم کەتۆپێکی یاری و جانتای قوتابخانەی بەدەستەوەبوو، دەزووی قسەکانی سادە بچڕا. ئەوانم بەیەکدی ناساندو هەربەو جۆرەی کە سروشتی سادەخۆی بوو بەخێرایی لەگەڵ کوڕەکەمدا هۆگری یەك بوون. بەجۆرێك کەنزیکەی کاتژمێرێك پێکەوە دانیشتن و سەرقاڵی گفتوگۆکردن بوون لەبارەی تیپی هەڵبژێردراویانەوە. خۆشبەختانەهەردووکیان لایەنگری یەك تیپ بوون، واهەست دەکەم یەکێك لەهۆکارەکانی خۆشەویستییان بۆ یەکدی ئەو ئارەزووە هاوبەشەیان بوو. ئەوکاتەی کە ئەوان سەرقاڵی گفتوگۆکردن بوون، مێزەکەم ڕازاندەوە و فەرموی نانخواردنم لێکردن. سادە زانیاری تەواوی لەکوڕەکەم وەرگرت لەبارەی هاوەڵەکانی و بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیەوە. کاتێك بەکوڕەکەمم گوت کەسادەش لەسەردەمی منداڵیدا ئەندامی تیپی گەڕەکەکەی خۆیان بووە، سەرەتا بەگومان و سەرسوڕمانەوەگوێی گرت، بەڵام زۆر زوو دڵنیابوو کەئەو خانمە جوان و یاری دۆستە، دەتوانێت یاریچیش بێت. کاتێك کەمێزەکەی بەجێهێشت گوتی:

هیوادارم جارێکی تر کەبەیەك گەشتینەوە بوارتان هەبێ و پێکەوە یاری بکەین.
سادەیش بەخۆشحاڵییەوە داخوازییەکەی پەسەند کرد. لەکاتی خواردنی دسێردا*، گوتم:
خۆشحاڵم کەتەندروستیت بۆگەڕایەوە و لەگەڵ مامۆستادا ژیانێکی هاوبەشتان دەستپێکردووە. گوتی:

سوپاست دەکەم، بەڵام بەڕاستی ئەگەر مامۆستا نەبوایەو ئەگەر دڵسۆزی و فیداکارییەکانی ئەو فریام نەکەوتبان، ئێستاش لەنەخۆشخانەدا کەوتبووم. شێوازێك کەمامۆستا بۆتەندروستی من بەکاری هێنا لەگەڵ جۆری چارەسەری پزیشکەکاندا جیاواز بوو. ئەو بەپێچەوانەی هەندێ کەسەوە کەهەوڵیان دەدا یادەوەرییەکانی ڕابردوو لەزەینی نەخۆشەکاندا بسڕنەوە، هەرگیز ئەوکارەی نەکرد، بەڵکو ئەو باسی دەکردن، بەڵام نەك بەجۆرێك کە ئازارمێن بێت. ئەو چیرۆکی ژیانمی چەندەهاجار لەوێنەی ئەفسانەدا دەگێڕایەوە و هیچ کاتێك لەچیرۆکەکاندا ساموئیلی وەك دێوێك نیشان نەدەدا، بەڵکو هەمیشە خۆی بەتاوانبار دەزانی کە نەیتوانیبوو فیداکاری بۆ عەشقەکەی بکاتو بیپارێزێت. مامۆستا خۆی بەتاوانبار دەزانی و دەیگوت:

هەموو ئەو تەنگ و چەڵەمانەی کەتۆ بەسەرت هات بەهۆی درەنگ هەنگاو نانی منەوەبوو. ئەگەر زووتر دەست بەکار بوایەم، هەرگیز ئەوکارەساتە ڕوینەدەدا. ئەویش لەوماوەیەدا گۆڕابوو ئەوێك کەلەگەڵ ئەو بۆچوونەدا گەورەببوو کە ئافرەتان بۆ ڕازیکردنی غەریزەی پیاوان درووستکراون، لەگەڵ ئەوکارەساتەدا کەبەسەرمن هاتبوو، خۆی چارەسەرکردوو دانی بەوەدانا کە ژنان دەتوانن هەتا گیانی خۆیشیان بخەنە پێناوی عەشقەکەیانەوە و بۆ بەردەوامیشی سزا قەبوڵ بکەن. ئێمە دوونەخۆشبوین کەبۆ یەکتری بوینە پزیشك و یەکترینمان چارەسەرکرد. من باوەڕم بەچارەنووس هەیەو دەزانم قەدەری ئێمە ئەوەبوو کەلە تەك یەکدابین و پێکەوە بژین. واهەست دەکەم گەشتیتە

---

*بەوجۆرە خواردەمەنیە سوکانە دەوترێت کە دوای نانخواردن بەمەبەستی هەرسکردنی خواردنەکە دەخورێت. -و-

کۆتایی چیرۆکی ژیانمان، بەلام مۆلەتبدە دوایین بەشی لەوێوە دەست پێبکەم کەلەگەڵ مامۆستادا زەماوەندم کرد. گوتم:

هەرجۆرێك ئارەزوو دەکەیت، بەلام منیش دەمەوێت رێگەم بدەیت قسەکەت راستبکەمەوە و بڵێم دوایین بەشی کتێبەکە نەك دوایین بەشی ژیانتان، چونکە تۆو مامۆستا هێشتا لەسەرەتای رێگادان و هیوادارم چەندەهاساڵ بەخۆشی و کامەرانی بەسەریبەرن. بەدەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:

بەڵێ تۆراست دەکەیت، دوایین بەشی کتێبەکەیەو ئێمە هێشتا سەرەتامانە، رێگام بدە لەوێوە دەست پێبکەم کە هاتبوومەوەسەرخۆ. من و مامۆستا لەماڵی ئەودا دەژیاین و ئەویش بەخەیاڵی ئاسودەوە کتێبو وتاری دەنوسی. من دەستم لەڕابردوو هەڵگرتبوو چاوم لە تیشکی رۆژەکانی ئایندە بڕیبوو. پایز هات و لەگەڵ خۆیدا خەزانی هێنا، بەلام لەماڵە بێگەردەکەی مامۆستادا، عەشق دڵەکانی ئێمەی گەرم دەکردەوە و چێژی بەژیانمان دەبەخشی. درەختی خورماڵووەکەمان بەرێکی زۆری گرتبوو. رۆژێك مامۆستا بۆ شت کرین لەماڵ چوبووە دەرەوە، ئارەزوومکرد خورماڵوی بۆ بچنم و بەو مەبەستەوە سەرکەوتمە سەر درەختەکە. کاتێك مامۆستا هاتەوە منی نەبینی و چەند جارێك بانگی کردم، بەلام چونکە وەلامێکی نەبیست سەری لەژوورەکان و چێشتخانەکەدا. من لەسەر درەختەکەوە ئاگاداری هەڵس و کەوتی ئەو بووم. بینیم کەلەو هاتوچووەیدا ئەنجامێکی دەستگیر نەبوو لەسوچێکی دەرگای چێشتخانەکەوە راوەستاو لەکاتێکدا کەهەردوو دەستی خستبوە ناو قژەکەیەوەو لەخەیاڵدا رۆچوو. نیگەرانم کردبوو! لەسەرخۆ بانگم کرد:

مامۆستا! حەپەساو چاوی بەدەوروو بەریدا گێڕا. جارێکی تر بانگم کرد، چاوی بەدرەختەکەو پاشان بەمن کەوت. بەرەو لای درەختەکە هەنگاوی ناو گوتی:

لەو سەرەوە چی دەکەیت؟ بۆچی بانگم کردی و وەلامت نەدامەوە؟ گوتم:

دەمەوێت خورماڵوی گەیوت بۆ لێبکەمەوە. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی:

بەلام لەوانەیە لقێك لەژێر پێتدا بشکێت و بەربیتەوە.

نا، ئاگام لەخۆمە. ئێستا خورماڵوەکانم لێبگرە. من لەدرەختەکەوە دەمخستنەخوارەوە و مامۆستاش دەیگرتنەوە. کاتێك بەشی خۆمانم لێکردەوە گوتم:

یارمەتیم بدە بێمە خوارەوە. ئێستا نۆبەی ئەوبوو تۆڵە بکاتەوە. خورماڵوەکانی بردە چێشتخانەکەوە و هەرلەوێدا لەلای دەرگای چێشتخانەکە وەستا، گوتم:

مەگەر گوێت لەدەنگم نییە؟ گوتی:

بۆ نا، بەباشی گوێم لێیە هەر بەوجۆرەی کەتۆ گوێت لەدەنگی من بوو وەڵامت نەدامەوە! گوتم:

ئێستا کاتی تۆڵە کردنەوە نییە، وەرە یارمەتیم بدە. گوتی:

چۆن سەرکەوتیت هەرواش دەتوانیت بێیتە خوارەوە. گوتم:

ئەگەر یارمەتیم نەدەیت لەسەر ئەم لقەوە خۆم فڕێدەدەمە خوارەوە. شانەکانی بە بێدەربەستی هەڵتەکاند و گوتی:

ئەگەر ئەمکارە بکەیت بۆ هەمیشە لەخواردنی ئەو خورماڵوانەی کە خۆت لێتکردوونەتەوە بێبەش دەبیت! لەسەر لقەکە دانیشتم و گوتم:

کەواتە بۆ هەمیشە لەسەر ئەم لقە دادەنیشم تاکو تۆ بەزەییت دەجوڵێ و یارمەتیم دەدەیت. گوتی:

ئەو سادەیەی من دەیناسم هەرگیز لەهاتنەخوارەوەی درەخت ناترسێت. تۆ دەبێت بەتەنها بێیتە خوارەوە، هەوڵی خۆممداو هێواش هێواش هاتمە خوارەوە. مامۆستا لەلای درەختەکەدا وەستابوو کاتێك پێم گەشتە سەرزەوی گوتی:

بینیت سەرکەوتوو بویت؟ سەرم کێژی دەخوارد و وەختبوو هاوسەنگی خۆم لەدەست بدەم، لەئامێزی گرتم. گوتم:

تۆگەلێك دڵڕەقی،بۆی هەبوو لەدرەختەکە بەربیبمەوە. دەستی بەسەرمدا هێناو گوتی:

ئەوکاتە باوەشی من فرگەی تۆ دەبوو. سەرم بەسینگیەوە نوساندو گوتم:

باوەڕ بکەم کەواتدەکرد؟ چپاندی بەگوێمدا:

ئایا تائێستا درۆت لێ بیستووم؟ گوتم:

نا. دەزانیت لەئێستادا چ ئارەزوویەکم هەیە؟ حەز دەکەم کات لێرەدا لەجوڵەی خۆی بوەستێ‌و من و تۆ بەم حاڵەوە تاهەتایە بمێنینەوە. گوتی تا هەردوکمان لەبەر بارەگای خوادا لێپرسینەوەمان لەگەڵدا بکرێت و لەولێپرسینەوەیەدا من پشکی زیاترم بەربکەوێت، چونکە کیژێکم لە ئامێزدایە کەنە هاودینی منەو نەهاوسەریشم. پرسیم:

بۆ ئەوەی لێمان نەپرسنەوە دەبێت چی بکەین؟ گوتی:

سەرەتا تۆ دەبێت موسوڵمان ببیت و پاشان ببیتە هاوسەرم! سەیرێکم کرد و گوتم:

ئایا تۆ ئامادەیت من بۆ هاوسەری خۆت هەڵبژێریت؟ سەیرێکی کردم و پرسی:

ئایا تۆ ئامادەیت موسوڵمان ببیت؟ چاوەکانم پڕبوون لەفرمێسك، ڕوخساری ماچکردم‌و گوتی:

کەواتە هەردووکمان ئامادەین و پێویست بە وەستانی کات ناکات! من چوومە سەر ئاینەکەی ئەوو ئەویش مارەی کردم. بەڵام هەردوکمان دەمانزانی کە بۆ ژیانێکی ژن و مێردایەتی تەندروست دەبێت ساڵانێك هەوڵبدەین و دانبەخۆماندا بگرین. لەڕۆژی مارەبڕینەکەمدا، فریشتەو عەتا لەگەڵ دایك و باوکمدا ئامادەبوون. دایك و باوکم لەگەڵ ئەوەدا کە لەناخەوە ڕازی نەبوون بە موسوڵمان بونم، بەڵام لەبەر بەختەوەری من کە دەمێك بوو چاوەڕوانم کردبوو، نارەزایەتییان نیشان نەدا و بۆ بەختەوەریمان پاڕانەوە. من و مامۆستا بۆ ئەوەی کەبتوانین وەك هاوسەرانی دیکە ژیان بکەین هەوڵماندا تاکو لەلایەنی دەروونییەوە بەتەواوی تەندروست ببینەوە و زەماوەندی فریشتەو عەتا ئێمەی لەسەر بڕیارەکەمان سورترکرد. سادە سەیرێکی کاتژمێرەکەی کردوو چاوی بڕییە دەرەوە و گوتی:

ئێستا مامۆستا دەگات، هەرواشبوو. کاتێك ئەو دوانە پێکەوە ماڵەکەیان جێهێشتم، لەناخی دڵەوە بۆ خۆشبەختییان و ئەوەیکە بتوانن لەتەنیشتی یەکدا ژیانی هاوسەرییان پەرە پێبدەن پاڕامەوە.

**کۆتایی**

**٨-١١-٢٠٠٦**